ناوی کتێب: کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە
نووسینی: د. فەرهاد پیربال
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٤٧٤
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیاری چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم ، هەولێر- ٢٠٠٦
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٥١٠)ی ساڵی ٢٠٠٦ی دراوەتێ

**ئەم کتێبە پێشکەشە بە**

د. کەندالْ نەزان
سەرۆکی ئەنستیتووی کوردی پاریس.
رێگەی بۆ منیش و دەیان کوردی دیکەی کوردستانی عێراق خۆش کرد کە بخوێنین و بۆنی شارستانیەتی فەرەنسا پڕ بە سییەکانمان هەلْمژین.



# دەسپێک

ئەم کتێبە هەوڵدانێکە بۆ تێگەیشتن لە دیدی کوردناسە ڕۆژئاواییەکان لەبارەی کوردستان و نەتەوەی کورد. بەشی یەکەم بریتییە لە تۆژینەوەیەک، بەشێوەیەکی بیبلیۆگرافی و لە باری مێژووییەوە، بۆ دەسنیشانکردنی سەرچاوە و بابەتەکانی لێکۆڵینەوەی کوردناسی، لە کۆنەوە تا سەدەی نۆزدەهەم؛ هەروەها بۆ دیاریکردنی هۆ و ئامانجەکانی ئەم بایەخدانەی ڕۆژئاواییەکان بە کورد و خەملآنی زانستی کوردۆلۆژی لە ئەورووپا. بەشی دووەم بریتییە لە تنۆکێکی زەریای ئەو هەموو سەرچاوە و سەفەرنامە و کتێبانەی کە کوردناسەکان – لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ – لەبارەی کوردستان نووسیویانە. دەسکەنەیەکی هەڵبژاردەن، لە زمانی فەرەنسییەوە تەرجەمەم کردوون و قسەم لەسەر کردوون. بەشی سێیەمیش بریتییە لە پاشبەندێک.

هەرسێ بەشی ئەم کتێبە، دەشێ ببنە کەرەستەیەک بۆ ئەو ڕووناکبیر و مێژوونووسانەی دەیانەوێ مێژووی کوردناسی بنووسنەوە؛ یان بیروبۆچوونی فەلسەفی و سیاسی و ڕووناکبیرانە لەم بارەوە هەڵبگۆزن.

زۆربەی بابەتەکان، لەو ماوەیەدا تەرجەمە و ئامادە کراون کە لە پاریس بووم؛ بەتایبەتیش لە ماوەی ساڵانی ١٩٨٩ ـ ١٩٩٤. هەندێکیان پێشتر لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکانی هەندەراندا بڵاوکراونەتەوە. پێویستە ئاماژە بەوەش بدرێ، کە بەشێکی فراوانی ئەم کتێبە، پێشتر، لە هەر دوو کتێبی (سەرچاوەکانی کوردناسی) و (زێڕی ناو زبڵ)دا لە سلێمانی بڵاوکراونەتەوە. بابەتەکانی دیکەش، بۆ یەکەمین جارە لێرەدا خراونەتە دوو توێی کتێبەکەوە.

ئەم چاپە تەسەلتر و ڕاستکراوەیە. هیوادارم بگاتە دەست ژمارەیەکی زۆرتری خوێنەر و ڕووناکبیران.

هەولێر: ٢٠٠١/٤/١

# پێناسەی کوردناسی

کوردناسی، بە فەرەنسی کوردۆلۆژی Kurdologie، بە ئینگلیزی کوردەڵەجی Kurdology، بە ئەڵمانی Kurdenkunde بەو زانستە دەڵێن کە لە هەموو لایەنێکی ژیان و کولتوور و زمان و نیشتیمان و مێژووی گەلی کورد دەکۆڵێتەوە.(١)

ئەم زانستە، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بەملاوە، وردە وردە، بەشێوەیەکی رێژەیی لە زانستی رۆژهەڵاتناسی Orientalsime جودا دەبۆوە. ئیتر لەو ساتەوە لە زانکۆکانی ئەورووپادا (بەتایبەتی لە ئەکادیمیاکانی رووسیا و لە زانکۆکانی فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئەرمەنستان و ئینگلستان و سوید) وەک بەشێکی سەر بە لێکۆڵینەوەی ئێراناسی و رۆژهەڵاتناسی دەخوێنرێت.(٢)

**کوردناسی، لە زانکۆکانی هەموو ئەم وڵاتانەدا، لەبەر هۆی سیاسی، هەرگیز سەربەخۆ نەبووە؛ پاشکۆی بەشی ئێرانناسی بووە.** بۆ یەکەم جار، لە رووسیا، لە ١٩٥٩ بەملاوە، بەشی لێکۆڵینەوەی کوردناسی (لە ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی لە ئەکادیمیای زانستیی سانت پترسبۆرگ) لە بەشی ئێرانناسی جودا بۆوە و بووە بەشێکی سەربەخۆ.(٣)

Kurdologie یان زانستی کوردناسی: زانستێکی ئەورووپاییە. ئەمەش چونکە زانا و مێژوونووسە ئەورووپاییەکان یەکەم کەس بوونە بایەخیان بە کورد داوە و لەسەر کوردستانیان نووسیوە، تەنانەت کتێبێکی گرنگی وەک شەرەفنامەی شەرەفخانی بەتلیسی - کە کوردێک لە ساڵی ١٥٩٦دا نووسیویەتی و باس لە مێژووی کورد دەکات - هەر ئەورووپاییەکان بوون بۆ یەکەم جار - لە رووسیا و فەرەنسا ـ لە ساڵی ١٨٢٦دا بایەخی دەسنووسەکەیان بۆمان روون کردەوە و پاشان لە کتێبێکی سەربەخۆدا بە چاپیان گەیاند و بووە سەرچاوەیەکی بەردەست بۆ کوردان.(٤)

### داتاشینی زاراوەی "کوردناسی"

بەکارهێنانی زاراوەی "کوردناسی" لە کوردیدا، وەک «رۆژهەڵاتناسی» زاراوەیەکی تازەیە؛ ماوەیەکی زۆر نییە کەوتۆتە ناو زمانی کوردییەوە.

زاراوەی "کوردۆلۆجیا" لەناو کورداندا، بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩١٣دا، لە لاپەڕە ٨ی ژمارە ٢ی گۆڤاری (رۆژی کورد)دا لە ئەستەمبوڵ، لەلایەن د. عەبدوڵڵا جەودەتەوە لە وتاری اتحاد یۆلی، بە زمانی تورکی عوسمانلی بەکارهاتووە. پاشان لە گۆڤاری (هاوار) لە ژمارە ٢٢ و ٢٣ و ٢٤دا، لە ساڵی ١٩٣٤ لە دیمەشق، لە وتارێکی هێرکۆل ئازیزان (جەلادەت بەدرخان) بە ناونیشانی (کورد و کوردستان ب چاڤێ بیانیان) بەکارهاتووە.

زاراوەی "رۆژهەڵاتناسی" ـ ش، بۆ یەکەم جار لە لاپەڕە ٢٣٥ی ژمارە ١٢ی گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە)دا لە حوزەیرانی ١٩٤٤دا لەشێوەی "رۆژهەڵاتیەوان" لەلایەن حوسێن حوزنی موکریانییەوە بەکارهاتووە؛ پاشان لەلایەن مێژوونووسانی هاوچەرخەوە کراوەتە "رۆژهەڵاتناسی".

کەواتە، ئەو زاراوانەی لە زانستەکە دەکۆڵنەوە "کوردناسی"، "رۆژهەڵاتناسی"، "رۆژهەڵاتیەوان" لە ساڵانی سییەکان بەملاوە بوو، لەلایەن یەکەمین دەستەی مێژوونووسەکانی وەک جەلادەت و کامەران بەدرخان، تۆفیق وەهبی، حوسێن حوزنی موکریانی، عەلائەدین سەجادی، ڕەفیق حیلمی و ئەمین زەکی بەگەوە کەوتنە ناو زمانی

کوردی. هەر ئەم مێژوونووسانە زاراوەکانیان دارشتووە و لە بەرهەمەکانیاندا چەسپاندوویانە.

## یەکەم بایەخدانی رووناکبیرانی کورد بە زانستی کوردناسی

یەکەم نووسەری کورد، بۆ یەکەمین جار سەرنجی بەرهەمی رۆژهەڵاتناس و کوردناسەکانی دابێت د. عەبدوڵڵا جەودەتە. ئەمەش لە ساڵی ١٩١٣دا، لە لاپەڕە ٨ی ژمارە ٢ی گۆڤاری (رۆژی کورد) لە ئەستەمبوڵ، لە وتاری اتحاد یوڵی، بە زمانی تورکیی عوسمانلی. پاشان، نووسەرێکی دیکە، کە لە بەرهەمێکی کوردناسیی کۆڵیبێتەوە، د. کامەران بەدرخانە؛ ئەویش لە وتاری (کوردلر، تاریخی و اجتماعی تدقیقات)، لە گۆڤاری (اجتهاد)، ژمارە ١٣٠، لاپەڕە ٥٧٩٥ـ ٢٧٩٧، لە ئەستەمبوڵ لە ١٤ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨دا. لەم وتارەدا د. کامەران بەدرخان بە زمانی عوسمانلی، بەشێوەیەکی فراوان، لە کتێبی رۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانیی کۆڵیوەتەوە کە باس لە نەتەوەی کورد و وڵاتەکەیان دەکات.(٥)

دووای ئەویش، گۆڤاری ژین – لە ساڵی ١٩١٩دا لە ئەستەمبوڵ – یەکەم گۆڤاری کوردییە بەرهەمی رۆژهەڵاتناسانی ئەورووپای لەبارەی مێژووی کوردستان بڵاوکردبێتەوە؛ زنجیرەیەک وتاری لە ئینسکلۆپێدیای بریتانییەوە تەرجەمە کردووە. ئنجا، حاکمی سلێمانی، سەرنووسەری رۆژنامەی پێشکەوتن (سلێمانی: ١٩٢٠ ـ ١٩٢٢)، مێجەرسۆن SOANE، لە ساڵی ١٩٢٠دا، لە ژمارە ١٩ بەمەلاوە لە رۆژنامەی پێشکەوتندا بە زنجیرە، گەشتەکەی رۆژهەڵاتناسی ئینگلیز، مستەر ریچ RICH ی بە ناونیشانی (سەد ساڵ لەمەوپێش) تەرجەمەی کوردی کردووە.

دوای ئەمانیش، (جەلادەت بەدرخان) لە گۆڤاری (هاوار)دا، لە ژمارەکانی ٢٢ و ٢٣ و ٢٤دا، لە ساڵی



حوسێن حوزنی موکریانی
یەکەمین نووسەرێک چاپخانەی هێنایە کوردستان

١٩٣٤ له دیمەشق، له وتارێکدا به ناونیشانی (کورد و کوردستان ب چاڤی بیانیان)؛ هەروەها له ژماره (٣٢)ی هەمان گۆڤار ساڵی ١٩٤١ لاپەڕە ٤ـ٧ له وتارێکی دیکەدا به ناونیشانی (کاردۆخ). پاشان، نووسەرێکی کوردی تر بەناوی بابا عەلی له وتارێکیدا، به ناونیشانی (کورد لای بێگانه) له گۆڤاری گەلاوێژ، ژماره ٥ ـ ٦، لاپەڕە ٤١، له ساڵی ١٩٤٠دا بەفراوانی تاوتویی ئەم بابەته گرنگەی کردووه.

له گۆڤاره کوردییەکانی نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا، گۆڤاری گەلاوێژ (١٩٣٩ ـ ١٩٤٩) له هەموویان زیاتر بایەخی به بابەتی کوردناسی داوه.[٦]

## سوودی زانستی کوردناسی

سوودی کوردناسی بریتییه له سوودی هەموو زانستەکانی فۆلکلۆر و مێژوو و جوگرافیا و ئەتنۆگرافیا و هونەر و ئەدەبیات و زمان و ئارکیۆلۆژیا و کارتۆگرافیا و نیگارکێشان و دەسنووس و بیبلیۆگرافیا له یەک کاتدا. کوردناسی، هەموو ئەم زانستانەیه پێکەوه. هەموو ئەم بوارانه له بۆتەیەکدا کۆبوونەتەوه و گەنجینەیەکی بەهاداری نەتەوەکەمان پێک دەهێنن؛ تەنانەت خودی شارستانیەتێک به ناوی شارستانیەتی کوردستان لەنێو ئەم زانستەی کوردناسیدا – واته لەنێو کتێب و سەفەرنامەی گەڕاڵەکاندا – حەشاردراوه.

ئەگەر سەفەرنامه و کتێبی ئەو گەڕاڵ و ڕۆژهەڵاتناسانه نەبوونایه، مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتیی کورد و کوردستان، ماتێریاڵ و کەرەستەی ئارشیتێکتووری و ئاسەوارەکانمان، تەنانەت شارەزاییمان لەبارەی ژیانی ئەدەبی و کولتووریشمان له سەدەکانی ناوەڕاستدا، بەتەواوەتی نادیار و تاریک دەمایەوه. سەدان دەسنووسی دانسقه و گرنگ له سایەی ئەو کوردناسانەوه ئەمڕۆ کەوتوونەتەوه نێو کتێبخانەی کوردی و ساغ کراونەتەوه. دوو ئەوەندەی دیکەش هێشتا هەر ماون و و چاوەڕێی ئەوەن لێیان بکۆڵدرێتەوەو له شوێنی شایستەی خۆیان دابنرێن.

## زاراوەی ڕۆژهەڵاتناسی

ڕۆژهەڵاتناسی، واته ئەو دیسیپلینانەی که ئامانجیان لێکۆڵینەوەی شارستانیەتەکانی ڕۆژهەڵاته.[٧] زاراوەی ڕۆژهەڵاتناسی که به عەرەبی دەکاته استشراق و به فارسی خاورشناسی و به فەرەنسی Orientalisme، له وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا بۆ یەکەم جار نووسەره عەرەبه لبنانییەکان له کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا لەجیاتی زاراوەی Orientalisme بەکاریان هێنا بۆ دیاریکردنی ئەو زانستەی که نووسەره ڕۆژئاواییەکان – له ئاکامی گەشتەکانی خۆیان بەرەو ڕۆژهەڵات – خۆیان پێوه خەریک کردبوو بۆ لێکۆڵینەوه له میللەتانی ڕۆژهەڵات: نیشتمانیان، زمانیان، مێژوویان، ئەفسانەیان، ئەدەبیاتیان، داب و نەریتیان.[٨]

زانستی ڕۆژهەڵاتناسی Orientalisme له ئەورووپا، به بڕیارێکی کەنیسەیی (ئەنجوومەنی ڤیەننا) له ساڵی ١٣١٢دا بەشێوەیەکی ڕەسمی دامەزرا. بەپێی ئەم بڕیاره: له زانکۆ سەرەکییەکانی ئۆکسفۆرد و پۆڵۆنیا و پاریس و کامبریج و سلامنکا دەستیان کرد به دەرسدانەوەی زمانه ڕۆژهەڵاتییەکان بەتایبەتیش عەرەبی.[٩]

له فەرەنساش، له سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا بوو که بەشێوەیەکی ڕەسمی چەسپا. ئەوه بوو له ساڵی ١٥٣٠دا له پاریس کۆلێژی شاهانه College Royal له سەردەمی فرانسوای یەکەمدا کرایەوه و لەو کۆلێژەدا دەرسی زمانی یۆنانی و عیبری دەگوترایەوه. هەر له هەمان سەردەمدا، له ئەنجامی پێشکەوتنی بازرگانیی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، پەیوەندیی دیپلۆماسی و سیاسیی نێوان فەرەنسا و وڵاتانی ڕۆژهەڵات پەرەی سەند. له سەدەی ١٦م بەملاوه، فەرەنسا باڵوێزخانەی خۆی له پایتەختەکانی دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویی ئێراندا کردەوه.[١٠] ئەمه

کـاریکی باشی کـرده سـەر پێـشکەوتنی پەیوەندیی کـولتـووریی نێـوان ئەورووپا و رۆژهەلات. هێندەی پێ نەچوو – لەبەر بایەخی زانستەکە – لە ساڵی ۱۸۷۳دا یەکـەمین کـۆنگرەی نێـونەتەوەییـیانەی رۆژهەڵاتناسی بەسترا بە ناوی (الموتمر الدولي الاول للاستشراق).(۱۱)

لە هەمـان کـاتدا لە سـەرەتای سـەدەی هەژدەهەمـدا ئەنتـوان گالاند A. GALLAND کـتـێبی (هەزار و یەک شـەو)ی کـرده فـەرەنسی. لەو سـاڵەوە بایەخـدانی فەرەنسییەکان بە رۆژهەڵات و تەرجەمەکردنی ئەدەبیاتی سـیـحـراویی رۆژهەلات، زیاتر برەوی سـەند. ژمـارەی کـتـێبە تـەرجەمـەکـراوەکـان، بۆ نموونە بە فـەرەنسی، لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا گەیشتە ٦٠٠ کتێب. ئەمە لە کـاتێکدا لە مـاوەی ١٦٥٠- ١٧٠٠دا تەنیـا ٨٤ کتێب بە فەرەنسی لەبارەی رۆژهەلات نووسرابوون.(۱۲)

سـەفـەرنامـە یان سـیـاحـەتنامـە Recit du voyage ژانرێکی گرنگی ئەدەبییە؛ ئەویش هەر دەچێتە خانەی رۆژهەڵاتناسییەوە. ئەمڕۆ لە زۆربەی زانکۆکانی وڵاتانی رۆژئاوادا دەخـوێنرێت و لقـێکی تایبـەتی بۆ تەرخـان کراوە. لە هەندێ زانکۆی دیکەشدا لەژێر هەمان دەواری رۆژهەڵاتناسیدا Orientalisme لێی دەکۆڵدرێتەوە.(۱۳)

لە ناوەڕاسـتی ئەم سـەدەیە بەمـلاوە، لەگـەڵ پێشکەوتنی بیـری سـیـاسی و رووناکـبـیـریدا و لەگەڵ تێکچڕژانی رێبازە فەلسەفی و سیاسییەکان و بەیەکتر هەڵـپـژانی دنـیـای رۆژهەلات لەگـەڵ رۆژئاوا و قـووڵـبـوونەوەی بەرژەوەندی و ناکـۆکـیـیەکـانی نێـوان ئەم دوو دنیـا جـیـاوازە، بابەتی رۆژهەڵاتناسـیش قـووڵتـر بۆوە؛ دووری و لایەنێکی سـیـاسـیی وەرگـرت، بووە مـەیدانی زۆرانبـازیی نێـوان رووناکـبـیـرانی رۆژهەڵاتی «نزم» و رۆژئاوای «مـەزن». لە رووناکـبیـرە فـارسەکـان، جەلال ئال ئەحـمـەد لە کـتـێبی "غـربزدگی"، بە زمـانی فـارسی (چاپی تاران/ ۱۹۷٦) و داریووش شایگان لە کـتـێبی Regard Mutule Le بە زمـانی فـەرەنسی (چاپی پاریس: ۱۹۹۲) زۆر بەتوندی دژی "رۆژئاوای مـەزن"

د. عەبدوڵڵا جەودەت

وەستاون. لە رووناکبیرە عەرەبەکانیش، ئەدوارد سەعید، رایان وایە کە "زانستی رۆژهەڵاتناسی شێوازێکی رۆژئاواییەیانەی دەسەڵات پەیداکردنی رۆژئاوایە بەسەر رۆژهەڵات ".(١٤) رووناکبیری ئینگلیزیش، روودیارڵ کیپلینگ Rudyarl KIPLING جەختی لەسەر ئەم ناکۆکی و جیاوازییانەی جیهانی رۆژهەڵات و ئەورووپا دەکات و دەڵێ: " رۆژهەڵات رۆژهەڵاتە، رۆژئاواش رۆژئاوایە: هەرگیز بەیەکتری ناگەن".

## پیشەی کوردناسەکان

ئەوانەی لە بواری کوردناسیدا بەرهەمیان هەبووە، خاوەن پیشە و خولیای جۆراوجۆر بوونە:

١- قونسوڵ و سیاسەتمەدار و سەرۆک لەشکرەکان

بۆ نموونە: ئێگزەنەفۆن، سەرۆک لەشکری یۆنان لە پێش زایین. مستەر ریچ، سیاسەتمەداری ئینگلیز لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا. ئەلکزەندەر ژابا، قونسوڵی رووسیا لە ئەرزەڕۆم.

٢- فەیلەسووف و مێژوونووس و جوگرافیاناسەکان

بۆ نموونە: ستـرابۆن، هێرۆدۆت، کە دوو فەیلەسووف و مێژوونووس و جوگرافیاناسی یۆنانین، پێش زایینی مەسیح هاتوونەتە رۆژهەڵات. جوگرافیاناسی ناوداری فەرەنسی، ریکلۆس Reclus، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا.

٣- موژدەگار و قەشەکان

موژدەگارەکان Missionnaires ئەو قەشە و ژن و پیاوە دیندارە مەسیحییانەن کە دەنێردرانە هەندەران بۆ بە مەسیحی کردنی خەڵکی غەیرە مەسیحی.(١٥)

ناسک و راهیبە مەسیحییەکانی رۆژئاوا لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی زایینەوە (٣٦٤ - ٣٧٨) هاتوونەتە مەڵبەندی میزۆپۆتامیا، بەتایبەتیش لە کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە: لە ناوچەکانی باشووری مووسڵ و دهۆک و هەولێر و هەکاری و دیاربەکر و نوسەیبین.(١٦) پاشان، لە سەدەی دووازدەهەمەوە راهیبە دۆمینیکییەکان. ئنجا دوو قەشەی ئیتاڵی، گارزۆنی و رافائێل ژۆسیپ کامپانێل لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا. هەروەها قەشەی فەرەنسی، تۆما بوا T. BOIS لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا، کە خاوەن چەندین کتێبە لەبارەی ئەدەبیاتی کوردی.

٤- نیگارکێشە رۆمانسی و ریالیستەکان

بۆ نموونە: ژێرۆم و ژێریکۆڵت و یۆژین دیلاکروا، سێ نیگارکێشی هەرە دیاری فەرەنسین کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا روویان کردۆتە رۆژهەڵات. تابلۆی " کچی کافرۆش " بەرهەمی یەکێک لەو نیگارکێشە ئەورووپییە نادیارانەیە کە لە کوردستاندا ژیاون.

هەروەها هونەرمەندی فەرەنسی، ژوول لۆرەنس هاتۆتە کوردستان و هەندێ وێنەی دیاردەکانی کوردستانی کێشاوە؛ وەک شارەکانی بەتلیس و هەندێ گوندی کوردستان و جلوبەرگی کوردی و ئاوی فورات.(١٧)

٥- شاعیر و نووسەرەکان

لامارتین، شاعیری گەورەی سەدەی نۆزدەهەمی فەرەنسا، یەکەم شاعیری فەرەنسییە کە ناوی کورد لە کتێبەکەی خۆیدا دەهێنی.(١٨) دوای ئەو، شارل بۆدلێر، لە کۆتایی هەمان سەدەدا، باسی پەیوەندیی نێوان کورد و حەشیشە دەکات.(١٩)

٦- بازرگانەکان

بازرگانی کازاخستانی، ڤاسیلی یاکۆڤلیڤیچ گاگارا (١٦٣٤ ـ ١٦٣٧)، یەکێکە لە یەکەمین ئەو گەڕاڵە رووسانەی هاتوونەتە کوردستان. گاگارا بە شارەکانی قارس و وان و دیاربەکر و ئورفە و سیلۆپی تێپەڕیوە.[٢٠] هەروەها خۆشترین سیاحەتنامەی ئەدەبی رووسی لە سەدەی حەڤدەهەمدا، کە بریتییە لە کتێبی " وەسفی ئیمپراتۆریەتی تورکی"، نووسەرەکەی بازرگانێکی نادیار و نەناسراوە لە ساڵانی شەستەکانی ١٦٠٠ بە ئەسیر گیراوە لای تورکەکان. ئەم گەڕاڵە رووسە بە شارەکانی دیاربەکر و ماردین و کەرکووک و مووسڵدا تێپەڕیوە.[٢١] هەروەها ژان - باپتسیت تاڤێرنی Jean- Baptiste TAVERNIER بازرگانێکی فەرەنسی بووە. لە ساڵی ١٦٠٥ لە پاریس لە دایک بووە؛ واتە هاوسەردەمی لویسی چوارەم بووە. ناوبراو، کوڕی بازرگانێکی فرۆشیاری نەخشەی جوگرافی بووە. لە ماوەی ساڵانی ١٦٣٢ تا ١٦٦٣ دا شەش جاران هاتۆتە وڵاتی ئێران وتورکیا. لە دووەمین و پێنجەمین سەفەریدا بە ناوجەرگەی کوردستاندا تێپەڕیوە و باسی ژیان و شێوەی ژیانی کوردەکانی کردووە. تەنانەت- وەک دەگێڕێتەوە- چووە سەری لە شەرەفخانی پاشای بەتلیسیش داوە و لە دیوەخانی شەرفخانی بەتلیسدا میوانداری کراوە.

٧- پیاوی حکوومەت و جاسووسەکان

بۆ نموونە: مێجەرسۆن و ئەدمۆنز، دوو نوێنەری حکوومەتی ئینگلستان بوون لە سەرەتای ساڵانی بیستەکانی ئەم سەدەیەدا لە کوردستانی عیراق. هەر یەکەیان چەند سەرچاوەیەکی بەنرخیان لەبارەی کوردستانەوە بۆ جێ هێشتووین.

لە ریزی ٤٤٩ گەڕیدە کە لە هەموو دنیاوە لە ماوەی سەدەی ١٤م تاکو سەدەی ١٦م سەریان لە تورکیای عوسمانلی داوە، (١٠٦) فەرمانبەری بەرزی

حکوومەت و جاسووس بوونە، (٧٥) قەشە و پیاوی دینی بوونە، (٧٥) میرزادە و بەگزادە، (٣٨) بازرگان و نوێنەر، (٣٦) بۆرژووا، (٢٦) نووسەر و پیاوانی ئەدەب، (٢٣) سەرباز و دەریاوان و جەربەزە.[٢٢]

### بنچینە و بناغەکانی کوردناسی

پێش ئەوەی باسی سەرهەڵدانی زانستی کوردناسی لە ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاستدا بکەین، بە پێویستی دەزانین کورتەیەک لەبارەی کتێب و نووسراوەکانی مێژوونووسە یۆنانی و زانا موسڵمانەکان لەبارەی کوردستان (لە ماوەی سەدەکانی پێش زایین و لە سەدەکانی ١٠ – ١٣دا) پێشچاو بخەین. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەم نووسراوە ناوبراوانە، پێش ئەوەی زانستی کوردناسی لە ئەورووپا بچەسپێت، بە سەرچاوەگەلێکی بناغەیی دەژمێردرێن بۆ ناساندنی کورد بە ئەورووپا و ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە لە دامەزراندنی بیری کوردناسیدا.

هەندێ بۆچوون وای دەبینن: ئەو بەرهەمانەی بە زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لەلایەن زانا گریک و موسڵمان و ڕۆژهەڵاتییەکانەوە نووسراون (لە سەدەکانی پێش زایین و لە سەدەکانی ١٠ – ١٣ و ١٦دا) مادام ڕۆژهەڵاتییەکان خۆیان نووسیویانن، ناچنە ریزی زانستی کوردناسییەوە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەو بەرهەمانە بە چەند کەرەستەیەکی سەرەتایی و بونیاد دەژمێردرێن بۆ خەملانی زانستەکە. تەنانەت ئەورووپاییەکان خۆشیان ئەم بەرهەمانەیان کردۆتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ کۆڵینەوە لە نەژاد و زمان و جوگرافیا و مێژووی کورد. هەر لە ساڵانی ١٧٠٠ و ١٨٠٠ بەولاشەوە نووسراوەکانیان تەرجەمە کردۆتە سەر زمانەکانی خۆیان. کەچی ئێمە خۆمان تا ئێستاش لەو بەرهەم و کتێبانە بێ خەبەرین؛ لە کاتی لێکۆڵینەوەدا سەرچاوە ڕەسەن و هەوەڵییەکەی ئەو زانا گریک و ڕۆژهەڵاتی و موسڵمانانە فەرامۆش دەکەین و پەنا دەبەینە بەر کتێبی ئەورووپاییەکان، کە ئەوان خۆشیان لە موسڵمانەکانیان وەرگرتووە. مێژوونووسی خۆمان، ئەمین زەکی بەگ –بۆ نموونە– لە سەرجەم لێکۆڵینەوە مێژووییەکانیدا پەنای بردۆتە بەر کتێبەکانی مێژوونووسی ئینگلیزی سەدەی نۆزدەهەم، لۆسترێنج Le Strange کە ئەو زانا ئینگلیزە بۆ خۆشی بەپلەی یەکەم پشتی بە کتێبی زانا موسڵمانەکان بەستووە. هەروەها مێژوونووس و کوردناسە هەرە گەورەکانی رووسیا و فەرەنسا و ئەڵمانیاش، وەکو ڤلادیمیر مینۆرسکی، بازیل نیکتین، لێرخ، تۆما بوا و... سەرچاوەی یەکەمیان ـ لە بواری ساغکردنەوە و لێکۆڵینەوەی کوردناسیدا ـ ئەگەر مێژوونووسە یۆنانییە کۆنەکان بێت، ئەوا سەرچاوەی دووەمیان بێگومان ئەو مێژوونووس و جوگرافیا موسڵمانانەن. کەواتە، ناکرێت دەوری ئەو بەرهەمە ڕۆژهەڵاتییانە فەرامۆش بکرێت لە بواری پێکهاتنی بیری کوردناسیدا.

### بنیاتنانی بیری کوردناسی

ئەو نووسەرانەی بەشدارییان لە دامەزراندنی بیری کوردناسیدا کردووە و ڕێگەیان خۆش کرد بۆ گەڵاڵەبوونی زانستی کوردۆلۆژی، بەپێی دەرکەوتنی کرۆنۆلۆژییان، ئەمانەن:

١– گریکەکان، واتە مێژوونووس و فەیلەسووفە یۆنانییە کۆنەکانەن.

بایەخدانی ئەورووپاییەکان بە کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یۆنانییەکانی زەمانی پێش مەسیح: سەردەمی ئێگزەنەفۆن (٤٠١ پ.ز) و ئەسکەندەری مەکەدۆنی (٣٣١ پ. ز)، ئنجا سترابۆن (٥٨ زایینی) و هێرۆدۆت (٤٣٠ زایینی).

**یۆنانییەکانی زەمانی دێرین – واتە گریکەکان** Grec**، یەکەم کەسن هاتوونەتە کوردستان و بۆ یەکەم جار کتێبیان لەبارەی کورد و وڵاتی کوردەوە نووسیوە.**[٢٣]

یەکەم گەڕاڵی یۆنانی هاتبێتە کوردستان و بەرهەمێکی کوردناسی بۆ ئێمە جێ هێشتبێت بریتییە لە فەیلەسووف و سەرۆک لەشکر و ڕێبەری یۆنانستانی کۆن، ئێگزەنەفۆن Exenophon کە لە ٤٠١ ساڵ پ. ز بە ڕۆژهەڵاتدا تێپەڕیوە و سەفەرنامەی ئەو گەشتەی خۆی لە کتێبی ئاناباز Anabase دا بە زمانی یۆنانیی کۆن نووسیوەتەوە. بەشێکی سەفەرنامەکەی تەرخان کردووە بۆ گێڕانەوەی ئەو کارەساتە ناهەموارانەی کە خۆی و لەشکرەکەی لە کوردستاندا بەسەریان دێت و ئەو شەڕوشۆڕانەی لە وڵاتی کوردەکاندا Cardouque ڕووبەڕوویان دەبنەوە. ئەم چەند لاپەڕە دەسنیشانکراوەی ئێگزەنەفۆن لەبارەی کاردۆخییەکان لە کتێبی ئانابازدا بەیەکەمین و هەرە کۆنترین سەرچاوە لە قەڵەم دەدرێت لەبارەی نەژادی کورد.[٢٤]

لە وڵاتی ئێراندا کاتێ داریووش پاشای هەخامەنشییەکان (٥٥٠-٣٣٠ پ. ز) کۆچی دوایی کرد، یەکسەر دووبەرەکایەتی و ناکۆکی، لەسەر مەسەلەی فەرمانڕەوایی، لەنێوان ئەردەشێر و برا بچووکەکەی، کورووش، تەقایەوە. ئیدی کورووشی برا بچووک، بە لەشکرێکی تێکەڵ و گەورەی سێزدە هەزار کەسییەوە، هێرشێکی هەژندی کردە سەر تەختی پاشایەتی برا گەورەکەی خۆی. دە هەزار سەربازەکەی ئەم لەشکرە گەورەیەی کورووش بەکرێگیراوانی یۆنانی بوون و لە یۆنانەوە بەرەو ڕۆژهەڵات بەڕێ کەوتبوون.[٢٥] لەناو ئاگری ئەم جەنگەدا کورووش کوژرا و دە هەزار سەربازە یۆنانییەکانیش، بە سەرکردایەتیی ئێگزەنەفۆن، بێدەسەڵات مانەوە و دەیانویست هەرچۆنێک بێ خۆیان قوتار بکەن.[٢٦]

دە هەزار سەربازە یۆنانییەکە، لەڕێگای کشانەوەی خۆیاندا، لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی خۆیان لە ڕووباری دیجلە بدەن و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، بڕیاریان دا ڕێگای باکوور بگرنەبەر، بەرەو چیاکانی کوردستان.

ئەو یۆنانییانە کاتێ گەیشتنە کوردستان، دەیانزانی کوردەکانیش هەر دژی ئەردەشێر پاشای هەخامەنشین؛ دڵیان بەوە خۆش بوو کە لای ئەو کاردۆخە چیاییانە بتوانن کەمێک پشوو بدەن و ئنجا بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. بەڵام کاردۆخەکان، بۆ بەرگریکردن لە خاک و ژیانی خۆیان، لەگەڵیان کەوتنە چەندین شەڕ و شۆڕی بێ ئامانەوە؛ نزیکەی ١٢٠٠ کەسیان لێ کوشتن.[٢٧]

بەم شێوەیە، یەکەمین هاتنی ڕۆژئاواییەکان بۆ کوردستان و یەکەمین پەیوەندیی نێوان کوردستان و ڕۆژئاوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قۆناغە جەنجاڵ و شەڕوشۆڕاوییەی گرێک و کاردۆخەکان لە دەوروبەری ساڵی (٤٠٠- ٤٠١ پ. ز.)دا، کە ئەمەش لە کتێبی ناوداری ئاناباز Anabaseدا ڕەنگی داوەتەوە و بە قەڵەمی فەرمانداری ئەو لەشکرە یۆنانییە، ئێگزەنەفۆن XENOPHON نووسراوە.

کەواتە، ئاناباز Anabase یەکەمین و کۆنترین دۆکیومەنتی مێژووە کە ناوی کوردی Cardouque تێدا هاتبێت و چیرۆکی پەیوەندی نێوان ڕۆژئاوا و کوردمان بۆ بگێڕێتەوە.[٢٨] ئەم بەرهەمە، کۆنترین لێکدانەوەی خەڵکی بێگانە و یەکەمین بینینی ڕۆژئاواییانەیە بۆ ئاکار و کەسایەتیی مرۆڤی کورد و نیشتیمانەکەی.[٢٩]

بەم شێوەیە، کتێبی ئانابازی ئێگزەنەفۆن، بۆ ڕۆژهەڵاتناسە ئەورووپاییەکان، بوو بە یەکێک لە بناغە گرنگەکانی کۆڵینەوە لە نەژادی کورد و دامەزراندنی بیری کوردناسی لە ئەورووپا.[٣٠]

دوای ئێگزەنەفۆن، ئەسکەندەری مەکەدۆنی Alexandre Le Grand (٣٥٦ - ٣٢٣پ.ز) وەک جیهانگیر و سەرۆک لەشکرێک، دوای سەرکەوتنە گەورەکەی بەسەر داریووش پاشای ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی (٥٠٠ - ٣٠٠پ.ز) لە شەڕی گۆگامێل gaugamelle لە نزیک شاری هەولێر Arbellدا پاش ئەوەی کوردستانی لە ساڵی ٣٣١ی پێش زاییندا داگیرکرد، وای کرد سەرنجی هەموو دنیا بۆ کوردستان رابکێشێت و ناوی شاری ئەربێل -Ar

belle هەولێــری ئەمــڕۆ، لە ئەنجـامـی جـەنگی ئەربێللا Arbella یان جـەنگی گـۆگـامـێل gaugamelle، بکەوێتـە ناو بەڵگەنامە هونەری و مێژووییەکانی ئەوروپاوە.

ئەم جەنگەی نێوان ئەسکەندەری مەکەدۆنی و داریووش پاشای هەخامەنشی لە ساڵی ٣٣١ی پێش زایینداـ کە یەکەم سەرکەوتنی ئەورووپایە بەسەر ڕۆژهەڵاتدا ـ گرنگترین و دیارترین یەکانگیربوونەوەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتە لە مێژوودا.(٣١)

جەنگی ئەربێللا و سەرکـەوتنی ئەسکەندەری مـەکەدۆنی بەسـەر داریووش پاشـای هەخـامـەنشی لە شـەڕی Ar-bellasدا و (لە سـاڵی ٣٣١ ی پ. ز.) و ڕەنگدانەوەی لە ئەدەبیـات و هونەری ڕۆژئاوادا بناغـەیەکی پتـەوی بۆ ناساندنی ڕۆژهەڵات و کوردستان دامەزراند.(٣٢)

پاشان، مـێـژوونـووسی ناوداری یۆنانی، هێـرۆدۆت Herodote (٤٢٠ پ. ز.)، ئنجـا جـوگـرافـیـاناسی ناوداری یۆنانی، سـترابۆن Strabon (٥٨ ساڵ پێش زایینی مەسیح تا ٢٥ ساڵ پاش زایین)، کە بە Kyrtioi ناومان دەبا، یەک لەدوای یەک هاتوونەتە کـوردسـتـان و بە لێکۆڵینەوە مـێـژووییـەکـانیـان لەبارەی نەژادی کـورد خـزمـەتی دامەزراندنی بیری کوردناسییان کردووە. جگە لەوانیش، بۆلیبیۆس (٢١٠ – ١٢٠پ.ز) کە بە Cirti ناومان دەبا، لەگەڵ تیتیۆس لیفیۆس کە بە Cirtei و Cirti ناومان دەبا، بە بناغەیەکی گرنگی دیکە دەژمێردرێن.(٣٣)

بەم شێوەیە، نووسراوە مێژوویی و جوگرافییـەکانی ئەم ناودارە یۆنانیانە لەبارەی نەژادی کورد و وڵاتی کورد، ئەگەرچی دەچنە خانەی مێژووی دێرینی کوردەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەمڕۆ بە هەرە کۆنترین سەرچاوەکانی چەکەرە کردنی بیری کوردناسی لە قەڵەم دەدرێن.(٣٤)

٢– دوای ئەم یۆنانییـانە، مـێـژوونـووسی گـەورەی ئەرمـەنی، مـایسـای خـۆرێنسکی Moses Khoren، لە سـەدەی پێنجـەمـدا بە سـەرچاوەیەکی گـرنگ دەژمـێـردرێت لە بواری مـێـژووی دێرینی کـورددا. مـینۆرسکی لە لێکۆڵینەوەکانیدا، لەبارەی مێدیکان و کورد، کەڵکی لە کتێبەکانی ئەم مێژوونووسە ئەرمەنییە وەرگرتووە کە لێکۆڵینەوەکانی لەبارەی مێدەکانەوە نووسیوە و دەسنووسەکانی لە ماتێنەدەرانی ئەرمەنستاندا پارێزراون.(٣٥)

بەرهەمی ئەم مێژوونووسە، هەرچەند باسی مـێژووی دێرینی کـورد دەکات، بەڵام پەیوەندیی بە ناسینی کورد و سەرەتای پێکهاتنی کوردناسییەوە هەیە. کتێبەکەی کراوەتە فەرەنسی و لە ١٨٤١دا لە ئیتالیا چاپ کراوە.(٣٦)

٣– کتێبە پیرۆز و ئاسمانییەکان

لەو بەرهەمـانە بترازێ کە باسـمـان کـردن، تاکو سـەدەی دەیەم – واتە بەدرێژایی نزیکەی ٨٠٠ سـاڵێـک – ئێـمـە سەرچاوەی دیکەی ئەوتۆمان لەبەر دەستدا نییە کە بۆ کۆڵینەوە لە نەتەوەی کورد و وڵاتی کورد پشتی پێ ببەستین. تەنیا کتێبە پیرۆز و ئاسمانییەکان نەبێ، واتە تەورات و ئینجیل و قورئان.

بێگومان ئەم کتێبە پیرۆزانە ناوی کورد و کوردستـانیـان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەهێناوە و هیـچیـان لەبارەی تایبەتمەندێتیی نەژاد و زمان و کـولتـوور و جـوگـرافـیـای نەتەوەییـمـان نەدرکـاندووە؛ بەڵکو تەنیـا ناوی هەندێ لە مـیـرنشین و شـار و شاخ و شـا و ڕووبار و مـەڵبـەندەکـانی کـوردسـتـانیـان هێناوە (وەکـو ئارارات، جـوودی، نووح، میدیا...) چەند چیرۆکێکیان لەم بارەوە بۆ گێڕاوینەتەوە.(٣٧)

بەم شێوەیە، لە دوای لەدایکبوونی مەسیحەوە – واتە ساڵانی ١٠٠ تا ساڵانی ٩٠٠ – بە تاریکترین سەردەم دەژمـێـردرێت لە بواری ئاگـاداری و زانیـارییـەکـانمان لەبارەی ژیان و کـولتـوور و زمـان و مـێـژووی نەتەوەییـمـان.

بەڵگەنامە و نووسراوێکی ئەوتۆ لەبارەی ئەم ماوە دەسنیشانکراوەی وڵات و نەتەوەکەمان بەردەست ناکەون.(٣٨)

٤- زانا موسڵمانەکان (تورک، فارس، عەرەب، کورد).

بەڕای تۆژەری فەرەنسی، ژێرار شالیان Gerard CHALIAND، گەڕاڵ و جوگرافیاناس و مێژوونووسە موسڵمانەکان (تورک و فارس و کورد و عەرەب)، لەباری کرۆنۆلۆژییەوە، بە سەرچاوەیەکی گرنگی دیکە دەژمێردرێن بۆ دامەزراندنی بیری کوردناسی لای ڕۆژهەڵاتناسە ئەورووپاییەکان. ئەمانە دەستەیەکی دیکەی ئەو زانایانەن کە کوردستان بە دنیا دەناسێنن و چەند زانیارییەکی تازەی دیکەمان پێ دەبەخشن لەبارەی زمان و نەژاد و کولتوور و شێوەی ژیانی نەتەوەی کورد و بیناسازی و پیشەسازی و ئاووهەوای وڵاتەکەمان.

ئەم گەڕاڵە موسڵمانانە، لە سەدەی دەیەمی زایینی بەملاوە تاکو ساڵانی ١٣٠٠، لەڕێگەی نووسراوەکانی خۆیانەوە بە زمانی عەرەبی، دەبنە بنچینەیەکی گرنگی دیکە بۆ لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵاتناسی و لە ئاکامدا کوردناسی لە ئەوروپا. ئەم زانا موسڵمانانە لە ماوەی ساڵانی ٩٠٠ تاکو ساڵانی ١٣٠٠دا - واتە لە سەردەمی خەلافەتی ئەمەوی و عەبباسیدا - دارالمعرفەی بەغدایان پڕ کردبوو لە بەڵگەنامە و کتێبی مێژوویی و جوگرافی.(٣٩)

ناودارترین ئەو گەڕاڵ و مێژوونووس و جوگرافیاناسە موسڵمانانەی بە زمانی عەرەبی باسی ژیان و کولتوور و وڵاتی کوردانیان کردووە، بریتین لە:

- الطبري (٨٣٨-٩٢٣ز)
- ابن فردا ذبة (٨٩٣ ز)
- احمد الدينوري (لە ٨٩٥ز مردووە)
- ابن رستة (٩٠٦ ز)
- اليعقوبي (٩٠٦ ز)
- ابن فقية الهمداني (٩٢٣ ز)
- الاصطخري (لە ٩٥١ز مردووە)
- المسعودي (٩٥٧ ز)
- ابن حوقل (٩٧٧ ز)
- ابو علي الفارسي (٩٨٢ ز)
- ابا دلف مسعر بن المهلهل الخزرجي (لە نیوەی دووەمی سەدەی دەیەمدا مردووە).
- المقدسي (١٠٤٨ ز)
- ابن البلخي (١١٠٦ ز)
- ابن الاثير (١١٦٠- ١٢٢٣)
- ابن جبير (١٢١٧ ز)
- ياقوت الحموي (١٢٢٩ ز)
- ابو زكريا القزويني (١٢٨١ ز)

- ابن شداد (١٢٨٣ ز)
- شيخ الربوه (١٣٢٧ ز)
- ابو الفداء الايوبى (١٣٣٢ ز)
- ابن خلدون (١٣٣٢ - ١٤٠٦)
- فضل الله العمري (١٣٤٨ ز)
- حمدالله مستوفي القزويني (١٣٤٩ ز)

هەروەها جوگرافیاناسی مەغریبی، ئیبن بەتووتە (١٣٠٤ - ١٣٦٩ز)، کە لە سەفەرە ناودارەکەیدا، لە بەغداوە بە کوردستانی باشووردا تێپەڕیوە و لە سەفەرنامەکەیدا بە دووردرێژی باسی وڵاتی کورد و ژیانی گەلی کوردی لەو سەردەمەدا کردووە.[٤٠]

هەروەها چەند کوردێکیش، بە ناوی ئیسلامەوە و بۆ خزمەتکردنی کەلەپووری ئیسلامی، چەند سەرچاوەیەکیان بە زمانی عەرەبی نووسیوە. لەم کتێبانەدا لابەلا باسی کورد و کوردستانیان کردووە:[٤١]

١- ابن المستوفي (لە ١١٦٩ لە قەڵاتی هەولێر لەدایکبووە). کتێبی (تاریخ اربل) کە باسی شاری هەولێر و زاناکاکانی هەولێر دەکات لەگەڵ ئەو پیاوماقووڵ و گەورە پیاوانەی بە هەولێردا تێپەڕیون، نووسراوی ئەوە.
٢- ابن خلکان (لە ١٢١١ لە هەولێر لەدایکبووە). (وفیات الاعیان وانباء ابناء العنان) کە بیست ساڵ پێوەی خەریک بووە، بەرهەمی ئەوە.
٣- ابن الاثیر (١١٦٠ - ١٢٢٣)، لە ناوچەی جەزیرە و بۆتان لەدایکبووە. لە نموونەی بەرهەمەکانی: (الکامل في التاریخ) کە بە دەسکارییەوە لە تاریخ الطبري-یەوە وەری گرتووە.
٤- احمد داود ابو الحنیفة الدینوري (لە سنەی کوردستانی ئێران لەدایک بووە و لە ساڵی ٨٩٥ مردووە)، کتێبێکی نووسیوە بە ناونیشانی (کتاب الاخبار الطوال) کە باسی ئێرانی سەردەمی ئەسکەندەری مەقدۆنی دەکات تا ناوەڕاستی سەدەی نۆیەم.

الطبري (لە کتاب اخبار الرسل والملوک، ب ٣ و ١، ل ٥١ دا) باسی خەلیفە مەروان دەکات و دەڵێ کە خەلیفە مەڕوان بە بنەچە کوردە؛ المسعودي (لە مروج الذهب، چاپی ١٩٦٥، ب ٣، ل ١٠٠ و ٢٥٣، هەروەها ب ٢، ل ١٢٢ ـ ١٢٣) کۆمەڵێک زانیاریمان لەبارەی هۆزە کوردەکان دەداتێ و باسی بنەچەی کورد و زمانەکەمان دەکا؛ ابن بطوطة باسی ئەوە دەکا کە لەو سەردەمەدا شارەکانی مووسڵ و ماردین و سنجار چەند شارێکی کوردنشین بوونە؛[٤٢] هەروەها ابن خلدون (١٣٣٢- ١٤٠٦) (لە کتاب العبر، ب ٢، ل ٤٦١؛ ب ٢، ل ٤١٣ دا) باسی ئەوە دەکا کاتێ هێزی مەغۆل کوردە موسڵمانەکانیان تاڵان کرد و کوشتنیان، هەندێ لەهۆزە کوردەکان ناچاربوون بەرەو سووریا و میسر و جەزائیر کۆچ بکەن. ابا دلف مسعر بن المهلهل الخزرجي لە ٩٥١ سەری لە کرماشان داوە و باسی دەسڕەنگینییەکانی پەیکەرتاشێکی کورد دەکات بەسەر تاق و دیوارەکانی قەسری شیرینەوە؛ هەروەها باسی ژیانی کورد و شارە کوردییەکانی ئێران.[٤٣]

جگە لەمانەش، کتێبی (الف لیلة ولیلة) لە گەلێک دیمەندا باسی کوردی کردووە (بڕوانە بەرگی یەکەم، ل ٦٠٩ - ٦٢٣، بەرگی دووەم، ل ٢٤٢ - ٢٩٥).

شایانی باسە، هەندێک لە زانا موسڵمانە عەرەبەکان، کوردیان بەشێوەیەکی دڕندە و ناجۆر وەسف کردووە و بە

چاوی کەمەوە تەماشای کوردیان کردووە؛ بۆ نموونە گەڕاڵی ئەندەلووسی، ئیبن جوبێر لە کۆتایی ساڵانی ۱۱۰۰دا ئاوها وەسفی کوردان دەکات:

فتمادي سيرنا الي اول الظهر و نحن علي اهبة وحذر من اغارة الاكراد الذين هم آفة هذة الجهات، من الموصل الي نصيبين الي مدينة دنيصر يقطعون السبيل ويسعون فسادا في الارض. و سكناهم في جبال منيعة علي قرب من هذه البلاد المذكورة ولم يعن الله سلاطينهم علي قمعهم وكف عاديتهم. فهم ربما وصلوا بعض الاحيان الي باب نصيبين ولا دافع لهم ولا مانع الا الله عز وجل.(٤٤)

دەبێ ئاماژەی ئەوەش بکەین کە هەندێ لەو گەڕاڵ و مێژوونووسە موسڵمانانە بەرهەمیان راستەوخۆ بە زمانی خۆیان نووسیوە. ناودارترینیان محمود الغشقری (کاژغەری) کە کتێبێکی بایەخداری لە ساڵی ۱۰۷٤دا بە زمانی عوسمانی بە ناونیشانی (دیوان لغات الترک) نووسیوە کە تێیدا نەخشەیەکی لەبارەی وڵاتانی رۆژهەڵاتدا دروستکردووە و ناوی وڵاتی کوردیشی تێدا هێناوە. پاشان ئەولیا چەلەبی کە سیاحەتنامەکەی خۆی لە ساڵی ۱٦٥٥دا بە زمانی عوسمانلی نووسیوە. هەروەها حەیدەر چەلەبی، کە لە دیوانی بایەزیدی دووەمدا کاری کردووە و سکرتێری دیوانی پاشا بووە، لە ساڵانی ۱٥۱٤ ـ ۱٥۱۸ گەڕاوە و لە سەفەرنامەکەی خۆیدا هەموو کوردستانی وەسف کردووە. هەروەها ناسح مەترەقچی کە لە ۱٥۳٤ ـ ۱٥۳٦ دا لە کوردستاندا گەڕاوە و سەفەرنامەیەکی نووسیوە و باسی کوردستانی کردووە: ئاڵتوون کۆپری، دیاربەکر، کەرکووک. سەفەرنامەکەی بە ناوی (سولەیمان نامە) بووە کە لە ۱٥٤٥دا لەگەڵ کۆمەڵێک وێنە و میناتۆردا بڵاوکراوەتەوە. تەرجەمەی فەرەنسی و ئینگلیزی کراوە.(٤٥)

هەر لە سەدەی ۱٦مدا، مێژوونووسە کوردەکانیش رۆڵیان هەبووە لە ناساندنی کورد بە دنیا و چووزەرە دەرکردنی بیری کوردۆلۆژیا. ئەو مێژوونووسە کوردانە ئەمانەن:

- خەسرۆ خانی ئەردەڵانی: کتێبی " تاريخ اردلان"، لە ۱٥۷۷ دا بە فارسێ نووسراوە (لە شەرەفنامە کۆنترە) هێشتا هەر دەسنووسە، لەلایەن مێژوونووسێکی تورک لە بەغدا دۆزراوەتەوە.
- شەرەفخانی بەتلیسی، خاوەن کتێبی "شەرەفنامە" کە لە ساڵی ۱٥۹٦دا بە فارسی نووسراوە.
- سەیدی عەلی رەئیس Seydi Ali Reis کە بەپێی مێژوونووسی یۆنانی، Stephan YERASIMOS لە ساڵی ۱٥٥۷ دەفتەرداری دیاربەکر بووە، لە ساڵانی ۱٥٥۳ – ۱٥٥۷دا لە گەشتنامەیەکی خۆیدا بە عوسمانی، باسی سەرتاپای کوردستانی کردووە. کتێبەکەی کراوەتە فەرەنسی.(٤٦)
- هەروەها ئیبراهیم مەلا حسێنی ئەردەڵانی: خاوەنی " تاريخ اردلان"، لە سەدەی حەڤدەهەمدا بە فارسی نووسراوە.

## دێرێکی مێژوویی لەبارەی
## بایەخدانی ئەورووپا بە کوردستان

### سەرهەڵدانی بیری کوردناسی لە ئەورووپا (سالانی ١١٠٠)

جەنگی خاچپەرستەکان لە سەدەی ١٢مدا، لەنێوان رۆژهەلاتی موسڵمان و رۆژئاوای مەسیحیدا، لەپێناو دەستداگرتن بەسەر " خاکی پیرۆز" لە فەلەستین، بە سەرۆکایەتیی سەرکردەیەکی کورد بوو دژ بە سەرکردەیەکی ئەورووپی: سەلاحەدینی ئەییووبیی کورد دژ بە فیلیپ ئۆگەستی فەرەنسی Philippe Auguste (١١٦٥– ١٢٢٢). هەروەها دژ بە سەرکردەیەکی ئینگلیز، ریچارد شێردڵ (١١٩٩– ١١٥٧) Richard Coeur de lion کە لەو شەڕەدا لایەنگیری فەرەنسا بوو.

کەواتە پەیوەندیی نێوان ئەورووپا و کورد لەم جەنگە دینییە دێرینەی سەدەی دوازدەهەمەوە پەرە دەسەنێت، کە چەندین چیرۆکی ئەفسانەیشی لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی و ئەورووپییدا (بەتایبەتی لە فەرەنسا و ئینگلستان) دروست کردووە. چیرۆکی ئەفسانەیی فەقێ ئەحمەدی دارەشمارە و کیگانی " فەرەنگ" لە فۆلکلۆری کوردیدا بەرهەمی ئەم پەیوەندییە دێرینەی نێوان کورد و ئەورووپایە. کوردناسی ئینگلیز، مستەر ریچ C. J. RICH، لە گەشتنامە ناودارەکەی خۆیدا لەبارەی کوردستان Narrative of a Residence in Koordistan چاپی لەندەن: ١٨٣٦، ئەم چیرۆکە ئەفسانەییەی بۆمان گێڕاوەتەوە و مێژوونووسی ناسراوی کورد، محەمەد ئەمین زەکی بەگ، لە لاپەڕە ٥٤ – ٥٩ی کتێبی تاریخ السلیمانیة و انحائها (تەرجەمەی محەمەد جەمیل رۆژبەیانی، چاپی بەغدا: ١٩٥١)؛ ناوەڕۆکی ئەم پەیوەندییەی نێوان کورد و " فەرەنگستانی" شێ کردۆتەوە و دەڵێ: دیار نییە ئاخۆ کیگان Kigan، ئەو کچە ئازایەی لەگەڵ فەقێ ئەحمەدی دارەشمارە دەکەوێتە شەڕ و پاشان عەشقەوە؛ ئینگلیزە یان فەرەنسییە؟ هەروەها چیرۆکنووسێکی کوردیش، کامەران بەدرخان، ئەم جەنگەی نێوان سەلاحەدینی ئەییووبی و ریچارد شێردڵی سەرکردەی ئینگلیزی لایەنگیری فەرەنسای، تێکەڵ بە چیرۆکی عەشقی نێوان فەقێ ئەحمەد و کیگانی "فەرەنگ" کردووە و کردوویەتیە کەرەستەی یەکێک لە رۆمانەکانی خۆی، کە بە ناونیشانی (پاشای کوردستان) بە زمانی کوردی نووسیویەتی، پاشان لە ناوەڕاستی ساڵانی ١٩٣٠دا تەرجەمەی زمانی فەرەنسی کراوە و لە پاریس چاپ کراوە.[٤٧]

موژدەگارە مەسیحییەکانی ئەورووپا، لەنێوان سەدەی ١٢ و ١٣مدا – کە دەیانویست دینی مەسیحی بەناو خەڵکی رۆژهەلاتدا بلاوبکەنەوە – رۆڵێکی گەورەیان لە دروستکردنی ئەو پەیوەندییەی نێوان ولاتانی رۆژئاوا و کوردستاندا بینی.[٤٨]

ئەم موژدەگارانە بوونە هاندەرێکی کاریگەر بۆئەوەی ئەورووپاییەکان زیاتر رووبکەنە کوردستان؛ چونکە کوردستان بۆ ئەوان " مەڵبەندێکی گرنگی مەسیحییەت" بوو.[٤٩] لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا. هەولێر یەکێک بووە لەو شەش بنکە گرنگەی کە دیانەتی مەسیحیی لێوە بلاوکراوەتەوە.[٥٠] هەندێ زاناش رایان وایە کە مەسیحیەت یەکەم جار لە مێژوودا لە ناوچەی حەدیاب (لە هەولێری ئەمڕۆ) بلاوبۆتەوە.[٥١] طیمثاوسی گەورە (٧٢٧ – ٧٢٨ ز)، پاتریارکێکی ناوداری مەسیحییەکان (نەستۆرییەکان) بووە، لە هەولێر لەدایک بووە و ژیاوە. لە سەردەمی عەبباسیدا لە هەولێر هەوڵی ئاشتیی نێوان مەسیحییەت و ئیسلامی داوە.[٥٢]

بەم شێوەیە، یەکەمین گرووپی ئەو موژدەگارە مەسیحییانە، بە سەرۆکایەتیی Aorentin RICOLDO، لە ساڵی ١٢٨٨دا بوو گەیشتنە شاری تەوریز؛ پاشان بە ناوجەرگەی کوردستاندا چوونە شاری مووسڵ.(٥٣) لەوانەیە سەبارەت بە هەمان هۆی دینی و هەمان ستراتیژیەت بووبێ کە فەرەنسا هەر لە سەدەی سێزدەهەمەوە بایەخی داوەتە دەرس گوتنەوەی زمانە رۆژهەڵاتییەکان.(٥٤)

بە رای ژێرار شالیان، یەکەمین جوگرافیاناسی ئەورووپی کە هاتبێتە کوردستان جوولەکەیەکی ئیسپانی بووە بە ناوی بنیامێن دو توودێل B. DE TUDELE کە لە ماوەی ساڵانی ١١٦٣ - ١١٧٣دا لە رۆژهەڵات ماوەتەوە و سەفەرنامەکەی خۆی بە ناونیشانی (Sefer ha- masaot shel Rabbi Benjamin ) نووسیوەتەوە.(٥٥)

بنیامێن دو توودێل خەڵکی توودێل ی باکووری ئیسپانیا بووە، کاتێ دەگاتە مێزۆپۆتامیا دەبینی جەنگێک لەنێوان خاچپەرستەکان و ئیسلامدا هەیە. جوولەکەکانیش لە فەلەستینەوە، ماڵوێران، غار دەدەنە وڵاتی مێزۆپۆتامیای ژێر فەرمانڕەوای سەلجووقییەکان.

بنیامێن دو توودێل ئەوەمان بۆ باس دەکات کە لەو سەردەمەدا بزووتنەوەیەکی سیاسیی جوولەکە لە ئارادا هەبووە، بەرێبەرایەتیی جوولەکەیەکی کوردستان بەناوی داڤید ئەلرۆی David Alroy (کە لە پایتەختی میرنشینی بادینان، لە شاری ئامێدی لەدایک بووە). داڤید ئەلرۆی David Alroy شاری ئامێدیی کردبووە پێگەی ئەم بزووتنەوەیەی خۆی و پەیوەندیی زۆر پتەویشی لەگەڵ کوردەکاندا هەبوو، تەنانەت چەکدارە کوردە یەزیدییەکان پشتیوانیشیان دەکرد.(٥٦)

لە سەدەی دووازدەهەمەوە، ئەم گەڕاڵ و جوگرافیاناسانەی خوارەوە رۆڵێکی گرنگیان هەبووە لە دامەزراندنی بیری کوردناسی و ناساندنی کورد:

- گەڕاڵی ئیسپانی، پەتاهیا دو راتیسبۆن Petahia de Ratisbonne، لە سەرەتای ساڵانی ١١٨٠دا لە سەردەمی خەلیفە الناصر دا (١١٨٠ ـ ١٢٢٥) هاتۆتە هەولێر و کەرکووک و لە سەفەرنامەکەی خۆیدا باسیان دەکات.
- شاعیرێکی جوولەکەی ئیسپانی Yehuda al - Harizi لە ساڵانی ١١٩٠دا، سەر لە مەڵبەندی هەولێر دەدات و لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناونیشانی (مەقامات Meqamat) کە لە ١٨٨٣ لە Gottingen چاپ کراوە باسی دەکات و ناوی هەموو ئەو شاعیر و شەخسیاتانەش دەهێنێت کە لەو سەردەمەدا لە هەولێر ژیاون.(٥٧)
- جوگرافیاناسی ئەرمەن، هیتوومی یەکەم HETDUM I کە لە ساڵی ١٢٥٤دا بە کوردستاندا تێپەڕیوە و چۆتە تەوریز.
- جوگرافیاناس و گەڕاڵی ناوداری ئیتاڵی، مارکۆ پۆڵۆ (١٢٥٤ ـ ١٣٢٤) لە ساڵانی ١٢٧٠ ـ ١٢٩٥دا گەشتە ناودارەکەی بەرەو کوردستان دەکات و سەفەرنامەکەیشی لە کۆتایی ساڵانی ١٢٩٠دا دەنووسێتەوە.(٥٨)
- موژدەگاری ناودار، راهیبی دۆمینیکیی ئیتاڵی، ریکۆلدۆ دی مۆنتێکرۆتچی Ricoldo da Montecrotce (فلۆرەنسا ١٢٤٣ـ ١٣٢١) هاتۆتە وڵاتانی رۆژهەڵات و ئەرمینیا و تۆرۆس و بەغدا و مووسڵ؛ بە چیاکانی رواندزیشدا تێپەڕ بووە و هاتۆتە شەقڵاوە، هەندێ دەنگوباسی لەبارەی کورد و کوردستان لە کتێبەکەیدا بڵاوکردۆتەوە.(٥٩)
- جوگرافیاناسی چینی، رابان ساوما Rabban SAUMA لە ساڵانی ١٢٨٧ـ ١٢٩٠دا لە شاری پەکینەوە بە رێگای سەمەرقەندەوە هاتۆتە تەوریز پاشان بە کوردستانی ئێران و تورکیای ئەمڕۆدا تێپەڕیوە تا گەیشتۆتە دەریای رەش. سەفەرنامەیەکی بایەخداری هەیە.
- جوگرافیاناس، مۆنتەر کۆرڤین MONTER CORVIN لە ماوەی ساڵانی ١٢٩١ - ١٢٩٤ هاتۆتە کوردستان.

- سێمپات کۆنێتابل Sempat Connetable کە لە ١٢٤٧ ـ ١٢٤٨دا بە شارەکانی کوردستانی تورکیای ئەمڕۆدا تێپەڕیوە و چۆتە سەمەرقەند.
- گریگۆری پالاماس، Gregoire PALAMAS، فەرەنسی بووە؛ لە ١٢٦٩ لە ئەستەمبوڵ لەدایک بووە. لە ١٣٣٥ لەلایەن تورکەکانەوە لە ئەنادۆڵ دەستبەسەردەکرێ و لە ١٣٥٩ دەمرێ. ناونیشانی کتێبەکەی ئەمە بووە: (دەسبەسەریی پالاماس لای تورکان) لە سالی ١٩٧٩ چاپ کراوەتەوە:

Anna Philippidisi - Braet: La captivite de Palamas chez les Turcs, in ,, Travaux et Memoire << CRHC de Bywance<< VII, 1979, P. 109-222.

- جوگرافیاناس، ئوردۆریچ ORDORIC لە ماوەی سالانی ١٣١٨ – ١٣٣٠ سەری لە کوردستان داوە.
- ئەفسەری هەنگاری (کە د، جەمال نەبەز بە زێرنگەری باڤاری ناوی دەبات) جۆهان شیلتبێرژەر Johann SCHILTBERGER لە سالانی ١٣٩٦ – ١٤٠٢ هاتۆتە کوردستانی تورکیای ئەمڕۆ. گەشتنامەیەکی لە سالی ١٤٧٣دا بە زمانی ئەلمانی بلاوکردۆتەوە و لەوێدا ناوی کوردی بردووە. باسی مەلاتیە و سیڤاس و ئەرزنجان و قۆنیا دەکا. لە سەردەمی قەرەقۆینلوودا بە دیل گیراوە. بە ڕای د. جەمال نەبەز، لەوانەیە کۆنترین سەرچاوەی ئەلمانی بێت کە ناوی کوردی تێدا هێنراوە.[٦٠]
- جوگرافیاناسی رووس، بازیل BASIL کە لە ١٤٦٤ – ١٤٦٦ باسی سیڤاس و عەنتاب و ئەدەنە و گەلی شاری دیکەی کوردستان دەکا.
- بازرگانی رووس، ئەتاناس نیکیتین Athanase NIKITINE لە ١٤٦٦ – ١٤٧٢دا.
- هەروەها چەند گەڕاڵێکی ئیتالی.[٦١]

هەموو ئەمانە، بە چەند سەرچاوەیەکی گرنگ دەژمێردرێن بۆ دامەزراندنی بیری کوردناسی لای ئەوروپییەکان لە ماوەی سالانی ١١٠٠– ١٤٠٠دا.[٦٢]

بەشێوەیەکی گشتی گەڕاڵ و جوگرافیاناسە ئیسپانی و ئیتالی و پۆرتوگالییەکان، دوای یۆنانییەکان، لەرووی کرۆنۆلۆژییەوە، یەکەم ئەو ئەوروپاییانە بوونە کە هاتوونەتە کوردستان و لەسەر کوردستانیان نووسیوە، ئینجا دووای ئەوانیش ئەرمەن و چینی و رووس و ئەلمانی و فەرەنسی.[٦٣] ئەم رۆژهەلاتناسە ئەوروپییانە لە کاتی باسکردنی فلان ئیمپراتۆریەتی فارسی و ئەرمەنی یان عەرەبی و تورکی، یان لە کاتی باسکردنی فلانە میرنشین و ویلایەتی عوسمانی یا عەرەبی و فارسی، باسێکی کورتیشیان لەبارەی کورد و ولاتی کوردەوە کردووە.

**ئەم سەفەرنامانە، هیچ یەکێکیان تایبەت نەبوون بە کورد؛ بەلکو باسی ولات و نەتەوەکانی عەرەب و تورک و فارسیان دەکرد. تەنیا چەند لاپەڕەیەک یان ئەوپەڕی چەند فەسلێکیان تەرخان کردبوو بە کورد.** لە زۆربەی ئەم سەرچاوانەدا، ناوی کورد وەک رەوەند و هۆز و کۆمەلە خەلکێکی ئێتنی هاتووە، نەک وەک نەتەوەیەک یان میللەتێکی خاوەن دەولەت. لە هەموو ئەو نووسراوانەدا، هێشتا، ناوی کورد و کوردستان بە شێوەی Courde و Courdistan نووسراوە؛ واتە: بە C نەک K.

بازرگان و گەڕالە ئەوروپاییەکان لە ١٥١٠ بەملاوە بە لێشاو سەفەر دەکەن بەرەو رۆژهەلات؛ بە تایبەتیش بەرەو ئەسفەهان و ئەستەمبوڵ و تەورێز و تەرابزۆن. پێشکەوتنی بازرگانی لەنێوان ولاتانی ئاسیا و ئەورووپادا، لە سەدەی ١٦م بەملاوە بوو دەستی پێکرد.[٦٤] ئەو رۆژهەلاتناسانەی کە لە سەدەی شازدەهەمدا روویان کردۆتە ولاتانی رۆژهەلات و چەند لاپەڕەیەکیان لەسەر کوردستان نووسیوە، ئەمانەن:

- کلۆد بیلیڤر: ١٥٢١.

Claude BELLIEVRE: Souvenire de voyage en Italy et en Orient 1521, Publie par Charles PERRAT, Geneve: 1956.

سەری لە کوردستانی تورکیای ئەمڕۆ داوە و باسی شاری بەتلیسی کردووە. ناونیشانی سەفەرنامەکەی (بیرەوەرییەکانی سەفەری ئیتالیا و رۆژهەڵات)، لە ١٥٢١دا چاپ کراوە.

- ژاک گاسووت: ١٥٥٠.

- Jaques GASSOT 1547-49: Le discours du voyage de Venise a Constantinople, Paris: 1550. 2me ed. Bourges: 1684.

باسی وان و مووش و بەتلیس و دیاربەکر و مەلاتیە و ئورفەی کردووە. ناونیشانی کتێبەکەی (گێڕانەوەی سەفەرنامەیەک لە ڤینیزەوە بۆ ئەستەمبۆڵ). لە ١٥٥٠دا چاپ کراوە.

- پییێر بیلون: ١٥٥٣.

Pierre BELON 1547- 1549: Les observations de plusieurs singlaritez et cheses memorables trouvees en Grec, Asie, Paris: 1553, 5e ed. Paris: 1588.

سەری لە کوردستانی تورکیا و سووریای ئەمڕۆ داوە. ناونیشانی سەفەرنامەکەی (تێبینییەکانی کۆمەڵێک شتی بیرهێنەرەوەی یۆنان و ئاسیا). لە ١٥٥٣ چاپکراوە.

- ژان شیسنۆ: ١٥٥٥. لە ١٧٥٩ چاپکراوە.

Jean CHESNEAU 1547-1555: Le voyage de Mr d Araman in ,, Leon Menard,, , PariS: 1759. Vol. 1er.

باسی دیاربەکر و مووش و خەرپووت و بەتلیس دەکا. لە ١٧٥٩ چاپ کراوە. هەروەها بڕوانە:

Jean CHESNEAU: Le Voyage de Me d Araman in ,,Leon Menard,, 1547-1552, Pieces fugitives pour servir a l Histoire de France, Paris: 1759, Vol. 1er, in Revue Retrospective, T. XIX, 1838, P. 341-71' et 2me livre: Le Voyage de Mr d Araman1553-1555, Publie par M. Ch. SACHERER, Paris: 1887, LXI 295 pages.

باسی کوردستانی تورکیا و سووریای ئەمڕۆ دەکات. ناونیشانی سەفەرنامەکەی (سەفەری مسیۆ ئارامان لە سالآنی ١٥٤٧ـ١٥٥٢).

- بازرگانێکی ڤینیسی نەناسراو Marchand Venitien Anonym کە سەفەرنامەکەی لە ساڵی ١٥٥٩دا بە ئیتاڵی لە ڤینیز چاپ کراوە. لەوێدا بەکورتی وەسفی قەڵا دڵگیرەکەی شاری بەتلیس دەکات و باسی ئەوە دەکات کە شا ئیسماعیلی سەفەوی سوپایەکی شەش هەزار کەسەی ناردبووە سەر (شەرەف بەگ)ی میری ئەو ناوچەیە. سەفەرنامەی ئەم بازرگانە نەناسراوە لە ساڵی ١٩٥٩دا بە ناونیشانی Viagie d un marchante سەرلەنوێ لە شاری ڤینیز لە دەزگای Ramusin چاپ کراوەتەوە.

- فیلیپ دو فرینس کانای: ١٥٧٣.

Philippe du Frense-Canaye: Le Voyage du levant1573, publie par M.H. HAUSER, Paris: 1897, 332 p.

ئەمباسادۆری فەرەنسی بووە لە ڤینیز؛ سەری لە ئەنادۆڵ داوە. ناونیشانی سەفەرنامەکەی (سەفەری رۆژهەڵات). لە ١٥٧٣ چاپ کراوە.

– جیـهـووس ها ئـابۆت، کە سـەفـەرنامـەکەی، بە زمـانـی عـیـبـری لە ڤـینـیـز لە ١٥٧٥ چاپکراوە. لە لاپەڕە ٤٤٥ بەملاوە باسی کوردستان دەکات و بەتایبەتیش بەدرێژی باسی هەولێر Arbel دەکات.

Jichus Ha - ABBOT 1537: in E. CARMOLY: Itineraires de la terre saint des XIIE - XVIIe siecle, tr. de l Hebreu, Bruxelles: 1847, P. 432-467.

– ژاک گاسووت، سەفەری دووەم و بەرگی دووەم.

Jaques GASSOT 1547-1549: Les discours du voyage de Venise a Constantinople, Paris: 1580. 2me livre: Lettre ecrite d Alep, Bourges: 1671.

باسی دیاربەکر و بەتلیس و ئەدەنە و مەلاتیـەی کردووە. لە ١٥٤٧/٢/١٧ ڤینیزی جێهێشتـووە بەرەو کوردستـانی تورکیا.

– جوگرافیاناسیی ئەلمانی، ل. رۆتۆلف Leonharte RAUTOOLFF لە ساڵی ١٥٦٠ لە فەرەنسا لەدایکبووە. لە ساڵی ١٥٨٢دا لە شاری فرانکفۆرت سەفەرنامەکەی خۆی بە ناونیشانی (Aigentiche Beschreibung der Raiss So er vor dieserzeit gegen Auffgang چەندین تێبینی لەبارەی وڵاتانی ڕۆژهەڵات) چاپکردووە و تێدا باسی دیر الزور و کـەرکـووک و کـەلەک و نوسـەیبین و ئورفـە و گـازی عـەنتـاب و هەولێـر و مـووسل دەکـات. لە سـاڵی ١٦٩١دا تەرجەمەی ئینگلیزی کراوە Travels in to Estern Contries.

– گێرسۆن بێن ئاشەر: (پیاسەیەک بەناو سەرزەمینی پیرۆزدا)، بە زمانی عیبری، تەرجەمە کراوەتە فەرەنسی، لە ساڵی ١٥٩٩دا لە ڤینیز چاپکراوە. بەدرێژی باسی هەولێر و ژیانی کوردستان دەکات.

Gerson Ben QSCHER 1561: in E. CARMOLY: Itineraire de la terre saint des XII - XVIIme siecles; traduction de l Hebreu; Bruxelle: 1847:

لە ئەنجامی سەرژمێری و بەراوردێکی باریکبینداا، ئەوەمـان بۆ دەردەکەوێ کە ژمارەی سەفەرنامە و کتێبەکانی کوردناسیی سـاڵانـی ١١٠٠ تاکو سـاڵانی ١٦٠٠ لە ئەورووپا چاپ کـراون زۆر کەمـتـرن لەچاو ئەوانەی لە سـاڵانی ١٧٠٠ بەملاوە دەردەکەون.[٦٥]

لە مانگی حوزەیرانی ١٩٩٢ و شوباتی ١٩٩٣دا، بیبلیۆگرافیایەکم دروستکردبوو لەبارەی بەشێکی ئەو کتێب و وتارانەی بە زمانی فەرەنسی، ئینگلیزی، ئەڵمانی، باسی ژیانی کورد دەکەن لە ماوەی ساڵانی ١٥٨٢– ١٨٣٩دا. ئەو بیبلیۆگرافیـایەم بە دوو زنجیرە لە گۆڤاری بەرهەم Berhem، بە ناونیشانی (پەرتووکێن کوردناسیی ب زمانی ئینگلیـزی و فـەرەنسی و ئەڵـمـانی د ناڤـبـەری سـاڵێن ١٥٨٢ – ١٨٣٩دا) لە ئەڵـمـانیـا بە ئەلفـابێی لاتینی بڵاوکردەوە. بەپێی ئەم بیبلۆگرافیـایە و چەند سەرچاوەیەکی دیکەی کە لێرەدا بەکارمان هێناون، بۆمان دەردەکەوێ کـە بڵاوبوونەوەی ژمـارەی کـتـێب و سـەرچاوەکـانی کـوردناسـی (بە زمـانە ڕۆژئاواییـیـەکـان)، لە هەر سـەدەیەکـدا، بەشێوەیەکی ڕێژەیی، بەم شێوەیە:

| سەدە | ژمارەی سەرچاوە و بە کام زمان |
|---|---|
| ١١٠٠ | ٢ ئیسپانی |
| ١٢٠٠ | ٢ ئیتاڵی، ١ ئیسپانی، ١پۆرتوگالی، ١ ئەرمەن، ١ چینی |
| ١٣٠٠ | ١ ئیتاڵی، ١ رووسی، ١ فەرەنسی |

| | |
|---|---|
| ١٤٠٠ | ٣ رووس، ١ ئیتاڵی، ١ ئەڵمانی، ١ هەنگاری |
| ١٥٠٠ | ٤ فەرەنسی، ٢ ئەڵمانی، ١ ئیتاڵی، ٢ عیبری |
| ١٦٠٠ | ٥ فەرەنسی، ٣ ئیتاڵی، ٢ ئەڵمانی، ٢ ئینگلیزی، ١ رووسی |
| ١٧٠٠ | ٦ ئەڵمانی، ٦ فەرەنسی، ٥ ئینگلیزی، ٤ ئیتاڵی، ٢ رووسی، ١ دانمارکی |
| ١٨٠٠ | زیاتر لە سەد سەرچاوە بە زمانی جۆراوجۆر |

**ئەم خشتەیەی خوارەوە خشتەیەکی گشتی و رێژەییە بایەخی میللەتان و گەڕیدەکانی دنیا بەناساندنی کورد روون دەکاتەوە:**

| سەدە | زانایانی سەر بە کام میللەت | بە کام زمان |
|---|---|---|
| پێش زاین | یۆنانییەکان | یۆنانیی کۆن |
| ١٠٠ - ٨٠٠ | یەک سەرچاوەی ئەرمەنی | ئەرمەنی |
| ٩٠٠ تا ١٥٠٠ | زانا موسڵمانەکان | عەرەبی |
| ١٥٠٠ - ١٧٠٠ | ئەورووپایی و کورد | زمانە ئەورووپییەکان و فارسی و عوسمانلی |
| ١٨٠٠ - ١٩٠٠ | ئەورووپاییەکان | زمانە ئەورووپییەکان |
| ١٨٥٨ بەملاوە | کوردەکان | کوردی |

لێرەدا، ئەگەر تەنیا تورکیای عوسمانلی سالآنی سەدەی چواردەهەم تا شازدەهەم تەماشا بکەین، دەبینین: ٤٤٩ گەڕیدە لە هەموو دنیاوە لە ماوەی سەدەی ١٤م تاکو سەدەی ١٦م چوونەتە تورکیای عوسمانلی، ژمارەی زۆرترین ئەو گەڕیدانەش کە لەو سەردەمانەدا چوونەتە شوێنی ناوبراو، ئیتاڵییەکانن: (١٣٦)، پاشان ئەڵمانی: (٨٠)، پاشان فەرەنسی: (٤٣)، پاشان ئینگلیز: (٣٤)، ئینجا ئیسپانی: (١٨)، سویسری: (١٦)، یۆنانی: (١٤)، رووس: (١٠)، پۆرتوگالی: (٨)، عەرەب: (٨)، دانمارکی: (٣).

بە پێی ئەم سەرژمێرییەی سەرەوە، دەردەکەوێ کە ئیتاڵی و ئەڵمانی و فەرەنسی و ئینگلیزەکان، لە هەموو کەسێک زیاتر روویان کردۆتە تورکیای عوسمانلیی سالآنی ١٣٠٠ ـ ١٥٠٠. ئەمەش لەبەرئەوەی ئیتاڵی و ئەڵمانی و فەرەنسی و ئینگلیزەکان هەر لەو سەردەمەوە ئەمباساد و باڵوێزخانەیان لە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانیدا هەبووە. میللەتانی دیکەی رۆژئاوا هێشتا باڵوێزخانەیان لە تورکیای عوسمانیی ئەوکاتدا نەکردبۆوە.(٦٦)

**لە سەدەی ١٧م و ١٨مدا**

لەسەر داوای ئەو فەرەنسییانەی دەچوونە وڵاتانی رۆژهەڵات، دەوڵەتی فەرەنسا لە سەدەی ١٦دا قوتابخانەیەکی لە ئەستەمبوڵ دامەزراند بۆ پێگەیاندنی قوتابیان لە بەشی تەرجەمەدا. ئنجا لە سەدەی ١٧دا لێکۆڵینەوەی رۆژهەڵاتناسی لە پاریسدا فراوانتر بوو، ژمارەی مامۆستا رۆژهەڵاتناسەکان و زمانزانەکان زیاتری کرد. لە ساڵی ١٧٧٤یشدا، کۆلێژی شاهانە College Royal بەشێکی تایبەتی بۆ فێربوونی زمانی تورکی و فارسی کردەوە. پاشان لە ساڵی ١٧٩٥دا قوتابخانەیەکی تایبەت بە زمانە رۆژهەڵاتییەکان، بەناوی قوتابخانەی زمانە رۆژهەڵاتییەکان Ecole des Langues Orientales لە پاریس دامەزرا؛ فارسی و تورکی و عەرەبیی تێدا دەخوێنرا.(٦٧)

کرانەوەی ئەم قوتابخانەیە لە پاریس لە ساڵی ١٧٩٥دا یەکەم هەنگاوی گرنگ بوو بەرەو ڕێگای بیرکردنەوە لە دامەزراندنی بەشێک بۆ ناساندنی زمان و ئەدەبیات و مێژووی کورد لەناو ئەو قوتابخانەیەدا لە داهاتوودا، واتە لە سەدەی نۆزدەهەمدا. پییێر ـ ئامێدی ژوبێرت Pierre-Amedee JAUBERT ١٧٧٩ - ١٨٤٧، کە دیپلۆماتێکی ناوداری فەرەنسییە، دەرچووی ئەم قوتابخانە ناوبراوەیە. کە ئەم قوتابخانەیە تەواو دەکات، لە ساڵی ١٨٢١دا لە پاریس کتێبێکی بایەخدار لەبارەی کوردستان بە ناونیشانی Voyage en Armenie et en Perse بڵاودەکاتەوە.

سەرچاوەکانی کوردناسی لە ئەورووپای سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەمیشدا بە هەمان شێوە، هەر کتێبێکیان تەنیا لە چەند فەسڵێکدا باسی کوردیان کردووە؛ تەرخان نەبوونە بە کوردستان، بەڵام لە باری چەندێتییەوە زیاتر بوون.(٦٨)

لەو سەردەمانەدا بابەتی کورد و کوردناسی، هێشتا هەر، لە ئێرانناسی Etudes Iraniennes جودا نەبۆوە چونکە لە لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ئەم بوارەدا "زاراوەی ئێران واتای سیاسی و قەوارەی دەوڵەتی نەدەگەیاند". گرووپی ئێرانی وەک گرووپی سلاڤی یا لاتینی یا جەرمەنی بەکاردەهێنرا، هیچ پەیوەندییەکی بە سیاسەت و دەوڵەت و چارەنووسی نەتەوەییەوە نەبوو. هەر چۆنێک بێت، لە سەدەی حەڤدەهەمدا هیچ نەبێت هێندە بەسە کە بۆ یەکەمین جار ناوی کوردستان لەسەر ناونیشانی بەرگی کتێبێکدا تۆمار دەکرێت. ئەمەش لەلایەن گەڕیدەیەکی ئەڵمانی بە ناوی O DAPPER لە سەفەرنامەیەکیدا بە ناونیشانی Asie Oder ausfuhrliche Beschreibung des Reichs کە لە ١٦٨١ لە نوومبێرگ چاپکراوە.

سەدەی هەژدەهەم بەوە دەناسرێتەوە کە لە رووسیاش، بە هەمان شێوەی وڵاتانی دیکەی ئەورووپا، کورد و زمانەکەی، بۆ یەکەم جار، دەناسرێن. ئەمەش، وەک د. ئەورەحمانی حاجی مارف باسی دەکات، لە ساڵی ١٧٨٧ بەملاوە بوو، کاتێ ئەکادیمیای زانستی رووسی (فەرهەنگی بەراوردیی هەموو زمان و شێوەکان)ی لەچاپ دا.(٦٩)

لە فەرەنساش، فەرەنسییەکان ـ خۆیان دووپاتی دەکەنەوە کە گەڕاڵە فەرەنسییەکان تەنیا لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمەوە بووە کە بەشێوەیەکی دیار و لەبەرچاو روویان کردۆتە رۆژهەڵات.(٧٠)



لە سەدەی حەڤدەهەم بەملاوە، لە فەرەنسا، موژدەگارە مەسیحییەکان و کاپووسانەکان Les Capussins، پەیتا پەیتا و زیاتر روودەکەنە کوردستان، کتێب لەبارەی زمان و ئەدەبیات و دین و مێژووی کورد بە زمانی فەرەنسی بڵاودەکەنەوە.(٧١)

جگە لە ئەوان، بە رای تۆما بوا Th. BOIS، راهیبە دۆمینیکییەکان دەوریان زۆر بووە لە دامەزراندنی کوردۆلۆژی لە فەرەنسا. وەفدی راهیبە دۆمینیکییەکان و وەفدی مارکیز دوو نوانتێل DE Nointel لە ساڵانی ١٦٧١ و ١٦٧٣دا کۆمەڵێک دەسنووسی رۆژهەڵاتییان هێنایە وڵاتانی ئەورووپا و بەتایبەتیش فەرەنسا؛ ئنجا زاناکان کەوتنە لێکۆڵینەوە و چاپکردنیان، پاشان وردە وردە کەوتنە سەر فێربوونی ئەو زمانە رۆژهەڵاتییانە لەوانە کوردیش.(٧٢)

پوولێ Poullet یەکێکە لەو موژدەگارانە، سەفەرنامەکەی خۆی بە ناونیشانی Nouvelle Relation du Levant لە ساڵی ١٦٦٨ لە شاری پاریس چاپ کردووە. ئەم سەفەرنامەیە ٤ نەخشەی لەبارەی مەڵبەندەکانی کوردستان تێدایە. لە لاپەڕە ٣٤٠ تا ٣٧٦ تەرخان کراوە بۆ کورد.

ژان دی ئێڤێنۆت Jean DE THEVENOTTE (١٦٣٣ – ١٦٦٧)، لە ١٦٥٥ گەشتێکی رۆژهەڵاتی کردووە. دووەم جار لە ١٦٦٣ هاتۆتەوە رۆژهەڵات. سەفەرنامەکەی، بە ناونیشانی (سەفەر بەرەو رۆژهەڵات Voyage en Ori-ent) لە ١٦٧٤دا لە پاریس چاپکراوە. نووسەر لە بەشی دووەمی سەفەرنامەکەیدا، لە لاپەڕە ١٠٦ تا ١٣٧ باسی کوردی کردووە.(٧٣)

The travail of John MILDENHALL 1599-1600 in to the Ind and in the country of Persia, London: 1625.

بە زمانی ئینگلیزی، باسی دیاربەکر و بەتلیس و وان و نوسەیبین دەکا.

– ئابیل پینسان: ١٦٥١.

- Abel PINCIN: Relation d un voyage de Perse 1598 in ,, Claude Barthelemy Morisot: Relations Veritables,, Paris: 1651, T. II, P. 103-58.

چۆتە کوردستانی سووریا و عیراق و ئێرانی ئەمڕۆ: کرماشان، کنگاوەر، جەزیرە، بێستوون. تەرجەمەی ئینگلیزیش کراوە. لە ١٦٥١ چاپکراوە.

جگە لەمانەش، کتێبە ناودارەکەی گەڕاڵی ئیتاڵی، پیەترۆ دێللا ڤاللا Pietro DELLA VALLA کە لە پاریس لە ساڵی ١٦٦٢دا بە زمانی فەرەنسی بە ناونیشانی سەفەرە ناودارەکانی پیەترۆ دێللا ڤاللا Les fameux voyages de Pietro DELLA VALLA بڵاوکرایەوە کارێکی زۆر گەورەی کردە سەر بیری روژهەڵاتناسی و سەرهەڵدانی کوردناسی لە فەرەنسا. کتێبی ناوبراو، لە بەرگی دووەمدا لە بەشی چوارەم باسی سروشتی کورد دەکات و دەڵێ: "کوردستان شارەزام. خەڵکەکەی تا بڵێی بەدەست و دڵ و نانبدە و جوامێر و شارستانین".(٧٤)

جوگرافیاناسی ئەڵمانی ئادام ئۆلێریۆس Adam OLEARIVS، لە سەفەرنامەکەی خۆیدا کە تەرجەمەی فەرەنسی کراوە و لە ١٦٦٦دا لە پاریس چاپکراوە Relation du voyage، بەفراوانی و زۆر بەوردبینی و بەبایەخەوە لە جوگرافیای سیاسی کوردستانی ساڵانی ١٦٠٠ی کۆڵیوەتەوە.(٧٥)

– راپۆرتێک بە زمانی ئەڵمانی بە پێنووسی Thomas Von Wiering بە بۆنەی یەکێک لە جەنگەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە، لە ژمارە (٣٨)ی گۆڤاری Turchis - Estats - Und Kriegs - Bericht دا لە هامبۆرگ لە مانگی شوباتی ١٦٨٤ بڵاوکراوەتەوە. چەند لاپەڕەیەکە لەبارەی ژیان و وڵاتی کوردەوە نووسراوە.

– گەڕیدەیەکی فەرەنسی بە ناوی Chevalier CHARDIN چەندین سەفەرنامەی لەبارەی وڵاتی فارس بۆ جێ هێشتووین کە باسی وڵاتی کوردیشی تێدا دەکات. یەکێک لە کتێبەکانی، بە ناونیشانی سەفەرنامەی وڵاتی فارس Journal du voyage en Perse، بە فەرەنسی، لە ١٦٨٦ لە لەندەن چاپ کراوە؛ چاپی دووەمیشی لە ئەمستردام لە ١٧٣٥ چاپ کراوە. سەفەرنامەکەی، چوار بەرگە. لە بەرگی سێیەمدا، لاپەڕە ٤ ـ ٩، باسی Kourdistan دەکا، هەروەها لە بەرگی یەکەم و چوارەمیشدا رێبوارانە باسی کورد دەکات.

سەفەرنامەکەی شاردان، نەخشەیەکی تێدایە کە ناوی کوردستانیشی تێدا هاتووە، هەروەها چەندین وێنەی جوانی لەبارەی کوردستان تێدایە.

گەڕیدەیەکی ئەڵمانیی دیکە بە ناوی O DAPPER سەفەرنامەیەکی بە ناونیشانی Asie Oder ausfuhrliche Beschreibung des Reichs بۆ جێ هێشتووین کە بۆ یەکەمین جار ناوی کوردستانی لەسەر ناونیشانی بەرگی کتێبدا هێناوە، لە لاپەرە ١٧٤ و ٣٠٤دا باسی ژیان و وڵاتی کورد دەکات. بە ئەڵمانی، لە ١٦٨١ لە نوومبێرگ چاپ کراوە.

بەڵام گرنگترین سەفەرنامەی سەدەی ١٧م بریتییە لە سەفەرنامەکەی Jean-Baptist TAVERNIER بە ناونیشانی Les six voyages en Perse، لە ساڵی ١٦٧٦ لە سویسرا چاپ کراوە. ئەم کتێبە لە کاتی بڵاوبوونەوەیدا، دەنگی دایەوە و شۆرەتی وەرگرت.

ژان باپتیست تاڤێرنییێ (١٦٠٥ـ ١٦٨٩) کە لە ١٦٣٢دا هاتۆتە کوردستان، لە کتێبەکەیدا بایەخی ستراتیژیەتی بازرگانی و ئابووریی مەڵبەندی کوردستانمان بۆ روون دەکاتەوە و زۆر بەوردی و فراوانی وەسفی هەموو ئەو رێگا بازرگانییە گرنگانەمان بۆ دەکات کە بە ناوەڕاستی کوردستاندا تێپەڕدەبن و جیهانی رۆژئاوا بە رۆژهەڵات دەبەستنەوە. هەروەها باسی میرنشینی بەتلیسیمان بۆ دەکات و ئەو میوانداریییەی کە لەلایەن میری بەتلیسەوە کراوە. ناوبراو زیاتر لە هەشتا لاپەڕەی کتێبەکەی تەرخان کردووە بۆ قسەکردن لەبارەی کوردستانی ساڵانی ١٦٣٠، کە ئەو ساڵانەش بۆ مێژوونووسانی کورد چەند لاپەڕەیەکی تاریکن و هیچیان لەبارەوە نازانین.

ژان باپتیست تاڤێرنییێ لە بەرگی دووەم لاپەرە ٣٠-٣١دا دەڵێ: «شتێکی زۆر خۆشە بە سەفەر بێیتە وڵاتی کوردان»؛ هەروەها لە بەرگی دووەم لە لاپەرە ٢٨دا دەڵێ: **« ئەم وڵاتەی کە لە هەموو وڵاتێکی دیکە بە هێزتر و سەرنجڕاکێشترە؛ لەبەر ئەوەی نە سەر بۆ سوڵتانی عوسمانی دادەنوێنێ، نە پاشای فارسەکانیش بە هیچ دەزانێ. ئەمە لەکاتێکدا هەموو میرەکانی دیکە، سەر بە یەکێک لەم دووانەن»**. (٧٦)

لە رێزی گەڕاڵە ئەوروپاییییەکانی دیکەی دوای ئەمانە، لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا، بەرهەمی ئەمانەی خوارەوە لە هەموویان گرنگترن:

– گەڕاڵێکی جەربەزەی فەرەنسا، دو فرێزنی Du Fresny، کە لە ساڵی ١٧٠٧دا ماوەیەک لە وڵاتی ئێران Perse و دەوڵەتی عوسمانیدا ماوەتەوە، لە سەفەرنامەکەی خۆیدا بە چەند لاپەڕەیەک باسێکی کوردانیشی کردووە.

– ژێسەف دو توورنەفۆرت، فەرەنسییە، لە بەرگی دووەمی سەفەرنامەکەیدا، کە لە ١٧١٧دا لە پاریس چاپ کراوە، بەدرێژی باسی کورد و کوردستان دەکات و بنەچەی کوردان دەباتەوە سەر خالدییەکان. کتێبەکەی، پڕە لە وێنە و نیگاری جوان لەبارەی هەندێ لە شارەکانی کوردستان.

Jeseph P. de TOURNEFORT: Relation d un voyage du Levant, Imp. Royale, Paris: 1717, T2, P. 266.–

- جوگرافیاناسی ئەلمانی ئادام ئۆلیریۆس:" سەفەرێکی زۆر سەیر و ناودار بەرەو مۆسکۆ و تاتار و پێرس "، باسی دیاربەکر و لورستان و دەربەند دەکات. تەرجەمەی فەرەنسی کراوە.

- OLEARIVS Adam 1600 -1671: Voyagee tres curieux et tres renommez faits en Moscovie, Tartarie et Pers , Leide; 1719.

–گەڕیدەیەکی ئینگلیز بە ناوی R POCOCKE سەفەرنامەیەکی بە ناونیشانی A description of the East and som other contries بۆ جێ هێشتووین. لە لاپەڕە ٢٦٨ و ٣٠٨دا باسی ژیان و وڵاتی کورد دەکات.

بە ئینگلیزی، لە ١٧٤٥ چاپ کراوە. لە ١٧٧٢دا تەرجەمەی فەرەنسی کراوە و لە لاپەڕە ٤٨٣ – ٤٨٤ و ٤٧٩دا باسی ژیان و وڵاتی کورد دەکات.

ـ ژان ئۆتێ: " گەشتێک بەرەو تورکیا و وڵاتی فارس". لە ١٧٤٨ لە پاریس چاپ کراوە. لە بەرگی دووەمدا بە ١٣٠ لاپەڕەیەک باسی کوردستان دەکات. تەرجەمەی فارسی کراوە.

J. OTTER: Voyage en Turquie et en Perse, Paris: 1748. 2 T.-

– دۆمینیک لانزا راهیبێکی ئیتالی بووە لە ١٧١٨ لەدایک بووە و لە ٣١ ی کانوونی دووەمی ١٧٥٤ تا ٢٢ ئازاری ١٧٦١ لە مووسڵ ژیاوە، پاشان لە ٢٥ی ئازاری ١٧٦٤ تا ٢٣ی ئایاری ١٧٧٠ دیسان هاتۆتەوە کوردستان). دۆمینیک لانزا دەڵێ: عوسمانییەکان عیراقیان دابەش کردبووە سەر سێ ویلایەت: مووسڵ و بەغداو بەسرە. هەر ویلایەتێک والییەکی هەبوو. دانان و لابردنی هەر والییەک بەدەست سوڵتانەوە بووە. هەر والییەکی هاتبێتە مووسڵ خەڵکێ مووسڵ نەبووە، ئەوەندەش دەسەڵاتی بەسەر ویلایەتی مووسڵەوە نەبووە.(٧٧)

ـ سەفەرنامەیەک بە زمانی ئەلمانی لە دوو بەرگدا بە ناونیشانی (Reisebeschreibung nach Arabian گەڕانەک بۆ عەرەبستان و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیک) لەلایەن گەڕیدەیەکی ئەلمانی بە ناوی نەیبووهرC NIEBUHR لە کۆپنهاگن لە ١٧٧٤ – ١٧٧٨ چاپ کراوە. لە بەرگی دووەم، لە لاپەرەکانی ٩٣ ـ ١٨١ و ٢٩٣ و ٣٣٤ و ٣٩٨ ـ ٤٢٢ باسی کورد دەکات. گەلەک نیگاری جوانی تیایە و دوو نەخشەشی لەگەڵدایە. ناوی کوردستانی لەسەر ناونیشانی بەرگی کتێبدا هێناوە.

– سەفەرنامەیەک بە ناونیشانی (Journey from India گەڕانەک لە هیندستانەوە) لەلایەن گەڕیدەی ئینگلیزJ JACKSON لە لەندەن لە ١٧٧٩ چاپ کراوە. ناوی کوردستانی لەسەر بەرگەکەدا هێناوە و باسی کوردو شارەکانی کوردستان دەکات بەتایبەتی دیاربەکر.

– ڤۆنلاێ: "گەشت بەرەو سووریا و میسر"، لە ١٧٨٧ لە پاریس چاپکراوە. لە بەرگی یەکەم: ل ٣٤٠ – ٣٤٤، ٣٨٣؛ لە بەرگی دووەم: ل ١٣، ٢٤، ١٢٨ – ١٣٠، ١٤١، ٣٨٣ – ٣٨٥ باسی کورد دەکات.

C. F. VOLNEY: Voyage en Syrie et en Egypte 1738-85, Paris: 1787. 2 Vol. –

ـ مۆریزیۆ گارزۆنی Morizio GARZONI، کە لە ١٧٨٧دا لە ڕۆما یەکەمین کتێبی بە ناونیشانی Grammatica e vocabulairio della lingua kurda لەبارەی زمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە و ناوی کورد و زمانی کوردیی بۆ یەکەم جار کردۆتە ناونیشانی کتێبێک.

BERGER, J. : Anatolien, Georgien, Armenien, Kurdistan, Irak und Al. Dschesira, 1799. بە ئەڵمانییە، گەلێ نیگاری جوانی تێدایە و نەخشەی گرنگی تێدایە لەبارەی جوگرافیای سیاسیی کوردستان. ناوی کوردستانی لەسەر ناونیشانی بەرگی کتێبدا هێناوە

# خەملانی بیری کوردناسی

# لە سەدەی نۆزدەهەم بەملاوە

گەڕاڵە ئەورووپاییەکان: (بازرگان، جوگرافیاناس، مێژوونووس، سیاسی، قونسوڵ، سەرۆک لەشکر، فەیلەسووف، نووسەر، نیگارکێش، جاسووس، قەشە، پیاوی حکوومەت، وەزیر، موژدەگارەکان، شاعیرەکان) کاتێ سەریان لە ڕۆژهەلات داوە، زۆربەیان حەزیان کردووە دەست پڕ لە ئاسەوار و واتا و جوانیی ڕۆژهەلات بگەڕێنەوە ولاتی خۆیان. ئەو سەفەرەی خۆیان لەشێوەی سەفەرنامەیەک یان لەشێوەی کتێبێکدا بنووسنەوە و لە ولاتی خۆیاندا چاپی بکەن، لەگەڵ هەرچی پاشکۆ و ئاسەوار و بابەتێکی دیکە (نەخشەی جوگرافی و کەرەستەی ئاسەوار و ئەتنۆگرافی و وێنە و شتی تر) پێشچاوی خەلکی نەتەوەکەی خۆیانی بدەن و بلاوی بکەنەوە.

کەواتە، هەموو سەفەرنامە و لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و زانستییانەی ئەورووپاییەکان لەبارەی ئەم بابەت و ماتێریاڵە جۆراوجۆرانەی ژیان و ولات و کولتوور و زمان و مێژووی نەتەوەکانی ڕۆژهەلات، پەیوەندیی بە زانستی ڕۆژهەلاتناسییەوە هەیە و دەچێتە خانەی بەرهەمەکانی ڕۆژهەلاتناسییەوە. ڕۆژئاوا، نەک تەنیا ڕۆشنبیری و فەلسەفەکانی، بەڵکو تەنانەت فۆلکلۆر و ئەدەبیاتەکەیشی گەلێک بابەتی ژیانی ڕۆژهەلاتی تێدا ڕەنگداوەتەوە.[٧٨]

بەرهەم و کتێبە ڕۆژهەلاتناسییەکان، بەشێوەیەکی گشتی تا سەدەی نۆزدەهەم بەشێکی دەگمەن و زۆر کەمیان تەرخان کراون بە کورد. هۆی ئەمەش، دیارە ئەوەیە کە کورد، بەپێچەوانەی عەرەب و تورک و فارس، هەرگیز دەوڵەتێک یان قەوارەیەکی سەربەخۆی بە ناوی خۆیەوە نەبووە: هەمیشە لە چوارچێوەی چەند ویلایەتێکی جۆراوجۆری سەر بە دەوڵەتێکی فارس و عەرەب و تورکدا ژێردەستە ژیاوە، یانیش بەسەر چەند میرنشینێکی سەر بەو دەوڵەتە غەیرە کوردانەدا دابەش کراوە و لەژێر ناوی هۆز و عەشیرەت و گرووپێکی ئەتنیکی ناوی هاتووە، نەک وەک نەتەوەیەکی خاوەن ولات. بۆیە، ئەگەر بمانەوێ بەدوای ساغکردنەوەی وێنەی ژیانی کورد و نیشتیمانەکەیدا بگەڕێین، پێویستە بچین ئەو لاپەڕە پرژوبلاوانە هەڵبدەینەوە کە لەبارەی بۆ نموونە " عیراقی عەجەم" یان " جەزیرە" نووسراون، یان لەبارەی " ئازەربایجانی ڕۆژئاوا" و " جیبال" و " ویلایەتی مووسڵ " کە سەر بە ئیمپراتۆریەت و دەوڵەتە بێگانەکانی ڕۆژهەلات بوونە و کوردیان تێدا ژیاوە. بەکورتی: تا سەدەی نۆزدەهەم زۆر بەدەگمەن کتێبێکی سەربەخۆ لەبارەی ولاتی کورد Courdistan و نەتەوەی کورد Courde لە بەرهەمی ڕۆژهەلاتناسەکاندا دەکەوێتە بەر چاو.[٧٩]

کەواتە، ئەگەر کتێبی شەرەفنامەی خۆمان و چەند کتێبێکی دیکە دەرباوێژین کە باسمان کردن، پێکهاتنی زانیارییەکانمان لەبارەی مێژووی نەتەوە و ولاتی کورد، واتە ماتێریاڵەکانی پێکهاتنی کوردناسی Kurdologie، تا سەدەی نۆزدەهەم، تەنیا لە ڕۆژهەلاتناسی و سەفەرنامەکانەوە سەرچاوە دەگرن: لەو کتێبانەی بەشێوەیەکی هەمە لایەنە باسی ئێمپراتۆریەتی عوسمانی یان ئیمپراتۆریەتی فارسی دەکەن.

مێژوونووسە کوردەکانیش لە سەدەی نۆزدەهەمدا ڕۆڵێکی بچووکیان هەبووە لە ناساندنی کورد بە دنیا و بەرەوپێشەوەبردنی بیری کوردۆلۆژیا. ئەو مێژوونووس و زانا کوردانەی لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا بەشدارییان لە پەرە پێسەندنی زانستی کوردناسیدا کردووە، ئەمانەن.

١ـ ئەوانەی بە زمانی فارسی و عوسمانلی – چ راستەوخۆ چ لابەلا – باسی کوردیان کردووە:

– عەبدولرەزاق بەگی کوڕی نەجەف قولی خانی دونبولی (لە ١٨٢٧ کۆچی دوایی کردووە) "تاریخی دەنابلە"ی نووسیوە، لە ساڵی ١٨٥٠دا سەرلەنوێ بە دەسخەتێکی دیکە نووسراوەتەوە.[٨٠]

– ڕۆستەم خانی کوڕی ئەحمەدخانی دونبولی "اشارة المذاهب و اشارة الادیان"ی نووسیوە کە هەردووکیان باسی ئایین و هۆزی دونبولی دەکەن.

– ماهـ شەرەفخانمی شاعیری ئەردەڵانی، یان مەستوورە (١٨٠٤ ـ ١٨٤٧) " تاریخی ئەردەڵان"ی نووسیوە. مەستوورە خانی ئەردەڵانی یەکەمین ژنە مێژوونووسی ڕۆژهەڵاتە، بە یەکەم ژن دەژمێردرێت لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا کە کتێبی لەبارەی مێژوو نووسیبێت.

– ئیدریسی بەتلیسی و میرزا ئیسماعیل ئیبن مەلا عەلی شارەزووری و خەسرۆ بەگی مصنف، بە زمانی فارسی.[٨١]

لەوانەیش کە بە تورکی عوسمانییان نووسیوە: عەلی ئەمیری کە چەند کتێبێکی جۆراوجۆری لەبارەی ویلایەتە کوردییەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی نووسیوە، لەوانە: تاریخ ولایات دولت عثمانیه.

٢– ئەوانەی ڕاستەوخۆ بە زمانی کوردی مێژووی کوردیان نووسیوەتەوە، بەشدارییەکی گچکۆکەیان کردووە (بە زمانی کوردی بۆ بەرەو پێشەوەبردنی بیری کوردناسی. مەلا مەحموودی بایەزیدی لە کۆتایی ساڵانی ١٨٥٠ بەملاوە یەکەم نووسەری کوردە کە مێژووی کوردی بە زمانی کوردی نووسیبێتەوە، ئەمەش لە گۆشەنیگایەکی شیکردنەوەی ئەتنۆگرافی و سۆسیۆلۆژییانەوە.[٨٢]

دوای ئەو، عەبدولرەحمان بەدرخان، لە ڕۆژنامەی کوردستان دا (قاهیرە، ١٨٩٨ ـ ١٩٠٢)، بەشدارییەکی سەرەتایی کرد بۆ نووسین لە بواری ناساندنی کورد و کوردستان. ڕۆژنامەی ناوبراو یەکەم ڕۆژنامەیە بە زمانی کوردی لێکۆڵینەوەی بۆ ناساندنی کورد بڵاوکردبێتەوە؛ بەتایبەتی ژمارەکانی: ٨ – ١٤ (لەبارەی مێژووی کوردەکانی جەزیرە. ژمارە: ١٥ (مێژووی ئەیبووبیەکان)، ژمارە: ٢١ (مێژووی کورد بەشێوەیەکی گشتی).

بەم شێوەیە، سەرچاوەکانی کوردناسی، تا سەدەی نۆزدەهەم، بریتین تەنیا لەو لاپەڕە دەگمەن و پرژ و بڵاوانەی کە فڵانە ڕۆژهەڵاتناس لە فڵانە کونجی کتێبێکیدا لەبارەی فڵان ویلایەتی سەر بە دەوڵەتی فارس و عوسمانی و عەرەب لەبارەی کورد Courde نووسیونی: هیچ کتێبێکی سەربەخۆی ڕۆژهەڵاتناسەکانمان لەبارەی کوردستان لە بەردەستدا نیە: مەگەر تەنیا کتێبێکی دەگمەنی وەک کتێبەکەی قەشەی ئیتاڵی، گارزۆنی نەبێ کە لە ١٧٨٧دا لە ڕۆما لەبارەی زمانی کوردی بڵاوی کردۆتەوە و کوردناسەکان پێی دەڵێن: «باوکی کوردناسی و دامەزرێنی زانستی کوردۆلۆژی».[٨٣]

لە سەدەی نۆزدەهەم بەملاوە، وردە وردە چەند ڕۆژهەڵاتناسێک، چەند سەفەرنامەیەکی خۆیان تەرخان دەکەن بە کوردستان و بەشێوەیەکی سەربەخۆ قسە لەبارەی نەژاد و جوگرافیا و زمان و کولتوور و مێژووی کورد دەکەن. ئیدی، بەشێوەیەکی گشتی، لە سەدەی نۆزدەهەم بەملاوەیە کە لێکۆڵینەوە لەبارەی کورد و وڵاتی کورد بایەخ و ڕەواجێک پەیدا دەکات.

لەبارەی کوردناسی لە ئەڵمانیا، د. جەمال نەبەز گەواهی ئەم ڕاستییە دەدات و دەڵێ: (لە سەدەی نۆزدەهەمدا ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی بە زمانی ئەڵمانی نووسراومان لەسەر کورد و کوردستان دەست دەکەوێ».[٨٤] لەبارەی

رووسیاشەوە، د، ئەورەحمانی حاجی مارف، دەڵێ: «بە هەمان شێوە لە رووسیای قەیسەری، سەرنجی زانستی سەبارەت بە کورد دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی نیوەی یەکەم و سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم». (٨٥) لە ئیتالیاش دیسان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدایە کە یەکەمین کتێب لە جیهاندا کە سەرتاپای تەرخان کرابێت بە کورد، بە زمانی ئیتاڵی بڵاودەبێتەوە. ئەمەش ئەو کتێبەیە کە Giuseppe CAMPANILE بە ناونیشانی (مێژووی مەڵبەندی کوردستان Storia della regione del Kurdistan) نووسیویەتی و لە ساڵی ١٨١٨دا لە ناپۆلی بڵاوکراوەتەوە. (٨٦) لە فەرەنساش بە هەمان شێوە. (٨٧)

بە رای میشێل شوڤالیێ – کە توێژەرێکی ئەم بوارەیە –: "پتەوبوون و چاکتربوونی رێگا و بان و تەنانەت رێگا دەریاییەکانیش، هەروەها دامەزراندنی چەند بونیادێکی ئیداریی تازە لەگەڵ دەسپێکردنی Tenzimat واتە مەشرووتەی تورکیای عوسمانلی لە ساڵی ١٨٣٩دا، بەس بوون بۆئەوەی ئەم بەرەو پێشەوەچوونە رووبدات. (٨٨)

زیاتربوونی ئەم بایەخدانەی رۆژئاواییەکان بە کوردستان لە سەدەی نۆزدەهەم بەملاوە، گەلێک هۆی دیکەی هەیە؛ لەوانە:

١ـ داگیرکردنی میسر لەلایەن ناپلیۆن پۆنابارت (١٧٩٨ ـ ١٨٠١)، پاشان داگیرکردنی جەزائیر لە سەردەمی لویس فیلیپ دا (١٨٣٠ ـ ١٨٤٨). ئەم دوو رووداوە، پێویستیی دەوڵەتی فەرەنسای بە وەرگێڕ و زمانزانان و رۆژهەڵاتناسان زیاتر کرد. هەروەها هانی دەوڵەتی فەرەنسای دا کە بیر لە داگیرکردنی وڵاتانی وەک دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانیش بکاتەوە.

٢ـ پەرەسەندنی بەرژەوەندییە بازرگانی و ئابوورییەکان لە نێوان ئێمپراتۆریەتەکانی ئێرانی و عوسمانی لەگەڵ رووسیا و وڵاتانی دیکەی رۆژئاوادا؛ بۆ نموونە بەهێزبوونی پەیوەندیی سیاسی و بازرگانیی نێوان دەولەتی عوسمانی و دەوڵەتی پرووسیای ئەڵمان، وای کردبوو گەلێک ئەفسەری ئەڵمان لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە سوپای عوسمانیدا خزمەت بکەن. بێن کوردستان ببینن و راستەوخۆ تێکەڵ بە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی کورد بن. (٨٩)

٣ـ پەرەسەندنی شەپۆلی بڵاوکردنەوەی دینی مەسیح لە رۆژهەڵاتدا و زۆرتربوونی ژمارەی وەفدی موژدەگارەکان لە کوردستاندا و زیاتر بایەخدانیان بە وڵاتی کورد. (٩٠)

٤ـ گەشەسەندنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، کە ئەمە سەرنجی دەوڵەتە زلهێزەکانی ناوچەکە و وڵاتانی رۆژئاوای راکێشا بۆ کۆڵینەوە لە کوردستان و کۆنترۆڵکردنی. زیمینیی XIMINIEZ لەم بارەوە دەڵێ کە دەوڵەتە ئەورووپاییەکان سەرنجیان بۆ کورد نەچوو تا ئەو کاتەی سوڵتان مەحموودی دووەم لە ساڵی ١٨٢٨دا چاکسازییەکانی بەناوی (تەنزیمات) لەپێناو دوورخستنەوەی کورد لە بیری سەربەخۆیی، راگەیاند. (٩١)

بەڕاستیش، سەدەی نۆزدەهەم ململانێی نێوان دەوڵەتە گەورەکانی رۆژئاوای بەخۆوە بینی لەپێناو دەسەڵاتداگرتن بەسەر کوردستاندا. بەرهەمی ئەو ململانێیەش ئەوە بوو کە لە چارەگی یەکەمی سەدەی نۆزدەوە گەڕیدەکان زیاتر روویان لە کوردستان کرد. زۆر دەوڵەتی وەک بریتانیا و فەرەنسا و رووسیا و ئەڵمانیا و ولاتە یەکگرتووەکان بەشدارییان لە ناردەی خۆیان کرد. مێژوونووسی سۆڤیەتی، د. خالفین لە کتێبەکەی خۆیدا (ململانێ لەسەر کوردستان) سروشتی ئەو ململانێیە لەسەر کوردستان بەباشی لێکداوەتەوە. (٩٢)

٥ـ پەرەسەندنی پەیوەندییە رۆشنبیری و کولتوورییەکانی نێوان رۆژئاوا و رۆژهەڵات. بۆ نموونە: لەم کاتەدایە کە چەندین نووسەری گەورەی وەک گۆستاف فلۆبێرت و لامارتین و پیر لۆتی (١٨٥٠ – ١٩٢٣) و ژیرار دو

نێرڤال (١٨٠٨ ـ ١٨٥٥)، لەژێر کاریگەرێتی تەرجەمە فەرەنسییەکەی کتێبی (الف لیلة و لیلة)دا لەلایەن ئەنتوان گالاند A. GALLAND، دێنە ڕۆژهەڵات و لە سەفەرنامەکانیاندا واقیعییانە باسی ڕۆژهەڵات دەکەن.

لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا دەیان کوردناس لە ئیتالیا و رووسیا و ئینگلستان و ئەڵمانیا و فەرەنسا، تەکانێک بەم زانستە دەدەن و بەرەو پێشەوەی دەبەن.[٩٣]

لە ئیتالیا ژۆزێپی کامپانێل و ئەلیساندرۆ دی بیانکی دەورێکی بەرچاو دەبینن.[٩٤] لە هەمووشیان گرنگتر کتێبەکەی کامدانێله، کە بە زمانی ئیتالی، باسی مێژووی کوردستان و ئارکیۆلۆژیای کوردستان دەکات و لە ١٨١٨دا لە ناپۆلی چاپکراوە.[٩٥] لە رووسیا، کوردناسی هەرە گەورەی رووس، پیۆتەر لێرخ Lerch سێ کتێبی گرنگ لەبارەی کورد دەنووسێت. هەروەها ولیەم دیتێل Detil و کوردناسی ئەرمەن خ. ئابۆڤیان چەندین زانیاریی گرنگ و کەرەستەی تازە دەخەنە مەیدانی کوردناسییەوە. ئەمە جگە لە بەرهەمە ناودارەکانی ف. ڤ. ڤیلیامینۆف زێرۆنۆف و س. ئا. یەگیزارۆف. لە ئەڵمانیاش، بە زمانی ئەڵمانی، دەوری فردریک میوولەر F MUELLER و ڤۆن کلاپرۆت Von Klqproth ی نەمساوی و ڤۆن هامەر Von Hammer گەلێک گرنگ و لەبەرچاوە. لە سەرووی هەمووشیانەوە ئەلبێرت سۆسین A SOCIN و مارتن هارتمان M HARTMAN و هێلموت ڤۆن مۆلتکە -Hell muth Von MOLTKE.[٩٦] لە ئینگلستانیش دەوری راولنسۆن Rawilinson و فریزەر Fraiser و ماکدۆنالد -Mack donald لە هەموویان دیارترە و زۆربەشیان کراونەتە عەرەبی. لە سەرووی هەمووشیانەوە، جێمس مۆریی -J MORI ER کە سەفەرنامەیەکی بە ناونیشانی (Journey Through Persia گەڕانەک بە وڵاتی فارسدا) لە لەندەن لە ١٨١٢ بڵاوکردۆتەوە و بەدرێژی باسی کورد دەکات. لە ساڵی ١٨١٣دا کرایە فەرەنسی و لە پاریس چاپ کرا. ئنجا سەفەرنامە ناودارەکەی مستەر ریچ لە ساڵی ١٨٢٠دا:

RICH Claude James: Narrative of a Residence in Kurdistan, London: 1836-1837, 2 Vol., 808 Ps.

ئەوەی پەیوەندیی بە فەرەنساشەوە هەیە، هەرە دیارەکانیان بریتین لە لو کۆنت دو شۆلێت Le Cte De CHOLET و ئەلکزاندەر ژابا A JABA. بەتایبەتیش هنری بیندەر H BINDER.

- Henry BINDER: Au Kurdistan, en Mesopotamie et en Perse; MSMP, Maison Quantin, Paris: 1887:

لەفەرەنسا، یەکەم کتێبی ڕۆژهەڵاتناسی لە سەدەی نۆزدەهەمدا بڵاوبووبێتەوە و باسی کوردی کردبێت بریتییە لە سەفەرنامەکەی ئۆلیڤیی G. A. OLIVIER، کە بە زمانی فەرەنسی باسی کوردستانی تورکیا و ئێرانی کۆتایی سەدەی ١٨م دەکات و لە ساڵی ١٨٠١دا لە پاریس لە چوار بەرگدا بە ناونیشانی سەفەرێک بۆ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی Voyage dans l Empire Ottoman بڵاوکراوەتەوە؛ ٥٢٢ لاپەڕەیە و چەندین نەخشەی لەبارەی مەڵبەندەکانی کوردستان تێدایە.

دوای ئەویش، گەڕاڵێکی فەرەنسیی دیکە بە ناوی A. De GARDANE لە ساڵی ١٨٠٧ ـ ١٨٠٨دا سەفەرەکەی کردووە. سەفەرنامەکەشی لە ساڵی ١٨٠٩ لە دەزگای Normant لە پاریس بە ناونیشانی Journal d un voyage dans la Turquie d Asie et la Perse بڵاوکردۆتەوە و باس لە ژیانی کوردستانی بندهەستی هەر دوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسی دەکات لە کۆتایی سەدەی ١٨دا.

پێر ـ ئامێدی ژووبێرت Pierre-Amedee JAUBERT (١٧٧٩ـ ١٨٤٧)، دیپلۆماتێکی ناوداری فەرەنسییە. کوڕە پارێزەرێکی ناودار، قوتابییەکی زرنگی قوتابخانەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە پاریس Ecole des Langues Orientales، موتەرجیمی ناپلیۆن بوو لە کاتی داگیرکردنی میسر. لە ساڵی ١٨٠٤دا، ناپلیۆن بە وەفدێک دەینێرێت

بۆ لای شای ئێران. له ڕێگا میری مەڵبەندی بایەزید له کوردستان ـ که ناوی میر محەمەد بوو و ئەو کاتە میرنشینێکی سەربەخۆی کوردی هەبوو – ڕێگای لێ دەگرێ، خۆی و هاوڕێکانی دەخاتە بەندیخانەی قەڵایەکی مەحکەمی خۆیەوە. هاوڕێیەتییەکی زۆر پتەو لەنێوان میر محەمەد و ژووبێرت دروست دەبێ لەناو بەندیخانەی ئەو قەڵایەدا. پاشان ژووبێرت دەگەڕێتەوە پاریس و لەوێ لەلایەن حکومەتی فەرەنسییەوە هەموو ساڵێک بەخشیشێکی ساڵانەی بۆ ڕەوانە دەکات تا ئەو کاتەی دەمرێ. ئەم چیرۆکی هاوڕێیەتییەی نێوان میر محەمەد و ژووبێرت لەو مەڵبەندەدا دەبێتە ئەفسانەیەک و بەناو خەڵکدا بڵاودەبێتەوە. مەلا مەحموودی بایەزیدی، ئەم " ئەفسانەیەی" کردۆتە چیرۆکێک له کتێبی چل چیرۆکەکەی خۆیدا بۆ ئەلکزەندەر ژابای نووسیوەتەوە.(٩٧)

پیێر ژووبێرت، له سەفەرنامەکەی خۆیدا بە فراوانی باسی پەیوەندیی نێوان کورد و ئەرمەن، هەروەها لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی فارس و عوسمانی دەکا، هەروەها ژیانی کورد و ئەو ئەزموونە زەحمەتەی کە لای کوردەکان چەشتی. بەشێکی کەمی ئەم سەفەرنامەیە لەلایەن د. هەڵکەوت حەکیمەوە کراوەتە عەرەبی و له ژمارە (١)ی گۆڤاری الثقافة الكردية له لەندەن، له ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨٨ بڵاوکراوەتەوە.(٩٨)

ئنجا له ماوەی ساڵانی ١٨٠٧ تا ١٨٠٩، دوپری A. DUPRE سەفەرێکی بەرەو کوردستان کردووە؛ یاداشتنامەکانی ئەم سەفەرەی خۆی له کتێبێکدا بە ناونیشانی Voyage en Perse له پاریس له ساڵی ١٨١٩ بڵاوکردۆتەوە. له بەرگی یەکەمدا له لاپەڕە ٨٩ – ٩٨ باسی تۆپۆگرافیا و مێژووی کوردستان Curdistan دەکات، له لاپەڕە ١٠٣ ـ ١٠٩ باسی یەزیدییەکان دەکات. له بەرگی دووەمدا له لاپەڕە ٢٧٥ـ ٢٧٦، ٤٦٤ ـ ٤٦٥ باسی کورد Curde دەکات. دوو نەخشەیشی لەبارەی کوردستان تێدایە.

ژ. ڕۆسۆ J. ROUSSEAU کە دیپلۆماسییەکی فەرەنسی بووە و له کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا نوێنەری فەرەنسا بووە له شاری بەغدا، له ساڵێ ١٨٠٩دا له پاریس کتێبێکی بە ناونیشانی وەسفێکی پاشالیکی بەغدا De-scription du Pachalik de Baghdad بڵاوکردۆتەوە. ناوبراو لەم کتێبەدا باسی شاری هەولێر و هەندێ له ڕووداوەکانی کوردستانی ئەو کاتە دەکات.

گاسپارد درووڤیل G. Drouville له ساڵی ١٨١٢ – ١٨١٣دا گەشتێک بە کوردستانی ئێراندا دەکات و گەشتنامەکەی خۆی له ساڵی ١٨١٥دا بە ناونیشانی سەفەرێک بەرەو ئێران Voyage en Perse له پاریس بە زمانی فەرەنسی بڵاودەکاتەوە. چاپی دووەمی له ١٨٢٥ بڵاودەکاتەوە و له بەرگی دووەم، له بەشی ٣٨، له لاپەڕە ١٧١ تا ١٩١ باسی کورد دەکات.

له ساڵی ١٨٥٣شدا ئەحمەدخان – چوارەمین پاشای میرنشینی بابان – سەرێک له پاریس دەدات و دەبێتە میوانی کوردناسی ناودار، خۆدزکۆ Chodzko. ماوەیەکی زۆر لەوێ دەمێنێتەوە و بەشدارییەکی بچووک دەکا له گەشەپێسەندنی کوردناسی له فەرەنسای ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا. ئەحمەدخان و خۆدزکۆ بابەتێکی ٦٠ لاپەڕەیی پێکەوە دەنووسن کە دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ کۆڵینەوە له ئەدەبیات و زمانی کوردی.

خۆدزکۆ له پێشەکییەکەدا نووسیویەتی:" ئەگەر ڕێککەوت ئەحمەدخانی بۆم نەهێنایەتە پاریس، لێکۆڵینەوەکەم ئەم بەرهەمەی ئێستای لێ نەدەهاتە کایەوە"، هەروەها دەڵێ:" دووای ئەوەی له مانگەکانی ١٨٥٤دا کارەکانمان تەواوکرد، ئەحمەدخان له ئەستەمبۆڵەوە نامەی بۆ هات و بانگهێشتن کرا کە پاریس جی بهێڵی و بگەڕێتەوە بۆ ئەستەمبۆڵ".(٩٩)

بابەتە شەست لاپەڕەییەکەی خۆدزکۆ بریتییە له:

ـ پێشەکی
– بەشی یەکەم: وشە کوردییەکان
١– ناو، کە دوو بەشە. ئەلف: ناوی تاک. بێ: ناوی کۆ.
٢– چەند تێبینییەک لەبارەی گەردانکردنی ناو و جێناوەکان: ئامراز، ئاوەڵناو، ژمارەکان، جێناو، کردار، ئاوەڵکار.

بەشی دووەم: رستەسازی
ئەم بەشە، وەک پاشبەندێک وایە بریتییە لە دە تێکست بە زمانی کوردی، لەگەڵ تەرجەمە فەرەنسییەکەیان و شیکردنەوەی یەکە یەکەیان. ئەم دە تێکستە بچکۆڵە کوردییە بە قەڵەم و دەسخەتی ئەحمەد خانی چوارەمین پاشای میرنشینی بابان نووسراونەتەوە و بە یەکێک لە یەکەمین پەخشانە کوردییەکان دەژمێردرێن.

بەشی سێیەم: چەند تێبینییەک لەبارەی ئەدەبی کوردی، لەگەڵ دوو پارچە شیعری کوردیی (چوارینی) بابەتاهیری هەمەدانی. هەروەها باسی نالی دەکات دەڵێ "ئێستا ١٨٥٤ لە دیمەشق دەژیت". ئنجا دەڵێ: "ئەحمەدی خانی کۆمەڵە شیعرێکی چاپ نەکراوی هەیە بە ناوی مەجمووعە". دەڵێ: " کوردەکان یان بە فارسی یان بە تورکی یانیش بە عارەبی دەنووسن. ئەگەر هەندێ جار بە ناچاریش بە کوردی بنووسن، ئەوا بە یارمەتیی رێنووسی فارسی بووە ".
ئەم بابەتە ناوبراوە، سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ رێنووس و بنجی زمانی کوردی و دیالێکتەکانی، سەرچاوەیەکی گرنکی ئەدەب و مێژووی کوردە.
لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمیشدا لە ساڵی١٨٩١ ناودارێکی فەرەنسی – ڤیتال کینێت – کتێبێک لەبارەی جوگرافیای ئیداریی تورکیای عوسمانی بە ناونیشانی تورکیای ئاسیا بڵاودەکاتەوە. لە بەرگی یازدەهەم و دوازدەهەمدا (کە زیاتر لە ٢٥٠ لاپەڕەن) باسی سەرجەم شار و گوند و ویلایەتەکانی کوردستانی کردووە بە نەخشەی جوگرافییەوە. ئەمە ناونیشانە فەرەنسییەکەیەتی:

Vital CUINET: Turquie d Asie; Geographie Administrative; Statistique; Descriptive et Raisonee; T: 11 - 12; Ernest Leroux Editeur; Paris: 1891:

لێرەدا، بۆ ئاشناکردنی خوێنەران بە کاری سەختی کوردناسی و بایەخی مەزنی ئەم زانستە رۆژئاواییە، چالاکی و بەرهەمەکانی یەکێک لەو کوردناسە رۆژئاواییانەی لای ئێمە هێندە ناسراو نین، بە نموونە دەخەینە بەرچاو:

# ئەلکزەندەر ژابا

Alexandre JABA

(١٨٠٣ - ١٨٩٤)

لە سایەی کوردناسی رووس، بە بنەچە پۆڵۆنی، بە زمان فەرەنسی، ئەلکزەندەر ژابا Alexandre JABA، ئەمڕۆ ٤٤ دەسنووسی پەخشان و چیرۆک و زمانەوانی و مێژووی کوردەواری، بە زمانی کوردی - کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا نووسراون - لە بەردەستی ئێمەدان. ئەم دەسنووسانە بەڕاستی گەنجینەی ئەدەبیاتی کوردیی سەدەی نۆزدەهەمن. راستییەکەشێ، بەرهەمەکانی ژابا - کە بەشی هەرە زۆریان بە هاوکاریی مەلا مەحموودی بایەزیدی(١٧٩٩ - ١٨٦٧) ئەنجام دراون - سێ چارەگی ئەدەبیاتی پەخشانی کوردیی سەدەی نۆزدەهەم پێک دەهێنن.

کوردناسی ناودار م. ب. رۆدنکۆ، لە پێشەکیی (عادات و رسووماتنامەی ئەکرادیە)دا، ل ٤، دەڵێ: " ئەگەر هاریکاری بایەزیدی و ئەلکزەندەر ژابا نەبوایە، تا ئێستاش بەشێکی بەنرخ لە گەنجینەی ئەدەبی کوردیی سەدە ناوەنجییەکان نەدەزانرا".(١٠٠) هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا، زیاتر رۆڵی ژابا روون دەکاتەوە و دەڵێ: " ژابا لە ناوەڕاستی سەدەی رابردوودا، سەرەتای لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی سەدەکانی ناوەڕاستی دامەزراند".(١٠١)

رۆژهەڵاتناسی رووس، چیخاچیف، لە رێگای لێکۆڵینەوە و دەسنووسەکانی ژاباوە زانیبووی کە کورد خاوەنی ئەو ئەدەبە رەسەنەیە؛ لەبارەی ئەلکزەندەر ژاباوە دەڵێ: " لێکۆڵینەوەکانی ئەم رۆژهەڵاتناسە بەتوانایە لەبەرئەوە هێندە جێگای سەرنجن، چونکە ئەم تاکە کەسێکە کە لەم رۆژەدا ئاوا سەرکەوتووانە خەریکی زمانی میللەتێکە، هێندە کەم ناسراوە و هێندەش دێرینە".(١٠٢)

ئەلکزەندەر Alexandre (یان هەندێ جار ناوی لە خۆی ناوە ئۆگەست Auguste) ژابا JABA، لە ١٥ی ئابی١٨٠٣دا لە پۆڵۆنیا لەدایک بووە. باوکی ئاغا و گونددار بووە. لە ١٨٢٤ دەبێتە وەرگێڕ لە وەزارەت. پاشان زەمالەیەکی خوێندن وەردەگرێت و لە ١٨٢٨ خوێندنی باڵا تەواودەکات و لە ساڵی ١٨٣٠ دەبێتە وەرگێڕی زمانی تورکی لە بەشی زمانە رۆژهەڵاتییەکان لە یافا. لە ساڵی ١٨٣٢ دێتە ئەستەمبۆڵ و لە ١٨٣٥ دەچێتە سمێرنا. لە ساڵی ١٨٤٣ بە بڕیاری ئەنجوومەنی سەرۆکایەتیی ئیمپراتۆر دەبێتە سکرتێری دیوانی سەرۆکایەتی. لە ١٨٤٨ دەبێتە کونسوڵی رووسیا لە ئەرزەڕۆم و لەوێ خۆی فێری کوردی دەکا. لە ١٨٥٣ کۆنسوڵ دادەخرێ. لە ١٨٥٦ دەکرێتەوە و ئەویش دەست بە کارکردن دەکاتەوە. ئەلکزەندەر ژابا پۆڵۆنی و رووسی و تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسی و کەمێک عەرەبی و کوردی و فارسیشی زانیوە.(١٠٣) ژابا لەمەڕ شارەزایی خۆی لەبارەی زمانی کوردی، لە نامەیەکیدا کە بۆ دۆرنی رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانیی نووسیوە، دەڵێ: من بە رادەیەکی ئەوتۆ زمانی کوردیم خوێندووە و فێری بووم کە بتوانم خۆم خەریکی کارکردن و وەرگێڕان بم.(١٠٤)

ئەلکزەندەر ژابا لە ماوەی ساڵانی ١٨٣٦ ـ ١٨٦٩دا، کاتێ قونسوڵی رووسی بووە لە وڵاتی عوسمانیدا - لە شاری ئەرزەڕۆم و ئیزمیر - لەلایەن ئەکادیمیای باڵای زانستیی سانت پێترسبۆرگەوە لە رووسیا لە رێگەی رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانییەوە، بێرنهاردت دۆرن (DORN ١٨٠٥ - ١٨٨١) داخوازیی لێدەکرێ کە کۆمەڵێک دەسنووسی کوردی کۆبکاتەوە و چەند لێکۆڵینەوەیەک لەسەر کولتوور و زمان و ئەدەبیاتی کوردی بنووسێ. بۆ ئەم مەبەستە، ئەلکزەندەر ژابا لە سەرەتای ساڵی ١٨٥٦ بەملاوە کۆمەڵێک مەلا و فەقێ و میرزا (خوێندەوارانی ئەو

سەردەمە) لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە. مەلا مەحموودی بایەزیدی (١٧٩٩ – ١٨٦٧) یەکێک بووە لەو مەلایانەی کە بوونەتە هاوڕێی هەرە نزیکی ئەو. لەو ماوەیەدا مەلا مەحموودی بایەزیدی نیشتەجێی شاری ئەرزەڕۆم بووە. ئیتر بایەزیدی لە ساڵی ١٨٥٦ بەملاوە بۆتە سکرتێر و خواجە و هاوکار و راوێژکارێکی تایبەتیی ژابا بۆ کاروباری رۆشنبیری و خوێندەواریی کوردی.(١٠٥)

ئەلکزەندەر ژابا لەگەڵ مەلا مەحموودی بایەزیدی لە بواری مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا جمکانەی یەکترن؛ بۆیە ـ بۆ ئەوەی لە ژابا تێبگەین، پێویستە دێڕێک لەبارەی مەلا مەحموودی بایەزیدییەوە بزانین.


کوردێکی یەزیدی

مەلا مەحموودی بایەزیدی، قورئانناس و مەلایەکی شارەزا و نووسەرێکی بەتوانا بووە. لە رەوانبێژی و زمان و ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسی و تورکیدا شارەزاییەکی بێ وێنەی هەبووە. لە نازناوە ئەدەبییەکانی: مەحموود ئەفەندی، فەقیر مەحموود ئەفەندی، خواجە مەحموود ئەفەندی.

شارەزایی بایەزیدی لە زمانە رۆژهەڵاتییەکاندا هێندە فراوان بووە کە لەناو نووسەرەکانی شاری ئەرزەڕۆمدا تەنیا روو لە بایەزیدی دەکرا بۆ نووسین بە فارسی یان بۆ وەرگێڕان لە فارسییەوە بۆ تورکی.(١٠٦)

م.م. بایەزیدی (١٧٩٩ – ١٨٦٠) لە هەموو بەرهەم و نووسراوەکانی ژابادا رۆڵی هەبووە؛ کەچی ناوی خۆی لەسەر ئەم هاوکارییانە و تەنانەت لەسەر بەرهەمەکانی خۆیشی تۆمار نەدەکرد و هەر بە ناوی ژاباوە دەڕۆیشت. ئەمە وای کردووە کە زۆربەی ئەم بەرهەمانە ببێتە تەنیا موڵکی ئەلکزەندەر ژابا. ژابا خۆیشی لە پێشەکییە فەرەنسییەکەی عادات و رسووماتنامەکەیدا دەڵێ کە بایەزیدی نەیویستووە ناوی خۆی بەسەر نووسین و هاوکارییەکانەوە بێت. هۆی ئەوەیش کە بایەزیدی ناوی خۆی لەسەر بەرهەمەکانی خۆی نەنووسیوە، بە رای پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار، رەنگە لە ترسی ئەوە بووبێ

کە بۆ مەلایەکی وەکو ئەو کارێکی بەجێ نەبێ لە یەکێکی وەکو ژابای ناموسڵمان نزیک ببێتەوە و هەرەوەزیی لەگەڵدا بکا.(١٠٧) د. ئەورەحمانی حاجی مارفیش لەم بارەیەوە هەمان رای هەیە. ژابا ـ خۆیشی هۆی ئەم دیاردەیەی روون کردۆتەوە و هەمان شت دەڵێ:(١٠٨)

رۆدنکۆ لە پێشەکییە رووسییەکەی عادات و رسووماتنامەی ئەکرادیەدا دەڵێ: ''ژابا واتا کوردییەکانی بەڕاستی و بەتەواوەتی وەرنەگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسیٚ''؛ ''لەوە دەچێ بۆیان گێڕابێتەوە و ژابا وەری گێڕابێ''.(١٠٩) ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێ کە مەلا مەحموود تەنانەت لەتەرجەمەکردن بۆ سەر فەرەنسیش یارمەتیی ژابای داوە. – بێگومان لەو ئاستانەی کە پەیوەندییان بە زمانی کوردییەوە هەبووبێ.

لەم بارەیەوە پێویستە ئەوە روون بکەینەوە کە دەسنووس و کتێبەکانی ژابا، هەمیشە بە دوو زمان (کوردی و فەرەنسی) بوونە. بەشە کوردییەکان، بێگومان، بە پێنووسی بایەزیدی نووسراون. بەشە فەرەنسییەکانیش ئاشکرایە دەبێ کە ژابا بە هاوکاری بایەزیدی تەرجەمەی سەر زمانی فەرەنسیی کردبن.

مەلا مەحموودی بایەزیدی، کەواتە. دانەر و وەرگێڕی گەلێک لە دەسنووسەکانی ژابایە. لە نامەخانەی گشتیی شاری سانت پەترسبۆرگ لە رووسیا، ٥٤ دەسنووس هەن. لەمانە ٤٤ی بە زمانی کوردییە، ٤ ی بە فارسییە، ٣ ی بە تورکییە. هەموو ئەم دەسنووسانە لەلایەن ئەلێکسەندەر ژاباوە – کە بەشێکی زۆریان بە یارمەتی و هاوکاریی مەلا مەحموودەوە نووسراون ـ کۆکراونەتەوە.(١١٠)

شایانی باسە، جگە لە بایەزیدی، مەلا و زانای کوردی دیکەش یارمەتیی ژابایان داوە بۆ نووسینەوەی بابەتە کوردییەکان، لەوانە: شێخ نزار (گۆرانی و هەندێ دەسنووسی تری نووسیوە)؛ مەلا مستەفا (شێخی سەنعان و زەمبیل فرۆشی نووسیوە)؛ مەلا مووسای هەکاری (لە زمانی فارسییەوە کاری بۆ کردووە)؛ موحەمەد حاریب ئیبن سلێمان (مەم و زینی نووسیوەتەوە)؛ فەیرووز ئەفەندی، موحەمەد موکسی، تەهای حاجی عەبدولعەزیز، حەسەنی حەکیم باشی، تاهیری ئیبن عەباس ئەفەندی و فەیزوڵلا و کەسان تریش.(١١١)

### رۆڵی ئەلکزەندەر ژابا

ئەلکزەندەر ژابا گەلێک رۆڵی گرنگی لە بواری ئەدەبیاتی کوردی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا هەبووە:

١– ئارشیفیست و کۆکەرەوەی دەسنووسی کوردی، بەتایبەتی دەسنووسەکانی بایەزیدی.

٢– وەرگێڕێکی بەتوانای پەخشانی کوردیی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، – لە کوردییەوە بۆ فەرەنسی.

٣– قاموسەوانێکی زرنگ و وبەهرەداری کوردی – فەرەنسی.

٤ـ هاندەرێکی مەزنی بایەزیدی و نووسەرێکی دڵسۆز بۆ نەتەوەی کورد و کولتوورەکەی.

### بەشێک لەکار و دەسنووسە کوردییەکانی ژابا

### کە بە هاوکاریی مەلا مەحموودی بایەزیدی کراون

بەشی هەرە زۆری دەسنووسە کوردییەکانی ژابا بە هاوکاری و یارمەتیدانی مەلا مەحموودی بایەزیدییەوە نووسراون. دەتوانین بەکورتی بڵێین: لە کارەکانی ژابادا ئەوەی بە کوردییە نووسراوی بایەزیدییە و ئەوەی بە فەرەنسییە نووسراوی ژابایە. بەرهەمە گرنگەکانی ژابا – بە هاوکاریی بایەزیدی – ئەمانەن:

١– چیرۆکی مەم و زین Legende Kurde (هاوینی ١٨٥٦)، نووسراوی بایەزیدییە؛ بە دیالێکتی کرمانجی.

بایەزیدی بە دەسخەتی خۆی نووسیویەتی، پاشان لە لایەن ژاباوە کراوەتە ئەلفابێی لاتینی و تەرجەمەی فەرەنسی کراوە. لەگەڵ پێشەکییەک بە فەرەنسی بە پێنووسی ژابا. لە کتێبخانەی لانگزۆ INALCO لە پاریس. هەروەها نوسخەیەکی تریشی لە نامەخانەیەکی پێترسبۆرگ لە رووسیا، پارێزراوە.

٢- چیرۆکی لەیلا و مەجنوون Legende Kurde (١٨٥٩)، بەرهەمی بایەزیدییە. بە دیالێکتی کرمانجی بایەزیدی بە دەسخەتی خۆی نووسیویەتی، پاشان لە لایەن ژاباوە خراوەتە سەر ئەلفابێی لاتینی و تەرجەمەی فەرەنسی کراوە. لەگەڵ پێشەکییەک بە فەرەنسی بە پێنووسی ژابا. لە کتێبخانەی لانگزۆ INALCO لە پاریس، هەروەها نوسخەیەکی تریشی لە نامەخانەیەکی پێترسبۆرگ لە رووسیا پارێزراوە.

من لە ساڵی ١٩٩٢دا لە پاریس نوسخەیەکم لەم دەسنووسە پێشکەشی مامۆستا ئۆردیخانی جەلیل کرد بۆئەوەی ئەویش لای خۆی کاری لەسەر بکا.

٣- ریسالەتی حەکایەتان Recueil de Notices et Recits kourdes، چل چیرۆکی کوردییە، بایەزیدی نووسیونی و ژابا تەرجەمەی فەرەنسیی کردوون، لە ١٨٦٠ لە پیترسبۆرگ بە زمانی کوردی و فەرەنسی لەگەڵ پێشەکییەک بە پێنووسی ژابا بڵاوکراونەتەوە. بەشێکی کەمیشی، لە پێشەوەدا، بریتیە لە دەسنووسی کتێبە رێزمانییەکەی عەلی تەرەماخی.

لەبارەی ئەم کتێبەوە، ژابا لە مانگی مارتی ١٨٥٩ بۆ رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی، دۆرن، دەنووسێ: توانیم کۆمەڵێک چیرۆک لە زاری کوردی ناوچە جیاجیاکانی مووش و بەتلیس و وان و بایەزید و قارس و ئەرزەرۆم و ئەرزەنجان کۆبکەمەوە.[١١٢]

٤- عادات و رسوماتنامەی طەوایفی ئەکرادیە و ئوسوولی نیزاماتی کورمانجی، بەرهەمی بایەزیدییە؛ بە دیالێکتی کرمانجی، لە ١٨٥٨ـ ١٨٥٩دا بە خەتی بایەزیدی خۆی نووسراوە. لە ساڵی ١٨٦٨یشدا بە خەتی شەهنەزەر ناوێک نووسراوەتەوە. ژابا تەرجەمەی فەرەنسیی کردووە. رۆدنکۆ لە ١٩٦٣دا لە مۆسکۆ، وێڕای پێشەکییەک بە رووسی چاپی کردووە. تەرجەمەی زمانی رووسیش کراوە لەلایەن رۆدنکۆوە. ئەلکزەندەر ژابا دەسنووسی ئەم کتێبەی لە ئارشیفخانەی سالیکۆف شیدرین لە لینینگراد لە رووسیا پاراستووە؛ ئەمە ژمارەکەیەتی: Kurd 7. ئەم کتێبە لەلایەن د. احمد عثمان ابوبکرەوە تەرجەمەی عەرەبی کراوە.[١١٣]

٥- تەرجەمەی کورتەی شەرەفنامەی شەرەفخانی بەتلیسی بۆ کرمانجی، بە ناونیشانی تەواریخی قەدیمی کوردستان، لە ١٨٥٨دا لەلایەن بایەزیدییەوە کراوە. پاشان ژابا تەرجەمەی فەرەنسیی کردووە؛ ئنجا رۆدنکۆ لە مۆسکۆ لە ساڵی ١٩٨٦دا بڵاوی کردۆتەوە. ژمارەی دەسنووسەکە لە نامەخانەی سالتیکۆف شدرین، لە لینینگراد: Kurd 37.

٦- دانان و بڵاوکردنەوەی قاموسێکی کوردی ـ فەرەنسی بە ناونیشانی Dictionnaire kurde- Francais کە لە ساڵی ١٨٧٩دا لە سانت پیتربۆرگ بڵاوکراوەتەوە. بایەزیدی یارمەتیی داوە.

٧- ساغکردنەوەی کتێبە رێزمانییەکەی عەلی تەرەماخی (رێزمانی عەرەبی بە زمانی کوردی)، هەروەها پێشەکی بۆ نووسیوە بە زمانی فەرەنسی. بایەزیدی روونووسی کردووە، شەرحێکی کردووە و یارمەتیی ژابای داوە لە ساغکردنەوەیدا.

ناونیشانی بنجیی دەسنووسەکە ئەمەیە: صرف و بعضی اصول لازمەبی تعلیمە بە زمانی کورمانجیە.

ئەم کتێبەی تەرەماخی، دیارە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا (١٦٠٠) نووسراوە؛ چونکە مینۆرسکی لە

ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا - کە بە زمانی ئینگلیزی لە ١٩٢٧دا لە لەندەن چاپ کراوە - لە بەرگی دووەم، لە لاپەڕە ١٣١دا، دەڵێ: " عەلی تەرەماخی لە ١٥٩١دا لەدایک بووە ". پێویستیشە بڵێین: عەلی تەرەماخی بە هەڵە ناوی گۆڕاوە و لە لایەن هەندێ ناشارەزایانی ئەدەبی کوردییەوە کراوە بە عەلی تەرمووکی.(١١٤)

ژابا لە دوو نامەدا، کە لە ١٨٥٨/٦/١٧ و ١٨٥٩/٤/٢دا ناردوویەتی بۆ ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی لێرنهاردت دۆرن باسی ئەوە دەکا کە ئەم دەسنووسە دەگمەنە پێش ساڵی ١٨٥٧ لەلای مەلایەکی خەڵکی هەکاری بووە و داوای لێ کردووە بیداتێ یان بیفرۆشتێ، نەیفرۆشتووە. پاشان مەلا مەحموودی بایەزیدی ئەم دەسنووسە لە ساڵی ١٨٥٧دا دەنووسێتەوە؛ پێشەکییەکیش لەبارەی ژیانی دینی و ڕۆشنبیریی ناو مزگەوتەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان و شێوازی دەرس خوێندن دەنووسێتەوە لەگەڵ کورتەیەک لەبارەی ژیانی عەلی تەرەماخی.

ژابا کورتەیەکی بابەتەکەی تەرەماخی و پێشەکییەکەی بایەزیدیی تەرجەمەی فەرەنسی کردووە و لە ١٨٥٨/٦/١٧دا ناردوونی بۆ ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی، لێرنهاردت دۆرن؛ پاشان لە ١٨٥٩/٤/٢دا سەرجەم بابەتەکەی عەلی تەرەماخی بۆ دەنێری کە بە خەتی بایەزیدی نووسراوەتەوە. پاشان لە کتێبی (ریسالیان و حەکایەتان - کە لە ١٨٦٠دا چاپ کراوە، ژابا کورتەی ئەو کتێبەی عەلی تەرەماخی، بە کوردی و فەرەنسی بڵاودەکاتەوە. دەسنووسە بنجییەکەش، کە بە خەتی بایەزیدی نووسراوەتەوە لە کتێبخانەی ئەکادیمیای زانستیی ڕۆژهەڵاتناسیی لینینگراد پارێزراوە. ناونیشانی دەسنووسەکە بە فەرەنسی ئەمەیە:

Gramaire kurde par Ali Teramakhi offert a l Academie Imperial des Sciences a St-Petersbourg, par A.JABA.

د. مارف خەزنەدار لە گۆڤاری دەفتەری کوردەواری



میرە کوردێکی سەدەی هەژدەم
کوردستانی تورکیا

دا، ژماره ۳، له مانگی نیسانی ۱۹۷۰دا، له لاپەڕە ۱٤۲ - ۱٤٤دا، وتارێکی بە ناونیشانی (عەلی تەرەماخی و دەسنووسەکەی) لە بارەی ئەم دەسنووسەی نووسیوە. پاشان لە بەغدا لە ساڵی ۱۹۷۱دا بە ناونیشانی'' دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی'' چاپ کراوە.

۸- تەواریخی جدیدی کوردستان، یان کیتابی تاریخی جدیدی کوردستان. مەلا مەحموودی بایەزیدی لە ۱۸۵۷-۱۸۵۸دا نووسیویە و ویستوویەتی لاسایی شەرەفخان بکاتەوە: مێژووی کورد و کوردستان لەو شوێنەوە بنووسێتەوە کە شەرەفخان تێیدا بڕاوەتەوە. ژابا تەرجەمەی فەرەنسیی کردووە.

ئەم کتێبەی بایەزیدی نزیکەی هەزار لاپەڕە دەبوو، لە پێشەکییەک و ۱۱ بەش پێکهاتبوو. ساڵی ۱۸٦٥، ژابا پێشەکیی ئەم دەسنووسەی لە ئەرزەڕۆمەوە بە فەرەنسی ناردە کۆڕی زانیاریی رووسی بۆ نرخاندنی. بەداخەوە تا ئێستا سەرەنجامی ئەو دەسنووسە نەزانراوە.(۱۱٥)

۹- هاوکاریی کردووە لە دانانی قامووسێکی دیالێکتی هەکاری و رەوەندی - فەرەنسی لەگەڵ بایەزیدی. ناونیشانی قامووسەکە بە کوردی: '' ئەڤە رسالەیەکە د بەحسا هەنەک فەرق و جودایی دنێڤ لوغاتێد ئەکرادان هەندوو بەیانی بەعزی قەواعیدی عموومی یێد لازمە''. بەرگی دەسنووسەکە بە فەرەنسی ئەمەی لەسەر نووسراوە:

Vocabulaire kurde des dialectes de Hekari et Revendi, par A. JABA, Consul de Russie q Erzeroum, Erzeroum le 15 Mars 1858.

واتە: '' وشە کوردییەکانی دیالێکتەکانی هەکاری و رەوەندی''، لەلایەن ژابای کونسوڵی رووسی لە ئەرزەڕۆم. ئەرزەڕۆم: ۱٥ی مارسی ۱۸٥۸. بە خەتی شەهنەزەر ناوێک لە ۱۸٥۸دا نووسراوە. ٤۹ لاپەڕەیە، ۳٤ بە ۲۲سم، هەر لاپەڕەیەک ۱۳ خەتی تێدا نووسراوە. بە خەتی رقعە لەسەر کارتۆنی ئەورووپی بە خەتی رەش نووسراوە. کۆدەکەی لە کتێبخانەی ئەکادیمیای رۆژهەڵاتناسی لە لینینگراد: D 448.

پێشەکییەکی تێدایە بە پێنووسی مەلا مەحموودی بایەزیدی: بە دیالێکتی کرمانجی، باسی هەندێ تایبەتمەندێتیی زمانی کوردی دەکات؛ ئنجا کورتەیەکی رێزمانی لەبارەی دوو دیالێکتەکە. ژابا تەرجەمەی فەرەنسیی کردووە. دەسنووسەکە لە سێ کێڵگەدا نووسراوە: کرمانجی بە ئەلفبای عەرەبی؛ کرمانجی بە ئەلفبای لاتینیی کۆن؛ ئنجا تەرجەمە فەرەنسییەکەیان. بەشی دووەمی دەسنووسەکە قامووسێکە. هەندێ وشەی دوو دیالێکتەکەی هەکاری و رەوەندی پێشچاو دەخات و جیاوازییان لەڕووی وشەسازییەوە؛ لە پێنج ستووندا، بەم شێوەیە :

رەوەندی بە لاتینی/ رەوەندی بە عەرەبی/ هەکاری بە لاتینی/ هەکاری بە عەرەبی/ فەرەنسییەکەی.(۱۱٦)

۱۰- رسالة تحفة النحلان في الزمان كردان.

مەلا مەحموودی بایەزیدی لە ۱۸٦٦دا نووسیویەتی؛ لەبارەی رێزمانی کوردییە. رۆدنکۆ لە سەرچاوەکەیدا ئاماژەی بۆکردووە.

۱۱ ـ لاوێژک

کۆمەڵێک گۆرانییە کە پیاوان دەیڵێن و زۆربەی بەیتەکانی بە لۆلۆ دەلۆ دەست پێدەکات.

سەرەتای ئەم دەسنووسە: ''لۆلۆ دەلۆ برحی ئەستەنبۆلێ...''؛ کۆتاییەکەی: ''من نزانیا شەیتان لەعنەتی لەو بمین کنیایە...''.

۱۲ ـ بریتە

کۆمەڵێک گۆرانیی هەمە چەشنەیە کە لە شایی و هەڵپەڕکێدا دەگوترێ.

سەرەتای ئەم دەسنووسە: "عەیشۆ من دی بوو لبەر)؛ کۆتاییەکەی: "وەرە بگەڤە ناڤ سینگ و بەری عرض دزێ...".

١٣- (ترجما ضرب مثلانە بزمانی کرمانجی) پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردەوارین بایەزیدی لە کۆتایی ساڵانی ١٨٥٠دا نووسیونی و ژابا رێکی خستوون و وەری گێڕاون و پێشەکیی بۆ نووسیون. رۆدنکۆ لە ساڵی ١٩٦١دا، بە زمانی رووسی، لە کتێبی (ئەو دەسنووسە کوردییانەی لە لینینگراد پارێزراون)، لە لاپەڕە ٤٤دا ئاماژەی بۆ کردووە. نموونەی چەند پەندێکی ئەو دەسنووسە:

- سە درایە، کارولن د بهۆرە.
- گۆ کەرۆ مەمرە بوهار هات.
- لنگی خۆ قاس پەردا خۆ درێژکە.

هەندێ لە پەندەکانی ئەم دەسنووسە، لەلایەن کوردناسی رووس، پ. لێرخ، تەرجەمەی سەر زمانی ئەڵمانی و رووسی کراون و لە ١٨٥٧دا چاپ کراون.(١١٧)

١٤- حکایات شیخ صنعانیان

بەرهەمی فەقێی تەیرانە. سەرەتاکەی: " گوهـ بدێرن نوتقی عاشقانە "؛ " کۆتاییەکەی: دین و سوننەتێ..".

کتاب قصە شیخ صنعانیان. لە ٢٩ی تەمموزی ١٨٦٥ لەلایەن مەلا مەحموودی بایەزیدییەوە روونووس کراوە.

١٥- یووسف و زلێخا، نووسراوی سەلیمی سلێمان

ساڵی ١٩٧٣ کوردناسی رووس، رۆدنکۆ نامەی دکتۆراکەی لەسەر یووسف و زلێخای سەلیمی سلێمان بووە (کۆتایی سەدەی ١٦م ـ سەرەتای سەدەی ١٧) و لە ١٩٨٥ بڵاوی کردۆتەوە. ئەو دەسنووسە لە ریزی دەسنووسەکانی بایەزیدی و ژابا بووە. لە کۆتایی دەسنووسەکەدا نووسراوە کە سەلیمی سلێمان، شاعیری دەرباری میرنشینی کوردستانی تورکیا بووە. لە ١٥٨٦ - ١٥٨٧ نووسراوە. ١٧١١ بەیتە.(١١٨)

١٦ـ داستانی قەڵای دمدم

لە کۆمەڵە دەسنووسەکەی ژابادا پۆیەمای قەڵای دمدم هەیە، بەڵام نووسەرەکەی نەناسراوە و نازانین کەی نووسراوە؛ بەڵام هی سەدەی حەڤدەهەم یا سەرەتای سەدەیە هەژدەمەوە. نموونە: فرمانی عەبداڵخان، کاتێ دەزانی قەڵایان گەمارۆ داوە:

سبحە رۆژا شەڕانە بکەنە ئاخر زەمانە دەست سنگان دانە سەریم د قەبزا خانە.

پاشان:

سواش و قەتڵ و جەنگە حەسارە پڕ تفەنگە
ژی دبارن بەر سەنگە هنەک تیر و خەدەنگە
هندی کوو ئەڤ حەسارن بەرک ژ وان دبارن
عەجەم دبی چارپارن لەورا دەرخوون دارن
ب خەنجەر هاتن پێکرا ب هەزاران کوشتن ژێکرا(١١٩)

١٧- دانانی فەرهەنگێکی رووسی - فەرەنسی - کوردی و کوردی - رووسی - فەرەنسی.

ژابا، لە ١٨٦٥ یەکەمین بەشی فەرهەنگە رووسی - فەرەنسی - کوردییەکەی دەنێرێ بۆ ئەکادیمیای ئیمپراتۆری کە بریتی بوو لە ١٥٠٠٠ وشە لە ٧٢١ لاپەڕەدا. بەشی دووەمیشی کوردی - رووسی - فەرەنسییە؛ ٦٠٠ لاپەرەیە. لە ١٨٦٩ - ١٨٧٢دا نووسراوە. تا ئێستا چاپ نەکراوە و لە ئەکادیمیای زانستەکانی سۆڤیەت لە لینینگراد پارێزراوە.

لێرخ لە پێشوازیی ئەم فەرهەنگەدا رای وابوو کە زمانی کوردی ژمارەیەکی زۆرتری دۆست و لایەنگری نوێ وەدەست دێنێ. پاڵ بە گەرۆکە ئەورووپاییەکان لە کوردستاندا دەنێت خۆیان خەریکی فێربوون و لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی بکەن. هەروەها خوێندنەوەی ئەو دەسنووسانەی بڵاوکراونەتەوە و ئەو دەقە کوردییانەی لە ئەرزەرۆم کۆکراونەتەوە ئاسانتر دەکات و یارمەتیی پێکهاتن و خەملاندنی زیاتری زمانی کوردی دەدات.(١٢٠)

١٨- چیرۆکی سیامەند و شەمسێ، بە پەخشان. ژابا کردوویەتییە فەرەنسی.

لەبارەی ئەم دەسنووسەوە، رۆژهەڵاتناسی رووس، چیخاچیف، دەڵێ:" لەنێو ئەو بەڵگەنامانەدا کە چەندین رەفەی کتێبخانەکەی ئەلکزەندەر ژابا (ئەو کونسوڵە زانایەیان) پڕکردبۆوە، داستانی خۆشەویستیی سیامەند و شەمسێ مان بەرچاو دەکەوێت. بەڕێز ژابا نەک تەنیا وەرگێڕدراوی کوردی و تا رادەیەک بە شێوازێکی ئەدەبیی داڕێژراوی ئەو داستانەی دامێ، بەڵکو کۆپییەکی جوانی دەقەکەیشی پێ بەخشیم و رێگای ئەوەی دامێ کە بیدەم بە (کۆمەڵەی ئاسیاویی فەرەنسا، کە بێگومان دڵشاد دەبێت کە خۆی بە ئاسەوارێکی وا دانسقەی ئەدەبی رۆژهەڵات دەوڵەمەند بکات"(١٢١)

چیخاچێف ئەم دەسنووسە کوردییەی لەگەڵ وەرگێڕدراوە فەرەنسییەکە و نووسینەوەی بە پیتی لاتینی، لەگەڵ پێشەکییەک بە زمانی فەرەنسی لە ساڵی ١٨٥٩دا بڵاوکردۆتەوە.(١٢٢)

٩- نوبهار (نوبار)

قامووسی عەرەبی - کوردی، دانراوی ئەحمەدی خانی لە ساڵی ١٦٨٣ بۆ منداڵانی کورد دایناوە: " نە ژبۆ صاحب رەواجان، بەلکی ژبۆ چووکی د کرمانجان ".

د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، جگە لەم بەرهەمانە ئاماژەی بۆ ئەم دەسنووسانەش کردووە: در المجالس، کەلامی کچان، گوری و خلیل بگ، سترانێد کرمانجێ، زەنبیل فرۆش، یووسف و زلێخا، قەولی هەسپی رەش و... هتد.(١٢٣) گەلێک بەرهەمی دیکەشی، بە هاوکاریی بایەزیدی نووسیوە و تەرجەمەی سەر زمانی فەرەنسیی کردووە و بە دەسنووس ماونەتەوە.

هەموو ئەو دەسنووس و نووسراوانە - لەگەڵ چەندانی دیکە - لە دەزگا زانستییەکانی لینینگراد هەڵگیراون، لە کتێبخانەی سەلتیکۆف شێدرین. خوالێخۆشبوو م.ب. رۆدنکۆ لە کتێبی (مەجمووعەی ئەلکزەندەر ژابا - دەسنووسە کوردییەکان -، " کارە گشتییەکانی سەلتیکۆف شێدرین"، لینینگراد: ١٩٥٧، بەرگی دووەم، ل ١٦٤-١٨٤دا) باسی کردوون.(١٢٤)

تاکو ئێستا بەشێکی زۆر کەم لەم دەسنووسانە ساغ کراونەتەوە و بە کتێب چاپ کراون؛ یان بەشێوەی لێکۆڵینەوە لە گۆڤاراندا بڵاوکراونەتەوە. لەو دەسنووسانەی کاریان لەسەر کراوە، ئەمانەن:

١- چیرۆکە شیعری مەم و زینی ئەحمەدی خانی. بڵاوکردنەوە و پێشەکیی رۆدنکۆ. مۆسکۆ: ١٩٦٢.

٢- چیرۆکه شیعری شێخی سەنعان. نووسراوی فەقێی تەیران. بڵاوکردنەوە و پێشەکیی ڕۆدنکۆ. مۆسکۆ: ١٩٦٥.

٣- چیرۆکه شیعری لەیلا و مەجنوون. نووسراوی حارسی بەتلیسی. بڵاوکردنەوە و پێشەکیی ڕۆدنکۆ. مۆسکۆ: ١٩٦٥.

٤- عادات و رسووماتنامەی ئەکرادیە. نووسراوی م.م. بایەزیدی. بڵاوکردنەوە و پێشەکیی ڕۆدنکۆ، مۆسکۆ: ١٩٦٣.

٥- عەلی تەرەماخی: دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی (صرف و بعضی اصول لازمەبی تعلیمە بە زمانی کورمانجیە). بڵاوکردنەوە و پێشەکیی د. مارف خەزنەدار. بەغدا: ١٩٧١.

٦- چیرۆکی مەم و زین، نووسراوی مەلا مەحموودی بایەزیدی لە ساڵی ١٨٥٨، ساغکردنەوە و بڵاوکردنەوەی د. فەرهاد پیربال. گۆڤاری کاروانی ئەکادیمی، ژمارە (١)، هەولێر: ساڵی ١٩٩٦.

٧- رسالیان و حەکایەتان، چل چیرۆکی کوردی، نووسراوی مەلا مەحموودی بایەزیدی لە ساڵی ١٨٦١، ساغکردنەوەی: د. فەرهاد پیربال، ساڵی٢٠٠١ لە دەزگای (ئاراس) لە هەولێر بڵاوکراوەتەوە.

٨- یووسف و زلێخا. نووسراوی سەلیمی سلێمان. ساڵی ١٩٧٣ کوردناسی رووس، ڕۆدنکۆ، نامەی دکتۆراکەی لەسەر ئەم بابەتە بووە و لە ١٩٨٥ بڵاوی کردۆتەوە.

بەم شێوەیە، ئەلکزەندەر ژابا ڕۆڵێکی سەرەکی و گرنگی لە بواری ئەدەبیاتی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا هەبووە. ئەگەر ژابا نەبووایە، چل و چوار دەسنووسی دانسقەی سەدەکانی ناوەڕاست و سەدەی نۆزدەهەم لە ئەدەبیاتی کوردیدا بزر دەمانەوە. ژابا بوو کە هانی مەلا مەحموودی بایەزیدیی دا بۆ ئەوەی بە کوردی بنووسێت و خزمەتی ئەدەبیاتی نەتەوەکەی خۆی بکات.

ژابا، وەرگێڕێکی بەهرەدار، قامووسەوانێکی بەتوانا، ئارشیفیست و کۆکەرەوەی تێکستی فۆلکلۆریی کوردی بووە؛ ژابا بە شادەماری جموجۆڵی پەخشانی کوردی دەژمێردرێت لە سەدەی نۆزدەهەمدا.

# هۆی سەرهەڵدانی کوردناسی

## ئامانجی کوردناسەکان

ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەی سەریان لە کوردستان داوە، چەند ئامانجێکی جۆراوجۆریان هەبووە. چەند هۆیەکی بنچینەیی هەن کە ئەم گەڕاڵ و ڕۆژهەڵاتناسانە کوردستانیان کردۆتە مەڵبەندی ئەم سەفەرانەی خۆیان:

### ١- ستراتیژیەتی دینیی مەڵبەندی کوردستان

کوردستان بێشکەی دین و دینزاکانی جیهانە. کورد ئەگەر لە باری ئەتنیکەوە نەژادێکی سەربەخۆی هەبێ، لە باری دینەوە، سەر بە دین و دینزا و مەزهەبی جۆراوجۆر بووە: زەردەشتی، مانەوی، جوولەکە، مەسیحی نەستۆری و ژاکۆبی و کلدانی و ئاشووری، یەزیدی، موسڵمان (شیعە و سوننی)، ئەهلی حەق و هتد. ڕێبەر و سەرانی هەر دینێک ویستوویانە خەڵکی کورد بۆ لای خۆیان رابکێشن؛ یان بە لای کەمەوە بێن کوردستان بکەنە مەیدانی پەرە پێسەندنی ئەو دین و مەزهەبە دیاریکراوەی خۆیان.(١٢٥)

موژدەگارە مەسیحییەکان (Missionnaires، المبشرین)، دەستەیەکی زۆر دیار و بەهێزی ڕۆژئاواییەکانن؛ بۆ مەبەستی بلاوکردنەوەی دینی مەسیح و فریاکەوتنی ژیانی رۆحی و کولتووری مەسیحییەکانی کوردستان هاتوونەتە کوردستان.(١٢٦)

لە سەدەی ١٢دا، شەڕی خاچپەرستەکان و هێرشهێنانیان بەرەو ڕۆژهەڵات، لەلایەکی دیکەشەوە بووژانەوەی رۆشنبیری و ئاسۆفراوانتربوونی لێکۆڵینەوە جوگرافی و زانستییەکان لە چارەگی یەکەمی سەدەی ١٣ بەملاوە لە ئەورووپا، پاشانیش بەهێزبوونی دەسەڵاتی هەنگاریا و لە رۆژهەڵاتیشدا بلاوبوونەوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی مەنگۆلیی جەنگیزخان، ئنجا بلاوکردنەوەی دینی مەسیحی و بە مەسیحی کردنی جیهان Evangilisation لەنێوان سەدەی ١٢ و ١٣دا بوونە هۆی ئەوەی کە پەیوەندیی سیاسی و بازرگانی و هاتوچۆکردن لەنێوان رۆژهەلات و رۆژئاوادا پەرە بستێنێت.(١٢٧)

موژدەگارە مەسیحییەکانی ئەورووپا لەنێوان سەدەی ١٢ و ١٣دا - کە دەیانویست دینی مەسیحی بەناو خەڵکی ڕۆژهەڵاتدا بلاوبکەنەوە - رۆڵێکی گەورەیان لە دروستکردنی ئەو پەیوەندییەی نێوان ڕۆژهەڵات و رۆژئاوادا بینی. ئەمانە، دەیانویست ژیانێکی تازە ببەخشنە رۆژهەلات و نەخشەیەکی تازەی "مەسیحی" بۆ جیهان دروست بکەن.(١٢٨) مامۆستا شوکوور مستەفا، جەختی لەسەر ئەم راستییە دەکاتەوە و دەڵێ:

«سەرەتای پەیوەندیی نێوان ڕۆژهەلات و رۆژئاوا لەگەڵ شەڕ و شۆڕی خاچپارێزەکاندا دەستی پێکرد.(١٢٩) تەنانەت بۆچوونی تازەی ئەوتۆ هەیە کە وادەبینێت سەرهەڵدانی خودی زانستی رۆژهەڵاتناسی، خۆیشی پەیوەندیی بە سەرهەڵدانی جموجۆڵی موژدەگاری (تەبشیر)ەوە هەیە.»(١٣٠)

یەکەمین گرووپی ئەو موژدەگارە مەسیحییانە، بە سەرۆکایەتیی Aorentin RICOLDO لەساڵی ١٢٨٨ دا بوو گەیشتنە شاری تەورێز؛ پاشان بە ناوجەرگەی کوردستاندا چوونە شاری مووسڵ.(١٣١)

ئێمە چەند بەڵگەیەکمان بۆ ئەوە هەیە کە بسەلمێنین یەکێک لە ئامانجەکانی بایەخدانی رۆژئاوا بە کوردستان، جموجۆڵی تەبشیر و بلاوکردنەوەی دینی مەسیح بووە؛ بۆ نموونە دەبینین یەکەمین کتێبە تەرجەمەکراوەکان بۆ سەر

زمانی کوردی، بریتی بوونه له ئینجیلێک و کتێبێک لەبارەی مەسیحییەت، کە لەلایەن موژدەگارانەوە ئەنجام دراون.(١٣٢) هەروەها دیسان یەکەمین کتێب لەبارەی زمانی کوردییەوە چاپ کرابێت، لەلایەن یەکێک لەو موژدەگارانەوە نووسراوە: لەلایەن قەشەی ئیتالی، گارزۆنی Morizio GARZONI، کە لە ساڵی ١٧٨٧ بە ناونیشانی Grammatica e vocabulairio della lingua kurda لە رۆما چاپکراوە. قەشەی ناوبراو - کە سەرۆکی وەفدێکی موژدەگاران بوو - لە ساڵی ١٧٦٢دا دەگاتە مووسڵ. ئنجا دوو ساڵ درەنگتر لەگەڵ وەفدەکە دەچنە ئامێدی و تا ١٧٧٠ لەوی دەمێننەوە؛ پاشان گارزۆنی لە ١٧٨٣دا دەگەڕێتەوە رۆما. لە ساڵی ١٧٨٦ تا ١٧٨٩ دیسان لەگەڵ وەفدێکی تری موژدەگاران دێتەوە مووسڵ. ئنجا پاشان دەگەڕێتەوە رۆما و ساڵی ١٧٩٠ کۆچی دوایی دەکا.(١٣٣)

گەڕاڵی ئیتاڵی، ئابێ رافائێل ژیوسێپ کامپانێل (Raphael Giuseppe Campanile، ١٧٦٢- ١٨٣٥) یەکێکی دیکەیە لە یەکەمینی ئەو موژدەگارانەی کە بەرهەمێکی جوانی لەبارەی چەند دیمەنێکی ژیانی کوردەواری و مەسیحییەکانی کوردستان بۆ جێ هێشتووین.(١٣٤) (ئەم کتێبە لەلایەن تۆما بواوە تەرجەمەی فەرەنسی کراوە و هێشتا بڵاو نەکراوەتەوە). ناوبراو لە ساڵی ١٨٠٢ گەیشتۆتە مووسڵ. بە هۆی ئەوەی کە شارەزاییەکی زۆری لەبواری پزیشکیدا هەبووە؛ توانیویەتی لە گەلێک سەرکردە و میرە کوردەکانی ئەو کاتە نزیک ببێتەوە. لە ساڵی ١٨١٥ گەڕاوەتەوە ناپۆلی.(١٣٥)

ئەو موژدەگارانە کاریگەرییەکی زۆریان بەسەر رووناکبیرە کوردەکانەوە هەبووە - بۆ نموونە - میرزا سەعید خان لە ١٨٩٨دا لەگەڵ موژدەگارەکان کەوت و چوو بۆ وڵاتی سوێد و لەوێوە چووە لەندەن دوو ساڵ پزیشکیی خوێند و بە ناوی دکتۆر سەعید خانەوە هاتەوە ئێران. ناوبراو هەمان ئەو کەسەیە کە دەسنووسی قەباڵە ئەشکانییەکانی هەورامانی، لەگەڵ چەند دەسنووسێکی کوردیی دیکە فرۆشتبووە مۆزەخانەی بریتانی.(١٣٦)

با بۆ نموونە چەند دێڕێکی مارکۆ پۆلۆ بخوێنینەوە، بزانین، لەبارەی بایەخی دینیی کوردستان و دینی کوردەکان لەو سەردەمەدا چیمان پێدەڵێ:

مووسڵ میرنشینێکی گەورەیە کە چەندین جۆر میللەتی تێدا دەژێ. لەپێش هەموویانەوە عارەب کە هەموویان محەمەدپەرستن. جۆرە نەژادێکی دیکەشی تێدایە کە پەیڕەوی مەسیحییەتن: نەستۆرێ Nestoriens و ژاکۆبییەکان Jacobites.

لە ناوچە شاخاوییەکانی ئەم میرنشینەدا میللەتێک دەژین پێیان دەڵێن کورد Courdes کە مەسیحیی نەستۆری Nestoriens و ژاکۆبین Jacobites. بەڵام هەندێکیان موسڵمانن Sarrazin، محەمەد دەپەرستن.(١٣٧) جگە لە موژدەگارەکان، ئەو پیاوە مەسیحییانەی کە لە فەرەنسا پێیان دەگوترێ کاپووسان Les Capussins بە یەکەمینی ئەو فەرەنسییانە دەژمێردرێن کە لە کاتی رووکردنە رۆژهەڵات، لە ساڵی ١٦٣٢ بەملاوە، راستەوخۆ لە کوردان نزیک بوونەتەوە و تەنانەت هەوڵیان دابێ زمانی کوردیش فێر ببن.(١٣٨) ئەمەش لە ساڵی ١٦٣٢ بەملاوە بوو کە یەکەمین کەپووسانە فەرەنسییەکان بۆ بڵاوکردنەوەی دینی مەسیحی هاتنە مووسڵ. لە ساڵی ١٧٢٤دا یەکێک لە ئەندامەکانیان، لە ئەنجامی سیاسەتی دینپەرستانەی دەسەڵاتدارانی ناوچەی مووسڵ، دەکوژرێت و ئیتر ئەوانیش لە ترسان بۆ ماوەیەک مووسڵ جێ دەهێڵن.(١٣٩)

## ٢- ستراتیژیەتی سیاسیی مەڵبەندی کوردستان

لە ڕووی سیاسی و سەربازیشەوە، کوردستان بایەخێکی ستراتیژیی مەزنی هەبووە. ئێگزەنەفۆن ئەگەر مەبەستێکی سیاسی و سەربازیی لە کوردستاندا نەبووایە نەدەهاتە کوردستان شاکارەکەی بەناوی ئاناباز بنووسێت. بە هەمان شێوە، ئەسکەندەری مەکەدۆنیش ئەگەر هەولێری بە مەڵبەندێکی ستراتیژی نەزانیبایە و کوردستانی داگیر نەکردایە، نیگارکێشە ئەورووپاییەکان ئەو هەموو تابلۆ و دیواربەندە جوانانەیان لەبارەی شەڕی ئەربێللا دروست نەدەکرد. جەنگیزخانی مەنگۆلیش، لە سەدەی ١٣مدا کاتێ هاتووە شاری تەوریزی داگیرکردووە، لە ڕێگای داگیرکردنی مەڵبەندەکانی کوردستانەوە بووە کە توانیویەتی تا شاری کیف بڕوات و رووسیاش داگیربکات. تەنانەت عەرەبە موسڵمانەکانیش، لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا، لە سەرەتادا هاتن کوردستانیان داگیر کرد: کوردستانیان کرد بە بنکەیەک بۆ بڵاوکردنەوەی دەسەڵات و هێرشەکانی خۆیان بۆ سەر ئەستەمبۆڵ و رووسیا.[١٤٠] گرنگترین مەڵبەندی سەردانی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە لە شارەکانی کوردستاندا، دیاربەکر و هەولێر و بەتایبەتیش مووسڵ بووە کە کردوویانەتە کاروانسەرا و مەنزڵگای وەستانی خۆیان.

بۆ ڕوونکردنەوەی بایەخی ستراتیژیی سیاسی کوردستان، هۆی نزیکبوونەوەی رووسیا لە کورد و ئەزموونی کوردناسی لە رووسیا بە نموونە دەهێنینەوە:

"رووسیا مەبەستی زۆری سیاسی و کەمی ئایینی هەبووە لە ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسیدا. لە ساڵی ١٧٠٣دا لەگەڵ بنیادنانی پایتەختی رووسیای تازە (سانت پترسبۆرگ) قۆناغی دەسەڵاتی تازەی رووسیا دەستی پێکرد. ئەمە بووە هۆی ئەوەی بیری ئیمپریالیزمی کلاسیکی لە رووسیا بکەوێتە ڕوو. فراوانیی خاکی رووسیا و هاوسێکانی لە هەموو لایەکەوە بووە هۆی ئەوەی کە رووسیا وڵات و خاکی هاوسێکانی داگیربکات و بیخاتە سەر خاکی رووسیا، بێ ئەوەی پێویستی بەوە هەبێ لە زەویی ئەودیو زەریاکان بگەڕێ. وەکو ئیمپریالیستەکانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و هی تر. بایەخدانی رووسیا بە ڕۆژهەڵاتناسی لەلایەک لاساییکردنەوەی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا بوو، لە لایەکی تریشەوە شارەزایی پەیداکردن لە نەتەوە هاوسێکانی خۆی لەپێناو بەرژەوەندیی دەوڵەت و ئاسایشی نەتەوایەتیی ئەو سەردەمە. نزیکبوونەوەی رووسیا لە کەنداوی بەسرە هیوا و ئامانجێکی دێرینی رووس بوو. بۆ دەسخستنی ئەم ئامانجە، دەبوو قەفقاس داگیر بکرێ، وڵاتی کوردەواریش پردێک بوو؛ بەبێ ئەو ئامانجەکە نەدەهاتە دی. جگە لەوە بەشێک لە دانیشتووانی ئیمپراتۆریەت لە رووسیای کۆن و سەردەمی دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان کورد بوون. خاکەکەیان نێوەندێکی ستراتیجی بوو بۆ پاراستنی سنووری خوارووی روسیا".[١٤١]

بەم شێوەیە، رووسیا دەمێک بوو خەونی بە (ئاوی گەرم) واتە بە کەنداوی عەرەبییەوە دەبینی. بۆ ئەمەش دەبووایە پێشتر بێت کوردستان داگیر بکات.

نموونەیەک لە سەفەرنامەکەی ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی، ئەلفرێد ژاکۆب دەهێنینەوە؛ کاتێ باسی بارودۆخی سیاسی کوردستان دەکات:

کوردەکان باج و خەراج زۆر کەم دەدەنە دەوڵەت. بەناو گوایە سەر بە والیی بەغدان، بەڵام ڕاستییەکەی چەند یاسایەکی تایبەتی خۆیان هەیە و لەژێر سەرپەرشتی سەرکردەی تایبەتی خۆیاندا بەڕێوەدەچن.

لە کۆتاییدا، ئەلفرێد ژاکۆب بەم شێوەیە ستراتیژیەتی کوردستان و پشتگیریی ڕۆژئاوا بۆ کورد ڕوون دەکاتەوە:

«ئەم مـیللەتە، کە بە تـەواوەتی لە دەرەوەی بازنەی یاساکـانی ئەو رژێمـانەدان کـە ئاسـیـا بەرێوە دەبەن، لە ناو خـۆیاندا ژیانێکی ئازاد و سـەربەخـۆیان بۆ خـۆیان پێکـهـێناوە، ئەم مـیللەتە جـەنگاوەرە کـە بەڕاسـتی خـوێنێکی شکۆمەندانە لە ناو دەمارەکانیدا دەگەڕێ. پێویسـتی تەنیـا بەوە هەیە کە سەرکردەیەکی ئازادیخواز و یاسادانەر بۆ خـۆی پەیدا بکات: بۆ ئەوەی بتـوانێ رژێمـە کـۆن و کەودەنەکانی تورکـیـا و فـارس سـەرەونگون بکـات، هەروەها بۆ ئەوەی (لەوانـەشـە) بتـوانێ بە یارمـەتیی شـارسـتـانیـەتی رۆژئاوا، دەسـەڵاتێکی گـەنجـانە و بەهێـز لە نـاوچەکـەدا دابمەزرێنی.[142]

## ٣- ستراتیژیەتی بازرگانی و ئابووریی مەڵبەندی کوردستان

لە سـەدەکـانی رابردوودا، بەشی هەرە زۆری رێگا بـازرگـانیـیـەکـانی نێـوان دەوڵـەتانی ڕۆژهەڵات و رۆژئاوا بە کوردستاندا تێدەپەڕین. بڕوانە ئەم هێڵە بازرگانییانەی خوارەوە:

- رێگای بازرگانی نێوان چین و ئاسیای بچووک.
- رێگای بازرگانی نێوان چین و وڵاتانی رۆژئاوا.
- رێگای بازرگانیی نێوان رووسیا و وڵاتانی عەرەب.
- رێگای بازرگانیی نێوان وڵاتی فارس و جیهانی رۆژئاوا.
- رێگای بازرگانیی نێوان وڵاتی فارس و وڵاتی چین.

جگە لەمـانەش، ژان باپتیـست تاڤێرنیی TAVERNIER، بازرگانی ناوداری فەرەنسای ناوەڕاستی سەدەی ١٧، زۆر بەوردی وەسفی ئەو سێ رێگا بازرگانییە گرنگەمـان بۆ دەکات بە ناوەڕاستی کوردسـتاندا تێپـەڕدەبن و جیـهانی رۆژئاوا بە ڕۆژهەڵات دەبەسـتـنەوە.[143] لە بەرگی یەکـەم، لە لاپەرە (٧٠-٧٣) دا باسی سـەفـەری رێگای بەرەو ئەرزەڕۆم و یەریڤـان دەکات، پاشـان باسی رێگا و مـەڵبەنـدەکانی سەرسنووری تورکـیا- ئێـران و دەوروبەری شـاری قارس و رووباری ئاراس. لە لاپەرە (٢١٨) دا دەڵێ:

پێنج رێگای بنچینەیی هەن کە لە شاری حەلەبەوە بتگەیەننە ئەسفەهان. ئەو پێنج رێگایانەش لەگەڵ دوو رێگای دیکە یەکتر دەگرنەوە؛ واتە بەهەمووی حەوت رێگا هەن بۆ گەیشتنە وڵاتی فـارس لە شاری ئەستەمبۆل وحەلەبەوە: یەکـێک لەم رێـگایانە، لە شـاری حـەلەبەوە، دەکـەوێتـە لای چەپ؛ واتە رێگای بەرەو دیاربەکـر و پاشـان تەورێز. دووەمین رێگا بەلای راستەوە، بەرەو میزۆپۆتامیا، بە رێگای مووسڵ و ئامێدی.[144]

کوردستان کاروانسەرای رێگا بازرگانییە ناودارەکەی ئاوریشم بووە. ئەورووپاییەکان بەم رێگا گرنگەیان گوتووە رێگای ئاوریشم La Route de la Soie. لەوە دەچێ هەر بۆیەش چەندین شـارۆچکەی ئەم رێگا بـازرگـانیـیـە لە کوردستاندا ناونراون (حەریر). بۆ نموونە: حەریری نزیک هەولێر و حەریری باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی تورکیا.

بازرگانی و بوونی رۆژئـاواییەکان لە ڕۆژهەڵاتدا، تەنانەت لەناو زمانیشدا رەنگی داوەتەوە. سەدان وشەی وەکو کـاروان، کـاروانسـەرا، رێڤی، روز، یۆگـوورت و... لە زمـانە ئەورووپاییـیـەکـاندا؛ سـەدان وشـەی زمـانە ئەورووپاییەکانیش، وەکو شەمەندەفەر، سینەما، شانۆ، رتووش، بەتالیۆن و... لە زمانەکانی ڕۆژهەڵاتدا رەنگیان داوەتەوە.

پێشکەوتنی بازرگانی لەنێوان وڵاتانی ئاسیا و ئەورووپادا، لە سەدەی ١٦ بەملاوە بوو دەستی پێکرد.[145] بازرگان و گەڕاڵە ئەورووپاییەکان لە ١٥١٠ بەملاوە بە لێشاو سەفەریان دەکرد بەرەو ڕۆژهەڵات؛ بە تایبەتیش

بەرەو ئەسفەهان و ئەستەمبۆڵ و تەوریز و تەرابزۆن.(١٤٦) بۆیەش پەرەسەندنی کارتۆگرافی و دروستکردنی ئەتڵەس و بەکارهێنانی نەخشەی جوگرافی، بە هەمان شێوە لە ناوەڕاستی ساڵانی سەدەی ١٦مەوە بوو کە بە ناو خەڵکی رۆشنبیر و گەڕاڵ و بازرگاناندا بڵاوبۆوە.(١٤٧)

لە ئەنجامی ئەم پێشکەوتنە بازرگانییەی نێوان ڕۆژهەڵات و رۆژئاوا، پەیوەندیی دیپلۆماسی و سیاسیی نێوانیشیان پەرەی سەند. چەند وڵاتێکی وەکو ئیتاڵیا و فەرەنسا و ئینگلستان و ئەڵمانیا، لە سەدەی ١٦م بەملاوە، باڵوێزخانەی خۆیان لە پایتەختەکانی دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویی ئێراندا کردەوە.(١٤٨)

بازیل نیکیتین لە لاپەڕە ٥٩ی کتێبەکە ناودارەکەیدا Les Kurdes، لەسەر زمانی پییێر ئامێدی ژوبێرتەوە، جەختی لەسەر بایەخی ئابووری و ستراتیژیەتی مەڵبەندی کوردستان دەکاتەوە و دەڵێ: (ئەو جەنگەی فەرەنسییەکان لە میسر دژی عوسمانییەکان دەیانکرد، بە مەڕ و ماڵاتی کوردستان باربوو دەکرا کە لەوێوە دەیانهێنا).

ئەم بایەخە ستراتیژیە ئابووری و بازرگانی و سیاسییەی کوردستان و ڕۆژهەڵات، پێویستیی بەوە دەکرد کە زانستی کارتۆگرافی واتە زانستی دروستکردنی نەخشەی جوگرافی پێش بکەوێت. بۆ گەیشتن بە وڵاتی کورد و وڵاتانی ڕۆژهەڵات، ڕۆژهەڵاتناس و گەڕاڵ و سیاسییەکان پێویستییەکی زۆریان بە نەخشەی کوردستان و ئەو وڵاتانەی ڕۆژهەڵات هەبوو؛ بۆیە کەوتنە بایەخدان بە بڵاوکردنەوە و لێکۆڵینەوەی نەخشەی جوگرافیی: جوگرافیای سیاسی، جوگرافیای کانزایی، جوگرافیای کشتوکاڵی، جوگرافیای مێژوویی، جوگرافیای ئارکیۆلۆژی. بۆ ئەم مەبەستەش، لە ساڵی ١٨٢٨دا پاشای فەرەنسا شارڵی دەیەم، ئارشیفخانەیەکی تایبەت و تەرخانکراوی لە کتێبخانەی نیشتیمانیی فەرەنسا دامەزراند و ناوی لێنا بەشی نەخشە جوگرافییەکان. لەو رۆژە بەملاوە ئەم ئارشیفخانەیە دەستی کردە کۆکردنەوە و دروستکردنی سەدان نەخشەی جوگرافیی جۆراوجۆر کە یارمەتی گەڕاڵ و جوگرافیاناس و مێژوونووس و ڕۆژهەڵاتناسەکان بدات بۆ باشتر پەی بردن بە دنیای ڕۆژهەڵات و ناسینی.(١٤٩) لەو رۆژەوە تاکو ئێستا سەدان نەخشەی جوگرافی لەبارەی کوردستان لەو کتێبخانەیەدا پارێزراون. ئەمانەی خوارەوە، چەند سەرچاوەیەکن کە نەخشەی سەربەخۆیان تێدایە لەبارەی جوگرافیای کوردستان:

1- Heinrich KIEPERT: Nouvelle carte generale des provinces asiatiques de l Empire Ottoman, Berlin: 1884.

بە ئەڵمانییە کراوەتە فەرەنسی. زیاتر لە ١٠ نەخشەی جۆراوجۆری لەبارەی کوردستان بڵاوکردۆتەوە.

2-Jaques de MORGAN: Maison scintifique ( Etudes geographiques),7 Volumes, Paris: 1898- 1902.

زیاتر لە ٣٠ نەخشەی جۆراوجۆر لەبارەی کوردستان لەم کتێبەدا بڵاوکراوەتەوە.

3- Heinrich KIEPERT: Atlas antique, Berlin: 1898.

ئەڵمانییە کراوەتە فەرەنسی. پێنج نەخشەی کوردستانی تێدایە.

## ٤- خولیای هونەر و داهێنان لەلایەن نیگارکێش و نووسەرە ڕۆمانسییەکانەوە

ئەگەر تا کۆتایی سەدەی ١٨ ، بەشی زۆری ئەوانەی سەفەریان بەرەو ڕۆژهەلأت دەکرد مۆژدەگار و پیاوی دەوڵەت و جاسووس و مێژوونووس و جوگرافیاناس و سیاسی بووبن، ئەوا لە سەرەتای ١٨٠٠ بەملاوە (لە سەردەمی ڕۆمانسییەکاندا) توێژێک دەرکەوتن کە دوور بوون لە هەموو بەرژەوەندییەکی ماددی و سیاسی: شاعیر و نووسەر و هونەرمەندە ڕۆمانسییەکان، کە تا بینەقاقایان شەیدای "بەهەشتی ڕۆژهەلأت" بوون.

ئەم نووسەر و هونەرمەندە ڕۆمانسییانە باوەڕیان وابوو کە کۆمەڵگای ئەورووپی کەوتۆتە خەرەندێکی قووڵەوە؛ مرۆڤ نرخی مرۆڤانە و بەهای ڕۆحیی خۆی لەدەست داوە. خێزان -کە کۆڵەگەی کۆمەڵگایە- بە بۆچۆونی ئەم ڕۆمانسییانە، دارووخابوو.[١٥٠]

لامارتین، شاعیری گەورەی ڕۆمانسیی فەرەنسا ، یەکێک بوو لەو ڕۆمانسییانە کە وای دەبینی سیستەمی ژیانی ڕۆژئاوایی بەرەو رووخان هەنگاو دەنێت؛ بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، وای دەبینی کە ڕۆژهەلأت لانکەی لەدایکبوون و بووژانەوەیە. لەم بارەیەوە دەڵێ: "ڕۆژهەلأت شانۆی شکۆمەندترین مرۆڤە".[١٥١] لامارتین دەگاتە ئەو رایەش کە "شارستانیەتی ڕۆژهەلأت هەمیشە لە سەرووی شارستانیەتی ڕۆژئاوادایە؛ چونکە دێرینترە، رەسەنایەتییەکەیشی سازگارتر و رسکاوترە".[١٥٢]

ئازار و تلانەوەی ڕۆمانسییەکان بە دەست ئەو شوێن و کاتەی کە نووسەر و هونەرمەندی ڕۆمانسیی تێیدا دەژیا ، هەروەها ئارەزووی راکردن بەرەو شوێن و کاتێکی دیکە، بنەمایەکی رەگاژۆ و خاسیەتێکی دیاری بیرکردنەوەی ڕۆمانسییەکانی ئەورووپا بوو.[١٥٣] بۆیە، زۆربەی ڕۆمانسییەکان حەزیان لە گەشت و گەڕان و سەفەر دەکرد. شەیدای سەفەر و بینینی دیاردەی تازە و نامۆ بوون؛ شاعیری فەرەنسی، ئەلفرێد دی مۆسی چووە ئیتاڵیا؛ نووسەری ئەڵمانی، گۆتێ، چووە ئیسپانیا و رووسیا و ئیتاڵیا؛ ڕۆماننووسی فەرەنسی، ئەلکزاندەر دووماس، چووە ئیتاڵیا و ئیسپانیا؛ هەندێکی دیکەشیان ئاراستەی سەفەری خۆیان گۆڕی و روویان کردە ڕۆژهەلأت. شاعیرانی ناوداری فەرەنسی، لامارتین و شاتۆبریبان و نێرڤاڵ هاتنە ئێران و تورکیا و سووریا و میسر. ئەم نووسەرە ڕۆمانسییانە بەرهەمەکانی خۆیان بە ڕۆژهەلأت دەوڵەمەند کرد. نیگارکێشی ڕۆمانسیی فەرەنسی، یۆژێن دی لاکروا، چووە جەزایر، ژێریکۆڵت بۆ تورکیا و ئێران، پووشکین چووە ئەرزەڕۆم و باسی کوردە یەزیدییەکانی کرد، شاعیری گەورەی ئینگلیزیش، بایرۆن، چووە یۆنان و لە جەنگی سەربەخۆیی یۆناندا شەهیدبوو. تەنانەت گەلێ لە گەورە نووسەر و ڕۆماننووسە ریالیستەکانیش، بۆ نموونە گۆستاف فلۆبێرت، شەیدای ڕۆژهەلأت بوون و بەهرەی بەرهەمەکانی خۆیان لە میسر و ئێران و تورکیاوە هەڵدەهێنجا.[١٥٤]

رووناکبیرێکی فەرەنسی، فرانسواز بێرەنژێ، ئەم شەپۆڵەی رووکردنە ڕۆژهەلأت لەلایەن شاعیر و نووسەر و هونەرمەندانی ئەورووپییەوە، لێکدەداتەوە و دەڵێ: "ڕۆژهەلأت پەناگەی ئەو کەسەیە کە سەرنەکەوتووە لە خۆگونجاندنیدا لەگەڵ واقیع".[١٥٥]

نیگارکێشە ڕۆمانسی و ریالیستە ئەورووپییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، شەیدای سەفەر و جوانی و غوربەت و عەشقی ڕۆژهەلأت، بە دەیان ساڵ لە دەشت و دەر و شار و پایتەختە بەر هەتاوەکانی ڕۆژهەلأت ماونەتەوە و رەسمی رووبار و کچ و شار و شاخ و شەوی ڕۆژهەلأتییان کردووە؛ بەدەم وێنەکێشانی جوانییەکانی ڕۆژهەلأتەوە، ژیانیان بەسەربردووە. کە گەڕاونەتەوە وڵاتی خۆشیان ئەو تابلۆیانەیان لە ئەکادیمیا و مۆزەخانە و گەلەری و پەیمانگا و

سالۆنە هونەرییەکاندا هەڵواسیوە بۆئەوەی خەڵک بیانبینێت و بەو جوانییە دەگمەنانە سەرسام بن و دڵخۆش بن. ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر لەو تابلۆیانە لە (مۆزەخانەی نیشتیمانیی فەرەنسا) لە پاریس پارێزراون. مۆزەخانەی ناوبراو لە ساڵی ١٨٩٠دا دامەزرا و لە ساڵی ١٨٩٣دا پێشانگەیەکی تەرخانکراوی تەنیا لەبارەی تابلۆی ڕۆژهەڵاتناسەکان پێشکەش کرد.(١٥٦)

### ٥- خولیای زانستی ئەنترۆپۆلۆژی و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی

هەر لە سەدەی دوازدەهەمەوە، دەیان گەڕاڵ و زانا و جوگرافیاناسی ئەورووپایی وەک مارکۆ پۆلۆی ئیتاڵی Marco POLO دەستیان کردبوو بە گەشت و گەڕان بە دنیادا لەپێناو نووسینەوەی جوگرافیای وڵاتان و دەسنیشانکردنی نەخشەی دابەشبوونی نەتەوەکانی سەر زەمین.

لە ماوەی سەدەی بووژانەوە Rennaisanceدا، لەگەڵ پەرەسەندنی ئامانجە سیاسی و عەسکەری و بازرگانی و زانستییەکانی وڵاتانی ئەورووپا، ئەم بایەخدانەی ئەورووپا بە ڕۆژهەڵات، ڕۆژ لەدووای ڕۆژ، رووی لە زیادبوون کرد.

لە سەدەی هەژدەهەم بەملاوە رووسەکانیش کەوتنە فێربوون و دەرس گوتنەوەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە رووسیا، ئنجا پاشان چاپخانەکان بۆ یەکەم جار ئەلفبای عەرەبییان تێکەوت و بەکارهات.(١٥٧) هەنگاوی یەکەم بۆ دامەزراندنی ڕۆژهەڵاتناسی، بۆ نموونە لە رووسیا، دەگەڕێتەوە بۆ چارەگی دووەمی سەدەی هەژدەهەم. ئیدی لە ساڵی ١٧٢٤دا بوو کە ئەکادیمیای زانستی لە پیترسبۆرگ بۆ لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتناسی دامەزرا.(١٥٨) لە ساڵی ١٨١٨شدا ئەکادیمیای زانستیی ئیمپراتۆریەتی رووسی بووە مەڵبەندێکی گرنگی لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتناسی. لە ئاکامدا ناویان نا ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی سەر بە ئاکادیمیای سانت پترسبۆرگ و بووە مەڵبەندێکی کوردناسی لە رووسیا.(١٥٩)

لە فەرەنساش، هەر لە ساڵی ١٥٣٠ بەملاوە، فەرەنسا بەشێوەیەکی رەسمی بایەخی دایە زانستی ڕۆژهەڵاتناسی. لە هەمان ساڵدا کۆلێژی شاهانەی College Royal لە پاریس کرایەوە. زمانی یۆنانی و عیبری و عەرەبیی تێدا دەگوترایەوە.(١٦٠) کتێبی " هەزار و یەک شەو" یش لە سەدەی ١٨مدا تەرجەمەی فەرەنسی کرا و لەلایەن ئەنتوان گالانەوە لیی کۆڵدرایەوە.

بە هەمان شێوە، چەندین دەزگا و ناوەندی زانستیی دیکەی بایەخدان بە ڕۆژهەڵاتناسی لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا لە سەدەی نۆزدەهەمەوە، دامەزران و دەستیان کردە کار. ژاک مۆرگان، ئەلکزەندەر ژابا، بازیل نیکیتین، لێرخ، فلادیمیر مینۆرسکی و... لە ڕۆژهەڵاتناسە هەرە زانا و دڵسۆزەکانی زانستی کوردناسین، کە لەپێناو زانستدا ژیاون و کاریان کردووە.

نموونەی ئەم جۆرە بەرهەمانەی سەدەی حەڤدەهەم، بریتیە لە کتێبەکەی گەڕاڵی ئیتاڵی Valle PIETRO DELLA کە تەرجەمەی زمانی ئەڵمانیش کراوە بە ناونیشانی Reiss-Beschreibung in Unterschiedische Theile der Wett, nehmlich in Turkey, Egypte, Palastin, Persian, لە ژنێف لە ساڵی ١٦٧٤دا، لە ١٠٩٦ لاپەڕەدا، بڵاوکراوەتەوە. لە بەرگی یەکەمی چاپە ئیتاڵییەکەدا لە لاپەڕە ٦٨٦، هەروەها لە بەرگی دووەمدا لە لاپەڕەکانی ٣٦، ٤١، ٤٦، ٥٥، ٥٦، ٧A، ٨A، ١٠A، باسی کورد دەکات.(١٦١)

هەروەها ژان دی ئێڤێنۆت Jean DE THEVENOTTE (١٦٣٣- ١٦٦٧)، لە ١٦٥٥ گەشتێکی ڕۆژهەڵاتی

کردووە. دووەم جار لە ١٦٦٣ هاتۆتە ڕۆژهەڵات. سەفەرنامەکەی، بە ناونیشانی Voyage en Orient لە ١٦٧٤دا لە پاریس چاپ کراوە. نووسەر لە بەشی دووەمی سەفەرنامەکەیدا، لە لاپەڕە ١٠٦ – ١٣٧ لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانەی لەبارەی کورد نووسیوە.

هەر چۆنێک بێ، بواری کوردناسی و بایەخدان بە کورد لەلایەن ئەوروپاییەکانەوە، بێبەش نییە لە ئامانجی زانستیی جۆراوجۆر. گەلێک لێکۆلینەوەی زانستی و ئەنترۆپۆلۆجی و ئەرکیۆلۆجیی ئەکادیمی لەم بوارەدا نووسراون. لێرەدا نموونەیەک لە سەفەرنامەکەی ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی، ئەلفرێد ژاکۆب دەهێنینەوە، کاتێ باسی نەژادی کورد لە بواری زانستی ئەنترۆپۆلۆجیدا دەکات:

«کوردەکان گەلێکی ڕەوەند و سوارچاک و جەڵەبدارن. لە بەشی ڕۆژئاوای وڵاتی فارس، بەشێوەیەکی بنچینەیی لە کوردستان، هەروەها لە ڕۆژهەڵات و باشووری تورکیای ئاسیادا دەژین؛ هەروەها لە سووریا و ئەرمینیاشدا. کوردەکان خۆیان وا تێدەگەن کە بە بنەچە لە مەنگۆلە داگیرکەر و ئۆزبەکەکانەوە کەوتوونەتەوە؛ بەڵام ئەو کوردانە، بەرزیی باڵایان، جوانیی چاوەکانیان، چەماوەیی لووتیان، سپیاتیی پێستیان، هەروەها چوارشانەیی قەدوباڵایان، ئەوە بە درۆ دەخاتەوە کە بە ڕەگەز بگەڕێنەوە سەر تەتەرەکان. بنەچەی کوردان زیاتر لە پارثەکانەوە Parthe نزیکە، ئەو پارثانەی کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا بە سەرتاپای مەڵبەندەکانی سوریاو میزۆپۆتامیادا بڵاوببوونەوە». (١٦٢)

# کەرەستە و ماتێریاڵەکانی لێکۆڵینەوەی کوردناسی

گرنگترین کەرەستە و ماتێریاڵەکانی لێکۆڵینەوەی کوردناسی - کە کوردناسەکان بایەخی پێدەدەن و دەیانکەنە بابەتی لێکۆڵینەوە - ئەمانەن:

### ١- نەژادی کورد و مێژووی کۆنی کوردستان

لەپێشەوەترین کەرەستە و بابەتەکانی لێکۆڵینەوەی کوردناسی، بریتییە لە نەژاد و مێژووی دێرینی کورد؛ هەروەها دەسنیشانکردنی پەیوەندیی نەژادی کورد بە گرووپە ئەتنیکییە کۆنەکانی وەکو کاردۆخی و میدی و گووتی و میتانی و عیّلامی و خالدی و فارسەکانەوە. هەروەها لێکۆڵینەوەی ژیانی کورد و وڵاتی کورد لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتە جۆراوجۆرەکانی ڕۆژهەڵاتدا: لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتەکانی مێدی و ئەرمەنی و ڕۆمانی و هەخامەنشی و ئاشووری و بابلییەکاندا. بەرهەمەکانی هێرۆدۆت و سترابۆن و مینۆرسکی و نیکیتین، لەم بوارەدا شایانی باسن.

بیروبۆچوونی کوردناسەکان لەبارەی نەژادی کورد و مێژووی دێرینی کوردستان یەک نایەتەوە و لەسەر زۆر شت ناکۆکن. بۆ نموونە، نەژادی کورد بە بۆچوونی کوردناسی فەرەنسی، ژۆزێف پیتۆن توورنەفۆرت، دەگەڕێتەوە سەر خالدییەکان.(١٦٣) کەچی بەڕای گالان ـ کە ئەویش هەر فەرەنسییە - دەگەڕێتەوە بۆ پارثەکان.(١٦٤) ئەمە لە کاتێکدا کوردناسی دیکەی وەکو فرێزەری ئینگلیز و بێلانژی و ژۆبێرتی فەرەنسی، کاردۆخەکان بە باپیرەگەورەی کورد دادەنێن.(١٦٥)

### ٢- زمانی کوردی و دیالێکتەکانی

بابەتێکی زۆر گرنگ کە کوردناسەکان دەیکەنە کەرەستەی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان، بریتییە لە زمانی کوردی و دیالێکتە جۆراوجۆرەکانی. کوردناسەکان لەم کارانەدا دەیانەوێ زمانی کوردی و دیالێکتەکانی لە چوارچێوەی زمانە هیندی - ئەوروپاییەکاندا دابنێن و بەراوردی بکەن بە زمانەکانی تر. پەیوەندیی زمانی کۆنی کورد بە زمانی گرووپە ئەتنیکییە کۆنەکانی وەکو کاردۆخی و میدی و گووتی و عیّلامی و هەروەها بە فارسەکانەوە دەسنیشان بکەن. هەروەها کێشەی دیالێکتە کوردییەکان، بەتایبەتی کێشەی دیالێکتی گۆرانی و لوڕی و زازایی یەکێکە لەو گیروگرفتانەی تاکو ئێستا بەتەواوەتی چارە نەکراوە. کۆنترین سەرچاوە بۆ یەکەم جار لە مێژوودا ئاماژەی بۆ زمانی کوردی کردبێت، کتێبەکەی فەیلەسووفی یۆنانی ئێگزێنۆفۆنە Exenophon، بە ناوی ئاناباز Anabase، کە ٤٠١ ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح نووسراوە. ئێگزێنێفۆن کاتێ دەگاتە ناو کاردۆخەکان Cardouques ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە چەکدارە یۆنانییەکان لەڕێگای وەرگێڕێکەوە قسەیان لەگەڵ کاردۆخەکان کردووە:

ئێگزێنۆفۆن زمانناسێکی لەگەڵ خۆی برد بۆ لایان، بۆئەوەی شەڕەکە رابگرێت و ئاشتی بەرقەرار ببێت. هەروەها داوای لاشە کوژراوەکانیشی لێیان کرد. کاردۆخەکان رایانگەیاند کە لاشەی کوژراوەکان بەو مەرجە دەدەنەوە ئەگەر ئەوانیش دەست لە سووتاندنی خانووەکانیان هەڵگرن.(١٦٦)

دووای ئێگزەنەفۆن، لە سەدەی دەیەمدا، زانای عەرەب، ئەلتەننووخی، ناوی "لسان الاکراد"ی هێناوە و شتێکی لەبارەی زمانی کوردییەوە گوتووە.(١٦٧)

پاشان ئەولیا چەلەبی، لە کتێبی سیاحەتنامەکەیدا، لە ساڵی ١٦٥٥دا، هەندێ تێبینیی بەپەلەی لەبارەی زمانی کوردی و لەهجەکانی زمانی کوردی نووسیوە.(١٦٨)

سەرچاوەیەکی دیکەی کوردناسی بریتییە لە کتێبەکەی رۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی، پیەترۆ دیللا ڤالله کە لە سەدەی ١٧دا باسی زمانی کوردیی کردووە؛ دەڵێ: "کوردەکان زمانی تایبەتی خۆیان هەیە و زمانەکەیان لە زمانی دراوسێ عەرەب و عەجەمەکانیان ناچی".(١٦٩)

یەکەمین کتێبی تەرخانکراویش لەبارەی زمانی کوردی لەلایەن کوردناسێکەوە نووسرابێ بریتییە لە کتێبەکەی گارزۆنی، کە لە ساڵی ١٧٨٧ لە رۆما بە زمانی ئیتاڵی چاپ کراوە.

یەکێک لە رۆژهەڵاتناسە ئیتاڵییەکان کە لە ١٦٨٢دا ماوەیەک لە دەوروبەری مووسڵ لەگەڵ کاپووسانە پیاوە مەسیحییەکاندا ژیاوە، دەڵێ: "ئێمە لە کاتی پێویستدا دەمانتوانی بەئاسانی خۆمان فێری زمانی کوردی بکەین، ئەمەش لەرێگای بەکارهێنانی قامووس و کتێبی رێزمانی کوردییەوە کە لای ئەو ئابی پیرە مەسیحییانەدا دەست دەکەوتن. دەمانبینین، پیشانیان دەداین. چونکە ئەوان لە رێگای چوونە ناو خەڵکەوە باش فێری زمانەکە ببوون.(١٧٠) بە رای ئێمە، ئەم قامووس و کتێبە رێزمانییانەی لە ساڵی ١٦٨٢دا کە بە زمانی کوردی نووسراون، نابێ بە ئەلفابێی عەرەبیی ئەمرۆ نووسرابن؛ پێویستە لەو ئارشیفخانە و دۆکیوومەنت خانە کۆنانەدا بۆیان بگەرێین کە بە ئەلفابێی سریانی و ئەرمەنی نووسراون. ئەمەش لەبەرئەوەی کە لەو سەردەمەدا و لەو ناوچەیەدا زیاتر ئەلفابێی سریانی و ئەرمەنی بەکاردەهات؛ بەتایبەتیش لەلایەن پیاوە دینییە مەسیحییەکانەوە. کوردناسی فەرەنسی، تۆما بوا T. BOIS لەم بارەیەوە دەڵێ: «ئەم کتێبانە تاکو ئێستا بڵاونەکراونەتەوە، لەوانەشە فەوتابن».(١٧١)

چەند بەرهەمێکی دیکە:

- ڤۆن هەمەری نەمسایی، لە ساڵی ١٨١٤دا باسێکی لەسەر زمانی کوردی و شێوە جۆراوجۆرەکانی نووسیوە و لە ڤیەننا بڵاوکراوەتەوە.
- نەمساییەکی دیکە، ڤۆن کلاپرۆت لە ١٨٨٨دا لە ڤیەننا لەسەر وشە لە زمانی کوردیدا باسێکی بڵاوکردۆتەوە.

هەروەها لێکۆڵینەوە گرنگەکانی فرێدریک میوولەری نەمسایی لەبارەی دیالێکتەکانی کوردی شایانی باسن.(١٧٢)

### ٣- کەرەستەی ئەتنۆگرافی و ئارکیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی

جلوبەرگی کوردی (جلوبەرگی ژنان و پیاوان)، زێر و خشڵ و ئامرازەکانی دیکەی ئارایشت و خۆرازاندنەوەی ئافرەتان، خەنجەر و چەک و ئامرازەکانی شەر و جەنگ، ئامرازەکانی کشتوکاڵ و پیشە دەستییەکان و پیشەسازییەکان... بە کورتی هەموو ماتێریاڵ و کەرەستە ئەتنۆگرافییەکانی وڵاتی کوردەواری، مەیدانێکی گرنگ و بابەتێکی گرنگی دیکەیە کە کوردناسەکان لێی دەکۆڵنەوە.

شلێڤڵ SCHLAFEL زانایەکی ئەڵمانیی ئیتنۆگراف بووە، کتێبێکی گرنگی لەبارەی ئیتنۆگرافیای کوردستان نووسیوە و لە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٦٣دا بڵاوکراوەتەوە.(١٧٣)

مەبەست لە کۆکردنەوە و بایەخدان بەو کەرەستانە، هەندێ جار ناسین و ناساندنی کولتووری کوردەواری بووە لە بواری لێکۆڵینەوە ئەتنۆگرافی و ئەنترۆپۆلۆژییەکانەوە کە لەلایەن دەزگایەکی حکوومییەوە یان لەلایەن ئامۆژگایەکی زانستییەوە ئەنجام دەدرێن.

مەیدانێکی گرنگی دیکە کە کوردناسەکان لێی دەکۆڵنەوە، بریتییە لە کەرەستە و ماتێریاڵە دێرینەکانی کوردستان، دێرین بە واتای ئارکاییک Archaique، کە ماتێریاڵ و کەرەستە دروستکراوەکانی سەردەمە دێرینەکانی پێش زاینی مەسیح تاکو سەدەکانی ناوەڕاست دەگرێتەوە. کەرەستە و ماتێریاڵەکانی شارستانیەتی ئەکەدی و سۆمەری و بابلی و عێلامی و گووتی و ئاشووری و مێدی و هەخامەنشی و سەلجووقێییەکان، بۆ نموونە، بابەتی هەرە گرنگن کە کوردناسەکان لێی دەکۆڵنەوە. ئامانجیان لەم کارە: لێکۆڵینەی ئیتنی و زانستییە. بە دووای شارستانیەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا دەگەڕێن و بەراوردیان دەکەن لەگەڵ یەکتر و لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەنترۆبۆلۆژییەوە سوودیان لێ دەبینن. ئەمڕۆ بەشێکی فراوانی ئەم کەرەستە و ماتێریالانە لە مۆزەخانەی پایتەختەکانی ئەورووپادا پارێزراون. ئەم دوو کتێبەی خوارەوە سەرچاوەی دیاری ئەم باسەن:

G. CAMDANIL: Storia della regione di Kurdistan della, Napoli: 1818.– بە زمانی ئیتالییە، باسی مێژرووی کوردستان و ئارکیۆلۆژیای کوردستان دەکات.

R. BRAIDWOOD and B. HOWE: Prehistoric investigations in Iraqi Kurdistan, Chicago: 1960.

### ٤- ئارشیتێکتووری کوردستان

شێوە و شێواز و تەکنیکی بتیاتنان (میعمار Architecture) لە کوردستانی دێرین و سەدەکانی رابردوودا (بنیاتنانی مزگەوت و خانووبەرە و قەڵاکان)، تایبەتمەندێتیی ئارشیتێکتوور و ئەندازیاریی بنیاتنان لە کوردستاندا، بەراوردکردنی لەگەڵ ئارشیتێکتووری میللەتانی دیکە، هەروەها نیشاندانی ئەو تایبەتمەندی و جوانییە نەتەوەیییەی وڵاتی کورد مەیدانێکی گرنگی دیکەیە کە کوردناسەکان لێی دەکۆڵنەوە.

بەرهەمەکانی مۆڵتکەی ئەڵمانی نموونەی بەرهەمی جوانی ئەم بوارەن. هەروەها ئەم بەرهەمانەش:

Jaques de MORGAN: Maison scintifique ( Etudes archeologiques), 7 Volumes, Paris: 1898- 1902–
-NIEBUHR: Reisebeschreibung nach Arabien und anderen umliegenden Laender, Teil II ( Die Kurden), 1766.

گەلێ نیگاری جوان و نەخشەی ئارکیۆلۆژییان لەگەڵە.

مامۆستا عیسمەت شەریف وانلی، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە زانا موسڵمانەکان هەر لە سەدەی دەیەمی زایینەوە باسی شێواز و تەکنیکی بنیاتنانیان لە کوردستانی دێریندا کردووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کورد پێش سەردەمی ئیسلام ئارشیتێکتوور و بیناسازیی خۆی هەبووە. پێش سەردەمی ئیسلام شارستان بووە و شاری خۆی هەبووە.[١٧٤]

ژان - باپتیست تاڤێرنێ Jean- Baptiste TAVERNIER لە لاپەڕە ٢٤٧ی سەفەرنامەکەیدا، کاتێ لە مووسڵەوە بەرەو هەولێر بەڕێ دەکەوێ، دەڵێ: «رۆیشتین، گەیشتینە رووبارێکی دیکە بەناوی زابی گەورە. بەسەر پردی رووبارەکەدا پەڕینەوە؛ ئەو پردەی کە بە بیست و نۆ قەنتەرەی بەردین Arcade دروست کرابوو. دەیانگوت کە ئەسکەندەری گەورە ئەم پردەی دروست کردووە. بۆ ئەوەی خۆی و لەشکرەکەی بتوانن بەسەریدا بپەڕنەوە و هێرش ببەنە سەر داریووش». (ل ٢٦٠-٢٦١).

«... گەیشتینە دەشتێکی خۆش و هەراو، پڕ لە دارو درەختی میوە بوو. ئەو دەشتە دەشتی ئاربیل Arbeles بوو. ئەو شوێنەی کە ئەسکەندەری گەورە داریووشی تێدا شکاند». «ئەو دەشتە، پانایییەکەی نزیکەی پانزدە فرسەخ

بوو، چەندین جۆگەلە و زێباری دەچووە سەر. لە ناوەڕاستی ئەو دەشتەدا چیایەکی بچکۆلانە، کە نیوە تیرەکەی -Cir cuit نزیکەی نیو فرسەخ بوو، قوت ببۆوە، ئەو شاخە سەرتاپا بە داربەڕووی یەکجار قەشەنگ داپۆشرابوو، کە من پێشتر هەرگیز داربەڕووی هێندە قەشەنگم نەدیبوو. لەژێر کەلاوەکانیشەوە قەڵایەکی بەرز قوت ببۆوە؛ ئەم قەڵایە «خەسڵەت و نیشانەکانی، ئەوەیان پیشان دەدا کە وەختی خۆی عیمارەتێکی Editice گەلێک قەشەنگ بووە»- (ل ٢٦١). [١٧٥]

## ٥- نەخشەی جوگرافی و دیاریکردنی جوگرافیای سیاسیی کوردستان

شارەزایی و ئاگاداریمان لەبارەی جوگرافیای هەر وڵاتێک، دەتوانی ببێتە هوشیارییەکی سیاسی و ئایدیۆلۆژی، لە ئاکامدا ئەم شارەزایی و ئاگادارییە ببێتە ئامرازێکی دەسەڵات پەیداکردن بەسەر ئەو وڵاتەدا. لەسەر ئەم بنچینەیەوە، کوردناسەکان بایەخیان بە بڵاوکردنەوە و لێکۆڵینەوەی نەخشەی جوگرافیی کوردستان دەدا: جوگرافیای سیاسی، جوگرافیای کانزایی، جوگرافیای کشتوکاڵی، جوگرافیای مێژوویی، جوگرافیای ئارکیۆلۆژی.. هتد.

کوردستان لەو نەخشە جوگرافییانەی کە لە لایەن کوردناسەکانەوە بڵاوکراونەتەوە، هەمیشە لکاوەتە ئیمپراتۆریەت یان دەوڵەتێکی زلهێزەوە (ئیمپراتۆریەتی ئاشووری، ئەرمەنی، هەخامەنشی، یان دەوڵەتی عوسمانی، ساسانی، سەلجووقی، قاجاری.. هتد). لە نەخشە کۆنەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا کوردستان زۆر بە دەگمەن وەک وڵاتێکی سەربەخۆ ناوی هاتووە.

یەکەم نەخشەی جوگرافی کە کورد وەک نەتەوەیەک تێدا ناوی هاتبێ بریتییە لە نەخشەیەکی جوگرافیاناسی موسڵمان (ابن حوقل) کە لەساڵی ٩٧٧دا لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی صورة الارض ناوچەیەکی بەرفراوانی هەرێمی چیای (اقليم الجبال)ی ناوناوە (حشاتی الاکراد و مصایفهم). [١٧٦]

پاشان، نەخشەیەکی دیکەی جوگرافی کە تێیدا کوردستان وەک وڵاتێک پیشاندرابێت بریتییە لە نەخشەیەکی جوگرافیاناسی عوسمانلی، محمود الغشقری (کاشغەری)، کە لە ساڵی ١٠٧٦دا لە کتێبێکدا بە زمانی عوسمانی بە ناونیشانی (دیوان لغات الترک) بڵاوی کردۆتەوە. لەو نەخشەیەدا کە لەبارەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا دروستی کردووە ناوی کوردستانی بە (ارض الاکراد) هێناوە. لە کوردەکانیش یەکەمین کەس شەریف پاشا (١٨٦٤ـ ١٩٤٦) بووە کە لە ساڵی ١٩١٩دا نەخشەیەکی کوردستانی گەورەی پێشکەش بە کۆنفرانسی ئاشتی کردووە لە پاریس بۆ داخوازیی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ. [١٧٧]

د. کەمال مەزهەر لە کتێبی کردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولي، تەرجەمەی محەمەدی مەلا کەریم، چاپی بەغدا، لە لاپەڕە ٤٧ و ٤٨ و ٥١ دا چەند سەرچاوەیەکی دیکەی کوردناسیمان بۆ دەسنیشان دەکا کە نەخشەی کوردستانی تێدایە و باس لە نەخشەی جوگرافیی وڵاتی کورد دەکا.

لە کتێبخانەی نیشتیمانی فەرەنساش لە پاریس، زیاتر لە ٥٠ نەخشەی جوگرافیی جۆراوجۆری کوردستان، کە لە لایەن کوردناسە ئەڵمانی و رووسی و فەرەنسییەکانی وەک H. KIEPERT و SPIEGAL و KHANZADIAN و ڤ. ئا. کارتشیف لە سەرەتای سەدەی ١٩مدا دروست کراون، پارێزراون.

هەروەها دیاریکردنی جوگرافیای سیاسیی کوردستان، لە کۆنەوە بابەتێکی گرنگی لێکۆڵینەوەی کوردناسەکان بووە. با بۆ نموونە، چەند دێڕێکی مارکۆ پۆلۆ بخوێنینەوە، بزانین، لەبارەی نەخشەی جوگرافیای سیاسیی کوردستان و سنووری سیاسیی ئەوکاتەی کوردستان چیمان پێدەڵێ:

له وڵاتی پێرسدا هەشت میرنشین Rayaume هەن: چونکە وڵاتێکی زۆر فراوانە. ئێستا ناوەکانیان دەژمێرم. یەکەمیان کە لێرەوە دەست پێدەکا ناوی قەزوینە. دووەمیان دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵات ناوی کوردستانە Courdistan. سێیەمیان لوڕستان. چوارەم شوولستان Cielistan. پێنجەم ئەسفەهان. شەشەم شیراز. حەوتەم شەبانکارە -Son cara. هەشتەم Tunocain.(١٧٨)

کەواتە ئەو کوردستانەی لەسەر نەخشەی سیاسیی گەشتەکەی مارکۆ پۆلۆدا دەبینرێت (ساڵانی ١٢٧٠) کوردستانی گەورە نییە، بەڵکو بریتییە لەو ئوستانەی کە سوڵتان سەنجاری سەلجووقی لە ساڵی ١١٥٠دا لە باشووری ڕۆژئاوای کوردستاندا دروستی کردبوو. واتە کورد لە ویلایەتی دیکەشدا هەبوونە و لە شوێنی دیکەشدا بوون و ژیانیان هەبووە. بۆیەش دەبینین، مارکۆ پۆلۆ، جگە لەم ئوستانی کوردستانە، لە شوێنی دیکەشدا ناوی کورد دەهێنێ و باسی نەژادی کورد دەکات، بۆ نموونە لە باسکردنی ویلایەتی مووسڵدا، کە ئەو کاتە لەژێر چنگی ئیمپراتۆریەتی مەنگۆلیدا بووە.(١٧٩)

هەروەها جوگرافیاناسی ئەڵمانی ئادام ئۆلێریۆس، لە سەفەرنامەکەی خۆیدا کە تەرجەمەی فەرەنسی کراوە و لە ١٦٦٦دا لە پاریس چاپ کراوە، بەفراوانی و زۆر بەوردبینی و بەبایەخەوە لە جوگرافیای سیاسیی کوردستانی ساڵانی ١٦٠٠ی کۆڵیوەتەوە.(١٨٠)

ئەم دوو سەرچاوەیەش چەند نەخشەیەکی گرنگیان تێدایە لەبارەی جوگرافیای سیاسیی کوردستان:

1- BERGER, J. : Anatolien, Georgien, Armenien, Kurdistan, Irak und Al. Dschesira, 1799.

بە ئەڵمانییە، گەلێ نیگاری جوانی تێدایە و دوو نەخشەشی لەگەڵە.

2- Heinrich KIEPERT: Nouvelle carte generale des provinces asiatiques .de l Empire Ottoman, Berlin: 1884.

بە ئەڵمانییە کراوەتە فەرەنسی. زیاتر لە ١٠ نەخشەی جۆراوجۆر لەبارەی کوردستان لەم کتێبەدا بڵاوکراوەتەوە.

### ٦- وێنە و نیگار، گراڤوور Gravure

ئەسکەندەری مەکەدۆنی وەک سیاسی و جیهانگیر و سەرۆک لەشکرێک، دوای سەرکەوتنە گەورەکەی بەسەر داریووش پاشای هەخامەنشی لە شەڕی Arbellasدا و دووای داگیرکردنی کوردستان، لە ساڵی ٣٣١ ی پێش زاینی مەسیح بەمەلاوە، وای کرد کە سەرنجی هەموو دنیا - بە هونەرمەندان و نیگارکێشەکانیشەوە - بۆ بایەخی کوردستان رابکێشێت و ناوی ئەربێل Arbelle یان ئەربێللا Arbella، لە ئەنجامی جەنگی ئەربێللا یان جەنگی گۆگامێل (زیۆس)، بکەوێتە ناو بەڵگەنامە هونەری و مێژووییەکانی ئەورووپاوە.

ئەم جەنگەی نێوان ئەسکەندەری مەکەدۆنی و داریووش پاشای هەخامەنشی لە ساڵی ٣٣١ی پێش زایینی مەسیح، کە بە سەرکەوتنی ئەسکەندەر کۆتایی هات، بە یەکەم سەرکەوتنی ئەورووپا لەقەڵەم دەدرێت دژ بە ڕۆژهەڵات: یەکەم جەنگی سمبوولیی نێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات بوو کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە.(١٨١)

ئەم سەرکەوتنە سیاسی و عەسکەری و سمبوولییەی ئەورووپا بەسەر ڕۆژهەڵات، لە جەنگی ئەربێللادا، لای هونەرمەند و مێژوونووس و ڕووناکبیر و سیاسییەکانی ئەورووپای سەدەکانی رابردوو، تەنانەت لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا (القرون الوسطى) هێندە گرنگ و بایەخدار بوو کە بیر و ناوەڕۆکەکەی، لەو سەردەمەدا، بووە مایەی سروش و بەهرەوەرگرتن بۆ نووسینی چەندین داستان و شانۆنامە و بابەتی هونەریی دیکە؛ تەنانەت لە هونەری ڕەسم و شێوەکاری و پەیکەرتاشیشدا ڕەنگی دایەوە. بۆ شانازیکردن بەم سەرکەوتنە، هەروەها بۆ زندووکردنەوە و

تەمــجـیـدکــردنی ئەم ســەرکــەوتنەی ئەسکەندەری ڕۆژئـاوا بەســەر داریـوش پاشـای هەخـامــەنشـیـی ڕۆژهەڵات، نیگارکێشەکان دەستیانکرد بە دەرخستنی مەغزا و ناوەڕۆک و واتاکانی ئەم جەنگە دێرینە. تا ئێستا، هێندەی ئێمە ئاگـادار بین، چوار نـیگارکـێـشی ئەورووپایی ناوەڕۆکی جەنگی ئەربێللایـان، وەک شـانـازییـەکی ڕۆژئاوا، لە شـەش تابلۆ و دیواربەندی هونەریی گـەورەدا ڕەسم کـردووە. ئەمـڕۆ لە مـۆزەخـانـەکـانی فـەرەنسـا و ئەڵمـانـیـا و ئیـتـالـیـا پارێزراون.[١٨٢] بەم شێوەیە، ڕەنگدانەوەی جەنگی ئەربێللا و سەرکەوتنی ئەسکەندەری مەکەدۆنی لە ئەدەبیات و هونەری نیگارکێشان و تابلۆی ڕۆژئاوادا تەکانێکی گەورەی بەخشییە ناساندنی وڵاتی کورد بە ڕۆژئاوا.[١٨٣]

لە کـۆتـاییـدا پێـویسـتــە بڵـێـین. ئەگـەر لێکـۆڵـینەوەکـانی ڕۆژهەڵاتناسی پەیوەندییـەکی پتـەوی بە ئامـانج و بەرژەوەندییە سیـاسییـەکانی وڵاتانی ئەورووپاوە هەبێ " وەک گەلێ جاران باسی لێدەکری "، ئەوا نیگار و تابلۆی هونەرمەندە ئەورووپییـەکان لەبارەی ڕۆژهەڵات، زۆربەی جاران بەپێچەوانەوە: پێویستە بە چاوی ڕێزەوە سەیریان بکرێت و وەک بەهایەکی ئێسـتـەتیکی و شـارسـتـانی لێـیـان بکۆڵدرێتـەوە. بەتـایبـەتیش لەبەرئەوەی ئامـانجی ڕەسـمکردنی وڵاتانی ڕۆژهەڵات لەلایەن نیگارکـێـشە ئەورووپییـەکـانەوە، ئەگـەرچی هاوکـات بووە لەگـەڵ ئامـانجـە سیاسییەکانی وڵاتە زلهێزەکانی ئەوسای ئەورووپا، بەڵام لە هەمـان کاتدا ئەم بەرهەمە هونەرییانە، ئەمڕۆ بۆ ئێمە دەبنە چەند بەڵگەنامەیەکی گرنگ و خزمەتی نووسینەوەی مێژووی نەتەوەکەمان دەکەن.

ڕەسمکردنی دیاردە و بابەتەکانی ڕۆژهەڵات لەلایەن نیگارکێشە ئەورووپییەکانەوە، لە سەدەی نۆزدەهەمدا ببووە قوتابخانە و ڕەوتێکی هونەریی سەربەخۆ بە ناوی Orientaliste.[١٨٤]

ئەو نیگارکێشە ڕۆژهەڵاتناسانە، گرنگتـرینیـان ئەمـانەن: نیگارکێشی ڕۆمانسیی فەرەنسی، یۆژێن دی لاکرِوا، نیگارکێشی ریالیستی فەرەنسی، ژێریکۆڵت، نیگارکێشی ریالیستی ئینگلیز، جۆن فرێدریک لویس، نیگارکێشی ریالیستی نەمسـایی، شارل وێلدا، نیگارکێشی ناپۆلسێ، تۆماس ئیرنست، نیگارکێشی ریالیستی فەرەنسی، ژین لۆم ژیرۆم، نـیگارکـێـشی ئینگلیـزی سـەردەمی ڤـیکـتـۆری، جـاسـێـریۆ، نیگـارکـێـشی ڕۆمـانسـیی ئێنگلیـز، ئۆجین فرۆمێـنـتێن.[١٨٥]

پێویستە پەنجەنومای ئەو ڕاستییەش بکەین، کە لە بواری ئێستەتیکی و داهێنانی هونەرییەوە، لای نیگارکێشە گەراڵ و ڕۆژهەڵاتناسەکان، دوو جۆر بەرهەمی نیگارکێشان دەبینین:

یەکـەمـیـان: ئـەو تابلۆیـانەن کـە بێ هیچ مـەبەسـتـێکی سـیـاسی یان عـەسکەری یان ڕاگـەیاندن ڕەسم کـراون؛ مەبەستیان تەنیا دەربڕینی جوانییەکی مرۆڤایەتی یان بەهایەکی فیکری و هونەری بووە (وەک تابلۆکانی ژێرکۆڵت و ژێریکۆ و دی لا کرِوا و ڕێنوار و جاسێریۆ و لیۆن کۆمێری).

دووەمین جۆریش: ئەو تابلۆیانەن کە مەبەستیان ڕوونکردنەوەیەکی رووکەشانە بووە – کە بە زمانە ئەورووپییـەکان پێیی دەڵێن وێنەی ڕوونکردنەوە Illustration، ئامـانجیان ئەوە بووە کە بەشێوەیەکی رووکەش لایەنێکی دیاریکراو لە ژیان و شارستانیەتی وڵاتێک یان میللەتێک یان گرووپێکی ئەتنیکی یان دینی پیشانی خەڵکی ڕۆژئاوا بدەن.

زۆربەی ئەو تابلۆیانەی کە لەبارەی گەلی کوردەوە ڕەسم کراون دەچنە خانەی ئەم جۆرەی دووەمەوە: تەنیا وێنەی " کچی کافرۆش " و چەند تابلۆیەکی دیکەی وەکو " جەنگی ئەربێللا " نەبێ.[١٨٦]

ئەم کتێبە گەلێ وێنەی جوانی لەبارەی کورد تێدایە:

BERGER, J. : Anatolien, Georgien, Armenien, Kurdistan, Irak und Al. Dschesira, 1799.

**٧- کولتووری نەتەوەیی: مۆسیقا، فۆلکلۆر، ئەدەبیات**

ئەدەبیاتی میللی (بە پەندی پێشینان و مەتەڵ و مۆسیقا و گۆرانیشەوە)، شیعری شاعیرانی سەردەمی کۆن، چیرۆکی فۆلکلۆری، تێکستی دینی، مەولوودنامە، داستانی شیعری... هتد؛ هەموو ئەمانە ماتێریاڵ و بابەتی بایەخدان و لێکۆڵینەوەن لای کوردناسەکان.[١٨٧]

نیکیتین NIKITINE و ئەلکزەندەر ژابا JABA و ئۆسکارمان OSKARMAN و تۆما بوا ناودارترین ئەو کوردناسانەن کە بایەخیان دابێتە ئەم بوارە.[١٨٨] هەروەها بڕوانە:

Von Bodenstedt Friedrich Martin: Lieder aus Kurdistan, in T. T. , Berlin: 1849 باسێکی زانستییە لەبارەی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی.

هەندێ لە کوردناسەکان ئەو بابەت و کەرەستانەیان تەنیا کۆکردوونەتەوە، وەک ئۆسکارمانی ئەڵمانی، هەندێکی دیکەش هەم کۆیان کردوونەتەوە و هەم لێکۆڵینەوەیان لەسەر نووسیوە، وەک نیکیتین و رۆژە لسکۆ و تۆما بوا.

مەبەست لە کۆکردنەوەی ئەو تێکستانە، هەندێ جار ناسین و ناساندنی کولتووری کوردەواری بووە لەپێناو لێکۆڵینەوەی زانستی لەلایەن دەزگایەکی حکوومییەوە یان لەلایەن ئامۆژگایەکی زانستییەوە. ئەلکزەندەر ژابا JABA، بۆ نموونە، لە ماوەی سالانی ١٨٣٦ - ١٨٦٩دا، کاتێ قونسولی رووسی بووە لە وڵاتی عوسمانیدا، لەلایەن ئەکادیمیای باڵای زانستیی سانت پێترسبۆرگەوە لە رووسیا (لە رێگەی رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانییەوە، بێرنهاردت دۆرن DORN ١٨٠٥ - ١٨٨١) داخوازیی لێ دەکرێ کە کۆمەڵێک دەسنووسی کوردی کۆبکاتەوە و چەند لێکۆڵینەوەیەک لەسەر کولتوور و زمان و ئەدەبیاتی کوردی بنووسێ. بۆ ئەم مەبەستە، ئەلکزەندەر ژابا ٤٤ تێکستی کوردی کۆدەکاتەوە و ئێستا هەموویان لە ئارشیفخانەی سانت پیترسبۆرگدا پارێزراون.[١٨٩]

**٨- دین و مەزهەبەکانی**

کورد لە باری دینەوە، سەر بە دین و دینزا و مەزهەبی جۆراوجۆر بووە: زەردەشتی، مانەوی، جوولەکە، مەسیحی، یەزیدی، موسڵمان (شیعە و سوننی)، ئەهلی حەق. هەر یەکێک لەم دین و دینزایانە بابەت و کەرەستەی لێکۆڵینەوەی کوردناسێک بووە.

مۆژدەگارە مەسیحییەکان Missionnaires دەستەیەکی کوردناسە رۆژئاواییەکانن کە بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەی دینی مەسیح و بڵاوکردنەوەی لە کوردستاندا هاتوونەتە کوردستان. ئەمەش لەنێوان سەدەی ١٢ و ١٣مەوە دەستی پێکرد.[١٩٠]

رابی داڤید Rabbi David D Beth Hillel (لە ١٨٤٦ لە کەلکەتا مردووە) خەڵکی لیتوانیایە، لە ١٨٢٤ سەفەرەکی بەرەو کوردستان کردووە و لە ١٨٣٢ لە شاری مەدراس Madras لە هیندستان سەفەرنامەکەی خۆی بە ناونیشانی: The Travels of Rabbi David D Beth Hille from Jerusalem throgh Arabia, Koordistan to Madras: چاپ کردووە و تێیدا باسی سەرتاپای دین و دینزاکانی هەموو کوردستان دەکات، بەتایبەت ئەهلی حەق و جوولەکە و یەزیدی. هەروەها ئاماژە بەوە دەدات کە سیناگۆگەکانی دیاربەکر دەسنووسی هەشت سەد ساڵ پێشتریان لەلابووە.[١٩١]

یەکێک لەو پیاوە مەسیحیانەی Capussin کە سەفەرنامەکەی خۆی لە ساڵی ١٦٧١دا لە شاری لیۆن لە فەرەنسا، بە ناونیشانی (پەیوەندییە تازەکانی رۆژهەڵات Relations Nouvelles du Levant) بۆمان جێ هێشتووە

ناوی Piere Gabriel DE CHINON بووە. ناوبراو لەو سەفەرنامە ١٥٠ لاپەڕەییەدا باسی Curdistan و داب و نەریت و دین و ژیانی سیاسیی گەلانی فارس و ئەرمەن و گورجی و لەوانە کوردیش Curde دەکا. هەروەها باسی زەردەشتییەت و شیعەگەری و ئیسلام لە سەردەمی شاعەبباسی سەفەویدا.(١٩٢)

ئەم بیبلیۆگرافیایەی خوارەوە، کە بریتییە لە زیاتر لە ٢٥٠ سەرچاوە و کتێب بە هەموو زمانەکان – لە کۆنەوە تا ناوەڕاستی ئەم سەدەیە – لەبارەی مەزهەبی یەزیدی، رادەی بایەخدانی ئەورووپاییەکانمان بۆ روون دەکاتەوە بە دینی یەزیدی لە کوردستاندا:

– گورگیس عواد: المراجع عن اليزيدية، مجلة المشرق، مجلد: ٦٣، بيروت: ١٩٦٩، ص ٦٧٢ـ ٧١٩.

**٩- دەستنووس**

پاراستنی کۆنینە و کۆکردنەوەی کەشکۆڵ و بە ئارشیف کردن خولیایەکی ئەورووپییە، کورد تاقەت و زیرەکی و خولیای ئەم بەزمەی قەت نەبووە.

یەکێک لە گرنگترین ماتێریاڵەکانی کوردناسی بریتییە لە دەستنووس. ئەوانیش دوو جۆرن:

یەکەمیان: دەستنووسە بێگانەکان. ئەو دەستنووسانەن کە لە سەدە کۆنەکانەوە بە زمانەکانی غەیرە کوردی لەلایەن بێگانەوە نووسراون و باس لە کورد و وڵاتی کوردەوە دەکەن.

دووەم جۆریش: دەستنووسە کوردییەکان، کە بەرواری نووسینەوەیان جۆراوجۆرە: لە سەدەکانی پازدەهەمەوە – هەندێکیان کۆنتریشن – تا سەرەتای ئەم سەدەیە.

ئەم دەستنووسە کوردییانە، کە زۆربەیان بە دیالێکتی کرمانجی بوونە، یان بە ئەلفبای ئەرمەنی و سریانی، هەندێکیشیان بە دیالێکتی گۆرانی؛ کوردناسەکان کۆیان کردوونەتەوە و ساغیان کردوونەتەوە و لەسەریان نووسیوە، برێکیشیان لێ بڵاو کردۆتەوە. ئەم دەستنووسانە، لە سەدەکانی کۆنەوە تا ئێستا، لە کتێبخانە جۆراوجۆرەکانی ڤینیز و رۆما و ڤاتیکان ـ لە ئیتاڵیا، سانت پیترسبۆرگ و مۆسکۆ ـ لە رووسیا، ماتێنەدەران لە ئەرمەنستان، ڤێرسای و لیۆن و پاریس ـ لە فەرەنسا، بەرلین ـ لە ئەڵمانیا.. پارێزراون.

کوردناسی فەرەنسی، تۆما بوا Th. BOIS، دەڵێ:

وەفدی راهیبە دۆمینیکییەکان و وەفدی مارکیز دوو نوانتێل DE Nointel لەساڵانی ١٦٧١ و ١٦٧٣دا کۆمەڵێک دەستنووسی رۆژهەڵاتییان هێنایە وڵاتانی ئەورووپا و بەتایبەتیش فەرەنسا؛ ئنجا پاشان زاناکان کەوتنە لێکۆڵینەوە و چاپکردنیان، پاشان وردە وردە کەوتنە سەر فێربوونی ئەو زمانە رۆژهەڵاتییانە لەوانە کوردیش.(١٩٣)

لە بارەی دەستنووسەکانی وڵاتی رووسیاش :" رەنگە تاکە تاکە دەستنووسی کوردی لە نامەخانە گشتی و زانستگا و ئەکادیمیاکانی کۆمارەکانی قەفقاس و ئەرمەنستان و ئازەربایجان و گورجستان و تاشقەندی پایتەختی ئوزبەکستانی ئاسیای ناوەڕاست چنگ بکەون، زیاتریش دەستنووسی عەرەبی و فارسی و تورکی کە باسی کوردییان تێدا بێ، بەڵام کۆمەڵێک دەستنووسی کوردیی بەنرخ لە شاری سانت پەترسبۆرگ ـ لە رووسیا، لە دوو دەزگای زانستیدا پارێزراون:

ئەلیف – بەشی دەستنووس لە نامەخانەی گشتیی شاری سانت پەترسبۆرگ. کۆکراوەی ئێرە بریتییە لە ٥٤ دەستنووس، لەمانە ٤٤ی بە زمانی کوردییە، ٤ ی بە فارسییە، ٣ ی بە تورکییە. ئەم دەستنووسانە لەلایەن ئەلێکسەندەر ژابا، قونسوڵی رووس لە وڵاتی عوسمانیدا (لە ئەرزەڕۆم و ئیزمیر ١٨٣٦ – ١٨٦٩)، بە هاوکاری و

یارمەتیدانی مەلا مەحمودی بایەزیدی، لەسەر داخوازیی کارگێڕی مۆزەخانەی ئاسیا (لە دوواییدا ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی) ب. ئا. دۆرن کۆکراونەتەوە.

بێ – بەشی دەسنووس لە نامەخانەی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیای زانستی، زۆربەی دەسنووسەکانی ئەم دەزگا زانستییە لە کۆکراوەکانی ژابایە، بە هاوکاری و یارمەتیدانی مەلا مەحمودی بایەزیدی.

جگە لە ژابا، مارتن هارتمان و ڤیلیامینۆف زیرنۆڤا دەوری بالایان هەبووە لەپێناو دەوڵەمەندکردنی ئەم دەزگایە بە دەسنووسی کوردی. ناوەڕۆکی ئەم دەسنووسانە لەبابەت ئەدەبی میللی و چیرۆکی شیعریی وەکو ئەسکەندەرنامە و لەیلا و مەجنوون و هیی تر بە دیالێکتی گۆرانی و گۆڕینی گوڵستانی سەعدی و بە دیالێکتی کرمانجی خواروو و گەلێ لێکۆڵینەوەی تر.[١٩٤]

لە ئەلمانیاش، د. کەمال فوئاد لە ساڵی ١٩٧٠دا باسێکی ٩٢ دەسنووسی کوردیی لە ئارشیفخانەکانی ئەڵمانیادا، لە دکتۆرانامەیەکدا، بە چاپ گەیاندووە. ٩٢ دەسنووسی کوردیی تێدایە کە ئەڵمانییەکان کاتی خۆی لە کوردستانەوە راپێچی ئەڵمانیایان کردبوو، لەگەڵ چەندین میناتۆر و نیگاری کوردی.[١٩٥]

لیستی دەسنووسی دیکە:

Charles RIEV: Catalougue of Persian Manuscripts in the British Museum, V. 2, London: 1881, P. 728.

--A descriptive catalogue of the oriental manuscripts belong to the Late E.G. BROWNE, by Edward G. BROWN, Completed and

edited by Reynold A. Nicholson, Cambridge: 1932.

-B. DORN: Das Asiatische Museum im Jahre 1805, Melange

Asiatique, V. P. 458-464; Catalogue des ouvrages arabes, Persans et turcs publiees a Constantinople, en Egypte et en Pers, qui se trouve au Musee Asiatique de l Akademie, 1 Mars 1866, P. 466-528.

- د. معروف خزندار: مخطوطات فريدة و مطبوعات نادرة، لە رووسییەوە بۆ عەرەبی، بەغدا: ١٩٦٨.
- د. جەمال نەبەز: کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا، لە کتێبی بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی لە ئەوروپا، چ. ک. ز. ک.، بەغدا: ١٩٧٤، ل ١ ـ ٧٤.
- هرمان اته: تاريخ ادبيات فارسی، ت: د. رضا زاده شفق، بنگاه ترجمه و نشر كتاب طهران، ١٢٢٧، ص ٨٢ ـ ١٠٤.

## ١٠- کتێب و بڵاوکراوە و بیبلیۆگرافیا

بابەتێکی زۆر گرنگ کە کوردناسەکان دەیکەنە مەیدانی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان، بریتییە لە کتێب و بڵاوکراوە. ئەم کتێب و بڵاوکراوانە کە لە کۆنەوە بە زمانە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکان نووسراون، کوردناسەکان تۆماریان دەکەن بۆئەوەی بەئاسانی بیانخەنە بەردەست تۆژەر و خوێنەران. لێیان دەکۆڵنەوە، زیاتریان دەخەنە سەر و بەرەوپێشەوەیان دەبەن، یان وەریان دەگێڕن بۆ سەر زمانەکانی دیکە. بە ئارشێف کردنیان لە کتێبخانەکاندا و خستنە بەردەست خوێنەر و تۆژەران کارێکی زانستیی بەنرخە.

ئەم لیستەیەی خوارەوە، لیستەی چەند کتێبێکی بیبلیۆگرافییە لەبارەی کوردناسی:

١- پ. لێرخ: لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی کوردی ئێران و باپیرانیان لە خالدیانی باکوور، بە زمانی رووسی، مۆسکۆ: ١٨٥٦. زیاتر لە سەد سەرچاوەی پێش سەدەی ١٩می تێدایە بە دەیان زمانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی. یەکەم

کار لای پ. لێرخ له بیبلیۆگرافیاکەیدا ناوی کتێبی گەشتەکەی پزیشکی هۆڵەندی لیۆنهارت راوولفە (١٥٧٣) بۆ وڵاتی سووریا و یەهوودیە و عەرەبستان و مێزۆپۆتامیا و وڵاتی بابل و وڵاتی ئاشوور و ئەرمەنستان. زانیاریی بەنرخ لەبارەی ناوچەکانی کوردستانی باشوور و باکوور بڵاوکراوەتەوە.

٢- پ. لێرخ: بیبلیۆگرافیای کورد، به زمانی رووسی، بڵاوکردنەوەی ک. میشکین له گۆڤاری "هەنگی باکوور" ١٨٥٥.

٣- ف. رۆستۆپچین: بیبلیۆگرافیای کوردناسی له سەرەتاوە تا ١٩٣٣ (٧٣٢ سەرچاوە بە چەند زمانێکی رۆژئاوایی)، بە زمانی رووسی، گۆڤاری " ڕۆژهەڵاتی شۆڕشگێڕ"، مۆسکۆ: ١٩٣٣.

٤- ژ. مووسەیلیان: بیبلیۆگرافیای کوردناسی (٢٦٩٠ سەرچاوە بە دەیان زمانی رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی)، بە زمانی رووسی، مۆسکۆ: ١٩٦١ - ١٩٦٣.

J. S. MUSAELJAN: Bbliographija po Kurdoveniju, ed. Vostotchnoj Literatury, Moscou: 1963, 184 pages, 2 690 titres depuis le XVII siecle.

٥- ژێرار شالیان: کورد و کوردستان، بە زمانی فەرەنسی (زیاتر له ١٠٠ سەرچاوە بە دەیان زمانی روژهەڵاتی و رۆژئاوایی) پاریس: ١٩٧٨.

- Gerard CHALIAND, Sous la direction de: Les Kurdes et le Kurdistan, PCM, Paris: 1978.

٦- سیلڤیۆ ڤان رۆی و کییس تامبۆوەر: بیبلیۆگرافیای کورد، بە زمانی ئینگلیزی (٩ ٣٥٠ سەرچاوە بە دەیان زمانی رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی)، دوو بەرگ، ئەمستردام: ١٩٦٨.

- Silvio Van Rooy et Kees Tamboer: ISKs Kurdish Bibliography, No 1, ISK, Amsterdam: 1968, 2 Volumes, 656 pages. 9 350 titres.

٧- بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی له ئەوروپا، پێشەکیی مەسعوود محەمەد، له چاپکراوەکای کۆڕی زانیاریی کورد، بەغدا: ١٩٧٤. (ناوی زیاتر له ٢٠٠ کتێب و سەرچاوەی کوردناسی لەناو ئەم کتێبەدا هاتووە، بەتایبەتی له باسە بەنرخەکەی د. جەمال نەبەزدا).

٨- محەمەدی مەلا کەریم: چەند وردە سەرچاوەیەکی مێژووی کورد و کوردستان، بەیان، ژ (١)، بەغدا: ١٩٦٩، ل ١٥ - ١٦.

٩- د. کەمال مەزهەر: کورد و کوردستان له ئینسکلۆپیدیای مێژووی سۆڤیەتیدا، بەیان، ژ (١)، بەغدا: ١٩٧٢، ل ٢٠ - ٢٣.

١٠- زبير بلال اسماعيل: مدخل الى مصادر تاريخ الكرد، كاروان، ع (١)، اربيل: ١٩٨٢، ص ٨٢ ـ ٨٧.

١١- طاهر احمد حويزي: كردستان فى الكتب القديمه، كاروان، ع (١٢)، اربيل: ١٩٨٣، ص ١٤٥ ـ ١٤٩.

12- Mohammad MOKRI: Recherche de Kurdologie, Contribution aux etudes iraniennes, 1956-1964, Paris: 1970.

١٣- د. کەمال مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، ل ٢٦٠ ـ ٣٦٦. نزیکەی ١٠٠٠ سەرچاوەی تێدایە لەبارەی کوردناسی.

14- I. S. VANLY: Les Kurdes et le Kurdistan dans les relations d anciens voyageurs occidentaux XVIe-XVIIIe siecle, KSSE, 1973.

## سەرچاوەکان:


١ : بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی لە ئەورووپا ، چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد ، بەغدا: ١٩٧٤ .

2- Mohammad MOKRI: Recherche de Kurdologie, Contribution aux etudes iraniennes, 1956-1964, Paris: 1970. P. 51-30.

٣: د. فەرهاد پیربالّ: چەپکە گولّێکی دەست پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار، رۆژنامەی ولاّت، ژمارە (١٦٢) تا (١٦٢)، هەولێر: مانگی ئایار تا حوزەیرانی ١٩٩٦ ـ ب ٣.

٤: د. کەمال مەزهەر: مێژوو ، بەغدا: ١٩٨٣ ، ل ١٢٢ ـ ١٢٣.

٥: ئەم دۆکیوومەنتە لە ژمارە ١٢ی گۆڤاری (یەکگرتن) لە کۆپنهاگن، لە زنجیرەی بووژاندنەوەی نووسراوە عوسمانییەکان لەبارەی کورد، ئامادەکردنی: فەرهاد پیربالّ، لە لاپەڕە ١٨٣ـ ١٨٨دا سەرلەنوێ بلاّوکراوەتەوە.

٦: بۆ نموونە بڕوانە ئەم ژمارانەی گۆڤاری گەلاوێژ:

- ژمارە ٤ تا ژمارە ٧ی سالّی ١٩٤٥ ، هەروەها ژمارە ٦ی سالّی ١٩٤٦ تا ژمارە ١٠ی سالّی ١٩٤٦ گەشتنامەکانی ریچ و مێجەرسۆنیان تەرجەمە کردووە کە لە سەرەتای سەدەی ١٩مدا نووسراون.

- ژمارەکانی١١ی سالّی ١٩٤٣ و ژمارەکانی ١ تا ٣ی سالّی ١٩٤٨ بابەتێکی تێدایە بە ناونیشانی کورد لای بێگانە.

- ژمارەکانی ٨ تا ١١ی سالّی ١٩٤٧ ناجی عەباس گەشتەکەی مستەر ریچی کردووە بە کوردی؛ لە ژمارە ٥ تا ١٢ی سالّی ١٩٤٥یش گەشتەکەی مێجەر فردریک میلینگن ی ١٨٦٩ی کردووە بە کوردی.

7- Larousse, Dictionnaire Encyclopedique, Paris: 1979, P. 1019.

٨: د. محمود حمدي زقزوق: الاستشراق و الخلفية الحضارية للصراع الحضاري، ط ٢، مؤسسة الرسالة، قطر: ١٩٨٥. ص ١٥ ـ ١٦.

٩: احمد عبدالحميد غراب: رؤية اسلامية للاستشراق، ط ٢ ، مطابع التقنية، الرياض: ١٩٩٠ .

١٠: فؤاد افرام البستاني: دائرة المعارف الاسلامية، مجلد ١٢ ، بيروت: ١٩٧٧.ل ١٩ .

١١: فؤاد افرام البستاني: دائرة المعارف، " الاستشراق"، المجلد الثاني، بيروت: ١٩٧٧، ص ١١.

12- M. L. DUTRENOY: L Orient Ronesque en france, ontreal: 1946, P. 39-40.

١٣: د. فەرهاد پیربال: سەفەرنامە ، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژمارە (٥) ، سلێمانی: ١٩٩٨ ، ل ٤ ـ ٩.

14- Edward SAAID: Orientalisme, ed. Seuil, Paris: 1978, P. 15.

15- Dictionnaire Encyclopedique Larousse, Libr. Larousse, Paris: 1979, P. 924.

16- Hinna Fiee: Jalons pour une histoire de l Eglise en Iraq in >> Scriptorum Christianorum Orientalium, Lovan: Lovan: 1970, P. 110-112.

17- Jules LAURENS: Illustration, No 574, Paris: 1854.

18- Alphonse DE LAMARTINE: Voyage en Orient, Hachette, Paris: 1869, Vol. 1, P. 441-446.

19- Baudelaire: Oeuvres complaetes, 2me volume, Gallimard, PariS: 1975

٢٠: ب. م. دانتسيغ: الرحالة الروس في الشرق الاوسط، ترجمة وتعليق: الدكتور معروف خزندار، منشورات وزارة الثقافة والاعلام، بغداد: ١٩٨١.

٢١: س. پ.

22- Stephan YERASIMOS: Les voyages dans l Impire Ottoman XIVe - XVIe Siecle ), Ankara:46 1991, 565 P., P. 9 -10.

٢٣: حبيب الله صمدى: كردستان در چهل هزار سال پيش، مجلة بغستان، جلد اول، شماره اول، طهران: ١٩٦٣، ص ٣٨ ـ٣٩.

٢٤: ئێگزەنەفۆن: ئاناباز، گەڕانەوەی دە هەزار سەربازە یۆنانییەکە (تەنیا ئەو بەشەی باسی کاردۆخییەکان دەکا)، وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: فەرهاد پیربالّ، گۆڤاری رابوون، ژمارە (٧)، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٢. بلاّوکردنەوەی دووەم جاری: رۆژنامەی کوردستانی نویێ، ژمارە (٨٦٧) تا (٨٨٠)، هەولێر: ١٩٩٤. نەخشەی گەشتەکەی ئێگزەنەفۆن و چەند وێنەیەکیشی لەگەڵە.

25- L Iran des mages et du temps present, Extrait du Numero de Noel 1961,"C.F.P. Information". Paris:1961. PP.3-4.

26- The Cambridge history of Iran.V.2. The Medien and Achamenian Period, ed. by ILya GESCHVITCH, Cambridge university Presse, London_ Newyork_ Sydney: 1968?,P354, 365_359.

27- Xenophon: Anabase
tome ll, Livre lV- Vll, Texte etabli et traduitr psar Paul Masqueray, ed. Societe d. edition (Les Belles Let-: tres), Paris :1967.p.18.

28- DILSOZ: Serpehatiya ksenofon li kurdistan, le govari Roja nu. jiare 15, Lapre 18-20, Stokholm, 1987.

٢٩: علی اکبر فیاض: گزنفن در بازگشت، مجله یغما، شماره (٥)، طهران: ١٩٥٩، ص ٤٤٣ـ ٤٩٣.
هەروەها هێرکۆل ئازیزان (جەلادەت بەدرخان): کاردۆخ، گۆڤاری هاوار، ژمارە (٣٢) لاپەڕە ٤ـ٧، دیمەشق:١٩٤١.

٣٠: بۆ بیبلیۆگرافیای ئێگزەنەفۆن بڕوانە: د. کەمالّ مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، لاپەڕەکانێ: ٤٨ـ ٤٩، ١٣٧، ٢١٣، ٢٩٧، ٢٣٥ـ٢٣٦، ٢٩٧، ٣٠١، ٣١٩، ٣٢٨، ٣٣٩، ٣٣٢.

31- Richard HOLMES, Atlas historique de la guerre, ed. Hachette, Paris, 1989.

32- Atlas Historique, Histoire de l Humanite; Sous la direction de P. Vidal - Naquet, ed. Hachette, Paris: 1987, P. IX.

V. MINORSKY: Kurdes, in Encyclopedie de l` islam, T. 2, Paris: 1983, P. 41-42..33-

٣٤: میریللا غالیتي: التراث الكردي في مولفات الايطاليين، ت: د. یوسف حبي، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، بەرگی هەشتەم، بەغدا: ١٩٨١، ل ٢٢٥– ٣٠٠.

٣٥: د. کەمال مەزهەر: ماتێنەدەران، بەیان، ژ ٣٠، بەغدا: ١٩٧٥، ل ٧ـ ١٠.

36- Moses Khoren: Histoire d Armenie; Venise: 1841.

٣٧: دوگلاس لایتۆن D.Layton: کورد دناڤ تەوراتی و ئینجیلی دا، بە ئینگلیزی و کوردی، وەرگێڕانە کوردییەکەی: بێدڵ مشەخت، بلاّوکراوەکانی S.G. I، نیۆیۆرک:١٩٩٤.

٣٨: د. جەمال رەشید: لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەبارەی وڵاتی کوردەواری، بەغدا: ١٩٨٩.

39- Atlas Historique, Histoire de l Humanite; Sous la direction de P. Vidal - Naquet, ed. Hachette, Paris: 1987, P. IX.

40- Les voyages d Ibn BATTUTAH, tr. par C. Defremery et B. R. Sangnenett, 4 V., Paris: 1853-58. 2me ed. Paris: 1968.

٤١: د. محسن محمد حسین: الكرد وبعض مصادر تاريخهم الاسلامي، کاروان، ع (٢٤)، اربيل: ١٩٨٤، ص ١٣٨ ـ ١٤١.

٤٢: Les voyages d Ibn BATTUTAH, tr. par C. Defremery et B. R.

٤٣: د. عزالدين مصطفى رسول: الكرد عند العرب (الحلقة السادسة)، جريدة الاتحاد، عدد (٢٧٤)، سليمانية: ١٩٩٨/٧/٤، ص ١٢.

٤٤: رحلة ابن جبير، منشورات داراالتراث، بيروت: ١٩٦٨، ص ١٩٣

45- Metin AND: Turkishe Minatur painting, The Ottoman period, Dost publication, 4the ed., Istanbul: 1987.

46- Seydi Ali Reis: Traduction francais in ,, Journal Asiatique,, Vol. IX, P. 27-299, et Vol. X, P. 46-112.

47- Kamuran BEDIRXAN: Le Roi du Kurdistan, Roman épique Kurde, traduit:2 du Kurde par l' auteur et Adolphe DE FALGAIROLLE, Aux éditions de Trésor du siècle, Paris: 1938?. 84 pages.

### یۆنانییەکان زیانێکی گەورەیان لێ دەکەوێ

١٧- ئاشاگۆراس دو ئارگۆس خۆی لە چنگی دوژمن قوتار کردبوو، بە ڕاکردن گەیشتە لامان. گوتی ماوەیەکی زۆر بوو لەسەر دوندی شاخەکەدا گیریان خواردبوو، سێفیزۆدۆر و ئامفێکراتیس کوژرابوون، هەروەها وتی هەموو ئەو کەسانەی دیکەش کوژراون کە لە بەندەنی شاخەکەوە خۆیان فڕێ دابووە خوارەوە بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان بگەیەننەوە پاشەنگی لەشکرەکە.

١٨- ئەو قەتڵوعامە خوێناوییە بەدەست بەربەرەکانەوە لەسەر لووتکەی شاخێکی بەرامبەر گردەکە ڕووی دابوو. ئێگزێنۆفۆن زماننـاسێکی لەگەڵ خۆی بردە لایان. هەوڵی دا شەڕەکە رابگرێت و ئاشتی لەنێوانیاندا بەرقەرار ببێت، هەروەها داوای لاشەی کوژراوەکانیشی لێیان کرد.

١٩- بەربەرەکان ڕایانگەیاند کە لاشەی کوژراوەکانیان بەو مەرجە دەدەنەوە کە ئەگەر ئەوانیش ئیدی دەست لە سووتاندنی خانووەکانیان هەڵبگرن. ئێگزێنۆفۆن بەمە ڕازی بوو. لەو دەمەی کە پاشماوەی سەربازەکان خەریک بوون بەرەو پێشەوە ملیان دەنا و هەموو خەڵک لەناو خۆیاندا خەریکی وتووێژ بوون، لەناکاو سەرتاپای دوژمن لەو ناوەدا کەوتنە پەلەقاژێ.

٢٠- ئنجا کاتێ ئێگزێنۆفۆن و سەربازەکانی هەنگاویان هەڵنا بۆ ئەوەی وردە وردە لە گردەکەوە بەرەو لای لەشکرەکەی خۆیان لێژببنەوە، لەو شوێنەدا کە هەموو لەشکرەکە چەکی خۆیان فڕێ دابوو، کاردۆخەکان کەوتنە خۆ، کردیانە هەرایەک نەبێتەوە.

کاتێ یۆنانییەکان گەیشتنە سەر گردەکە و ئێگزێنۆفۆن خەریک بوو لە گردەکە دادەبەزییە خوار، کاردۆخەکان بە هەڵپە و لێشاو دەستیان کردە گلۆرکردنەوەی تەلاشە بەردان: لەو بەینەدا لاقی سەربازێک شکا، ئێگزێنۆفۆنیش ئەو پیاوەی لێ دابڕا کە قەڵغانەکەی بۆ هەڵگرتبوو.

٢١- ئۆبریلۆک دو لویس، کە سەربازێکی قورسە چەک بوو، ڕایکرد بە فریای ئێگزێنۆفۆن بکەوێ؛ تەنیا یەک تاکە قەڵغانی بۆ هەردووکیان پێ بوو، بەڵام توانی وردە وردە ئێگزێنۆفۆن بکشێنێتەوە دواوە. سەربازەکانی دیکەش هەروا توانییان خۆیان بگەیەننەوە لەشکرەکەیان.(٧)

### یۆنانییەکان پەیمان لەگەڵ دوژمن دەبەستن

٢٢- یۆنانییەکان، هەموویان پێکڕا، لە یەک شوێندا کۆببوونەوە. چوون بنەوبارگەی خۆیان لەناو کۆمەڵێک خانووی قەشەنگدا هەڵخست، ئەو خانووانە پڕ بوون لە خواردەمەنی و بژێوی جۆراوجۆر، جۆرە شەرابێکی خۆشی ئەوتۆ لەناو ئەو خانووانەدا هەبوو کە یۆنانییەکان بۆ پاراستن خستیانە ناو چاڵە شەرابی چیمەنتۆییەوە.

٢٣- ئێگزێنۆفۆن و کریزۆف پەیمانیان لەگەڵ کاردۆخەکان بەست: تەرمی کوژراوەکانیان بەیەکتر سپاردەوە و قسەیان لەبارەی چۆنیەتی ڕێگابڕینی داهاتوویان کرد، هەروەها درووودیان بۆ گیانی مردووەکان خوێند. چۆن کە لە ژیاندا ڕێز لە مرۆڤی هێژا و نرخمەند دەگیرێت ئاوها یادی ئەو مردووانەیان کردەوە.

### قافڵە دەکەوێتە ڕێ

٢٤- بەیانییەکەی، یۆنانییەکان بێ ئەوەی هیچ ڕێبەرێکیان دەگەڵ کەوتبێ، سەرلەنوێ ڕێگایان گرتە بەر. دوژمن بەردەوام تەنگیان پێ هەڵدەچنین. هەر جارێک یۆنانییەکان دەکەوتنەوە سەر ڕێگایەکی تەنگەبەر، دوژمن دەهاتن پێشیان لێ دەگرتن و ڕێگای پەڕینەوەیان لێ ئاستەنگ دەکردن.

٢٥- دوژمن کاتێ پاشەنگی لەشکرەکەیان ڕادەگرت، ئێگزێنۆفۆن لە دوواوەڕا لە قافڵەکە دەردەهات، دەچوو بەسەر بەرزاییەکاندا هەڵدەگەڕا و بەوێدا دەپەڕییەوە پێشەوە؛ ڕێگای پێشەوەی دەشکاند، هەموو توانای خۆیشی دەخستە گەڕ بۆئەوەی بتوانێ دەسەڵات بەسەر هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرانەدا بگرێ کە دەبوونە هۆی ڕێگیرانیان.

ئەگەریش هێرشیان لە پشتەوەڕا بکرایە سەر، ئەم جارەیان ئیدی کریزۆف لە قافڵەکە دەردەچووە دەرەوە، هەوڵی دەدا هەڵبگەڕێتە سەر شوێنێک کە لە شوێنی دوژمنەکان بەرزتر بێ، ئیتر لەوێوە دوژمنەکانی پەرتەوازە دەکرد و کارێکی وای دەکرد کە دوژمن چیتر نەتوانێ ببێتە کۆسپ لەبەردەم پەڕینەوەی کلکەی قافڵەکە.

یۆنانییەکان لە هەمان کاتدا، بەردەوام، زۆر بە چوست و چالاکییەوە بە هانای یەکتر دەچوون و پاسەوانی سەلامەتیی یەکتریان دەکرد.

### چەکهەڵگرتنی کاردۆخەکان

٢٧- جاری وا هەبوو تەنانەت ئەو کەسانەی کە دەسەڵاتێکی تەواویشیان لە بەرزاییەکانەوە بەسەر کاردۆخەکاندا هەبوو، لە کاتی دابەزینی خۆیاندا دەستەویەخەی گەلێک گیروگرفت دەبوونەوە؛ ئەوانەی لەش سووک بوون خۆیان هەڵداوێشتە خوارەوە و بۆ خۆیان قوتار دەبوون.

خۆ کاردۆخەکان، جگە لە تیر و کەوان یان بەردەقانییەکی درێژ (قەڵماسک)، هیچی دیکەشیان پێ نەبوو.

٢٨- ئەو کاردۆخانە تیرهاوێژی زۆر کارامە بوون. ئەو کەوانانەی تیریان پێ دەهاوێشتن، درێژاییان نزیکەی سێ گەز دەبوو، تیرەکانیشیان زیاتر لە دوو گەز. کە دەیانویست تیرێک باوێن، لە سەرەتادا پەتەکەیان باش باش دەبەست و لاقی چەپیان دەهاوێشتە سەر بەشی خوارەوەی کەوانەکە. تیرەکانیان زرێپۆش و تەنانەت قەڵغانیشی کونبەدەر دەکرد.

یۆنانییەکان ئەو تیرانەیان هەڵدەگرتنەوە، پارچە قایشێکیان لێ دەبەستن و دەیانکردن بە نێزە.

ئا لەم وڵاتەدا بوو کە کرێتییەکان Cretes خزمەتێکی بەڕاستی زۆریان بەجێ گەیاند. ستراتۆکلسی خەڵکی کرێت سەرکردەیان بوو.

## لە قەراغ زێی ناوەڕاستدا

### بەشی سێیەم

١- ئەو ڕۆژە، یۆنانییەکان بنەوبارگەی خۆیان لەناو ئەو ئاواییانەدا هەڵخست کە کەوتبوونە ناوەڕاستی دەشتە پاراوەکانی دەوروبەری زێی ناوەراست. پانتایی زێیەکە نزیکەی دوو پلێتر Pletre دەبوو، ئەرمینیای لە وڵاتی کاردۆخەکان جیادەکردەوە[٨]. یۆنانییەکان لەوێ پشوویەکیان دا، گیانێکیان وەبەردا هاتەوە بەوەی کە دیتییان ئێستا وا گەیشوونەتەوە پێدەشتێکی بەرگوشاد. زێیەکە شەش حەوت ستادێک Stade لە شاخ و داخی کاردۆخەکانەوە دوور بوو.

٢- ڕەشماڵەکانیان زۆر بەکەیفخۆشییانەوە هەڵدا، لەبەرئەوەی ئازووقەیەکی باشیان پێ بوو، هەروەها خەریک بوو ئەو چورتم و ناخۆشییانەی بینیبوویان وردە وردە لەبیریان دەچۆوە.

بەدرێژایی ئەو حەوت رۆژەی کە لەناو کاردۆخەکاندا بەسەریان بردبوو، بێ پشوودان لە شەڕکردندا بوون؛ دەرد و ئەشکەنجەی ئەوتۆیان بەدەست ئەو کاردۆخانەوە بینیبوو کە تەنانەت زۆر لەوانە ناخۆشتر بوون کە بەدەست پاشا و تیسافێرن Tissapherne بینیبوویان. بەڵام ئێستا، ئەوەتا، هەموو ئەو شتانە کۆتاییان پێ هاتووە. بەدەم بیرکردنەوەوە پشوویەکی خۆشیان دا.

٣- رۆژی دواتر، دیتییان لەوبەری زێیەکەوە، کۆمەڵێک ئەسپسوار کە لە بنی پێیانەوە تا تەوقی سەریان چەکیان لە خۆ بەستبوو، دیار بوو دەیانویست رێگایان لێ بگرن. لە هەمان کاتدا، لەولاتری ئەو ئەسپسوارانەدا، کۆمەڵە خەڵکێکی دیکەش، پیادە، لەسەر گردەکاندا پۆل پۆل راوەستابوون بۆ ئەوەی نەهێڵن بچنە ناو خاکی ئەرمینیا.

٤- ئەمانە پیاوەکانی ئۆرۆنتاس و ئارتووشاس بوون، ئیدی ئەرمەنی، ماردی Mardes، خالدی Chaldeens، کە ئەوانیش بە رۆڵی خۆیان بەرگرییان لە خۆ دەکرد.

کاتێ باس لە خالدییەکان Chaldeens دەکرا، دەیانگوت کە ئەو خالدییانە گەلێک سەربەست و هێژان، چەکەکانیان نێزە Pique بوو، زرێپۆشی لە داربی دروستکراویان لە خۆ دەبەست.(٩)

٥- ئێمە کاتێ بۆ یەکەم جار چاومان بەم پۆلە خەڵکە ریز ریز وەستاوە کەوت، لەسەر بەرزاییەکدا بوون کە سێ چوار پلێتر Plethre لە زێیەکەوە دوور بوو، تاقە رێگایەکی لێمانەوە دیار بوو، رێگایەکی شاخاوی بوو. لەوە دەچوو خەڵک ئەو رێگایەیان بەدەستی خۆیان دروست کردبێ. یۆنانییەکان دەیانویست ملی ئەو رێگایە بگرنە بەر.

٦- دوای ئەوەی ملیان بە رێگاکەوە نا، دیتیان زێیەکە لەو دەشتەدا لەبەر دەمیانە؛ زێیەکەش پڕە لە تەلاشەبەردی خلیسک، پێلەکانیشی هەر جارەی بەرەو لایەکدا رایاندەپێچێ؛ هەروەها دیتیان چیتر پێیان ناکرێ لەناو ئاوەکەدا زرێپۆشەکانیان ببەستن: چونکە ئەگەر زرێپۆشەکانیان لە خۆ ببەستایە ئاو دەیبردن. ئێ ئەگەر نەشیانبەستنایە و بیانخستنایەتە سەر سەری خۆیان، ئەوا هیچ شتێکیان پێ نەدەما بۆ ئەوەی خۆیانی پێ لە تیر و رمبی دوژمن بپارێزن. ئیدی ناچار بە پاشگەردانییەوە کشانەوە و بنەوبارگەی خۆیان هەر لەو ناوەدا، لە قەراغ زێیەکەدا هەڵخست.

٧- وێڕای هەموو ئەمانەش، شەوی گۆڕین، لەو شوێنەی پشوویان لێ دا، لەناکاو چاویان بە کۆمەڵێک لە کاردۆخەکان کەوت کە لەناو شاخەکاندا کۆزیلەکەیان بەستبوو و دەست بە چەکەوە راوەستابوون. یۆنانییەکان لەو دەمەدا تووشی نائومێدییەکی سەخت هاتن، چونکە وایان دەبینی ئیتر رووبارەکە نایەتە خۆلێدانێ، بە چاوی خۆشیان ئەو هەموو خەڵکەیان دەدیت کە دەهاتن رێگەی پەڕینەوەیان لێ بگرن؛ دەیانزانی ئەگەر بچن خۆیان لە رووبارەکە بدەن ئەوا کاردۆخەکان دێن لە پشتەوەڕا هێرشیان دەکەنە سەر.

**ئێگزێنۆفۆن خەون دەبینێ**

٨- یۆنانییەکان ئەو رۆژە، هەروەها بەدرێژایی شەوی داهاتوو، لە نیگەرانییەکی زۆر ناخۆشدا دەژیان. هەرچی ئێگزێنۆفۆنیش بوو، خەونێکی دیت: لەو خەونەیدا هەر چوار پەلی بە کۆت و زنجیر بەسترابوونەوە، پاشان لەناکاو ئەو کۆت و زنجیرانە هەر لە خۆیانەوە شکان و لە چوارپەلی ترازان، ئیدی ئێگزێنۆفۆن ئازاد، دەیتوانی بۆ هەر کوێ بیەوێ بڕوا.

لەگەڵ کازیوەدا، کاتێ چاوی بە کریزۆف کەوت، پێی گوت کە ئاواتە خوازە هەموو شتێک بە دڵ و داوی خۆیان بڕواتە رێوە. ئینجا پاشان خەونەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە.

٩- کریزۆف دڵی دایەوە. هەر کە خۆریش گزنگی دا، سەرتاپای ڕێناسەکان لە یەکتر کۆبوونەوە و بەم بۆنەیەوە قوربانییەکیان سەربڕی و بەدیارییەوە ڕاوەستان. لەوە دەچوو هەموو شتێک نیشانەی فەڕی پێوە دیار بێ. ڕێناس و دووربینەوانەکان فەرمانیان دایە لەشکرەکە کە بەرێکوپێکیەوە بچن بۆ خۆیان فراوێنی خۆیان بکەن.

## چەند زانیارییەکی بەسوود

١٠- لەو دەمەی ئێگزێنۆفۆن خەریکی نانخواردن بوو، دوو کوڕی گەنج بەغاردان هاتنە لای: هەموو خەڵک دەیزانی ئەگەر شتێکی گرنگ لەبارەی چالاکییە سەربازییەکانەوە هەبووایە، ڕێگەدرابوو هەموو کەسێک تەنانەت لە کاتی نانخواردنیشدا بچێتە لای ئێگزێنۆفۆن و قسەی لەگەڵ بکات، تەنانەت بۆی هەبوو لە خەویش بێداری بکاتەوە.

١١- ئەو دوو کوڕە گەنجە باسی ئەوەیان بۆ گێڕایەوە کە بەرێککەوت لە دارستانەکەدا، کاتێ خەریک بوون کۆتەرەداریان بۆ ئاگرکردنەوە کۆدەکردەوە، لەناکاو چاویان بە پیرەمێردێک کەوتووە، کە لەودیوی زێیەکە لەگەڵ ژنێک و کۆمەڵێک کچوکاڵ، لەناو تەلاشە بەردەکانی ئەولای چەمەکە توورەگەی پەینیان بە دەستەوە بووە و خەریک بوونە ڕۆیان دەکردە ناو چەند چاڵەبەردێکەوە.

١٢- ئەو خەڵکە، بەدڵنیاییەوە دووپاتی ئەوەیان کردۆتەوە کە لە کاتی پەڕینەوەدا هیچ مەترسییەکیان نایەتە ڕێگا، چونکە هیچ دەروازەیەک لە بەرامبەریاندا نییە کە ئەسپسوارەکانی دوژمن بتوانن پێیدا بپەڕنەوە.

ئەو خەڵکە جلوبەرگی خۆیان داکەند، «دوو کوڕە گەنجەکە باسیان کرد». هەریەکە و خەنجەرێکیان بە دەستەوە بوو، ڕووتو قووت، وەک ئەوەی بچنە مەلەکردنێ، خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی لە ڕووبارەکە بدەن و بگەنە لای ئێمە. هاتن ڕووبارەکەیان بڕی، بێ ئەوەی لەشیشیان ئەوەندە تەڕ ببێت. ئنجا کە گەڕانەوە، توورەگە پەینەکانی خۆیان لەوبەری ڕووبارەکەدا هەڵگرتەوە و بە لایەکدا وەرسووڕانەوە.

## یۆنانییەکان دێنە سەر ئەوەی لە ڕووبارەکە بدەن

١٣- ئێگزێنۆفۆن یەکسەر شوکری خوای کرد؛ بڕیاری دا کە شەراب پێشکەش بکەنە ئەو دوو کوڕە گەنجە و هەروەها سوپاسی خواوەندەکان بکەن کە ئەو خەونەیان بۆ ئێگزێنۆفۆن هەنارد و ئەم گوزەرگایەی بۆ دۆزینەوە؛ بەشکو خواوەندەکان هەموو شەڕێکی دیکەشیان لێ بەخێر بگێڕێ.

کاتێ دوعا و سەنا تەواو بوو، ئێگزێنۆفۆن یەکسەر ئەو دوو کوڕە گەنجەی بردە لای کریزۆف. دوو کوڕە گەنجەکە سەرلەنوێ ئەوەی دیبوویان گێڕایانەوە. کریزۆف، کە گوێی لە قسەکانیان ڕاگرت، ئەویش شوکری خوای کرد.

١٤- پاشان ئێگزێنۆفۆن و کریزۆف فەرمانیان دایە سەربازەکان بنەوبارگەی خۆیان بپێچنەوە، هەروەها خۆشیان، کە پێشتر باش ڕاوێژیان لەگەڵ ڕێناسەکان کردبوو، کەوتنە مشوورخواردنی ئەوەی کە ئیتر هەرە باشترین گوزەرگا بۆ پەڕینەوە لە ڕووبارەکە بگرنەبەر و بتوانن بەسەر هەموو ئەو کۆسپوتەگەرانەدا زاڵ بن کە لەبەردەمیاندا هەبوون.- ئەمەش بێ ئەوەی ئەگەر کارەساتێک لە پشتەوەڕا ڕوویدات بتوانێ زیانیان پێ بگەیەنێ.

١٥- بڕیاریاندا کە کریزۆف پێشەنگی لەشکرەکە بگرێتە دەست، پاشەنگیش بە دەست ئێگزێنۆفۆنەوە بێت، جەلووی بنەوبارگە و کەلوپەلەکانیش لەنێوان هەردووکیاندا بڕوات.

١٦- هەرکە لە ڕێکخستنی ئەم شتانە بوونەوە، کەوتنە ڕێگا: کۆمەڵێک گەنج جڵەوی قافڵەکەیان گرتبووە دەست، کەنارە و کەناری دەستەچەپی ڕووبارەکە دەڕۆیشتن. نێوان ئەمان و گوزەرگاکە نزیکەی چوار ستاد دەبوو.

١٧- وێراوێرای ئەمان، کاروانی دوژمن لەوبەری ڕووبارەکەدا دەڕۆیشت. کاتێ گەیشتنە گوزەرگاکە، مەنزڵیان لەلای تاشەبەردە سەختەکاندا هەڵخست. ئنجا کریزۆف، سەر بە تاجەوە، نیوەڕووت، لە پێشەوەی لەشکرەکەدا پەلاماری دایە چەکەکانی خۆی و لە خۆی بەستن، فەرمانی دایە تیپەکانی خۆی ئەوانیش بە هەمان شێوە چەکەکانیان ببەستن؛ پاشان فەرمانی دایە دووربینەوانەکان دەستەدەستە و لەگەڵ یەکتر بەرەو پێشەوە بڕۆن: هەندێکیان لە دەستەچەپییەوە، ئەوانی دیکەش لە دەستەڕاستییەوە.

١٨- پیاوە دینییەکانمان لە قەراغ ڕووبارەکەدا قوربانییان سەر دەبڕی، دوژمنیش هەر تیریان تێ دەگرتین، بەردەقانییان رادەوەشاندینێ، بەڵام هێشتا هیچ مووشەکێکمان ئاڕاستە نەکرابوو.

١٩- لە سۆنگەی ئەوەی شەهیدێکی زۆرمان دابوو، سەربازەکان سروودی سەرکەوتنیان دەگوتەوە، بۆ ئەوەی هاواری جەنگ لەناویاندا دەنگ بداتەوە، ئافرەتەکانیش لای خۆیانەوە، هەمموویان پێکڕا نەعرەتەیان لێدەدا و دەیانقیژاند. ئافرەتی ئارەزوومەند لەناو لەشکرەکەماندا زۆر هەبوون.

## کریزۆف پێش هەموو کەسێک دەپەڕێتەوە

٢٠- کریزۆف، خۆی و یاوەرەکانی لە ئاوەکەیاندا. ئنجا ئێگزێنۆفۆن، لەلای خۆیەوە، دەستەیەک لە پیاوە هەرە چاپووکەکانی هێزی دواوەی هەڵبژارد و لەوواوەڕا، بە هەمموو هێزی خۆیانەوە، بە ڕاکردن ملیان نا بەرەو گوزەرگاکەی بەرامبەر ئەو ڕێگایەی دەچۆوە سەر زنجیرە چیای ئەرمەنییەکان؛ وەک ئەوەی لە پاش پەڕینەوە لەو رووبارە، بچێ لە قەراغەکەدا باوەش بە کاروانەکەی ئەودیودا بکات کە ڕیزڕیز وەستابوون.

٢١- دوژمن کە دەیاندیت سەربازەکانی کریزۆف بێ هیچ ئاستەنگێک لە ئاوەکە دەپەڕینەوە، هەروەها کە دەیانبینی تیپەکانی ئێگزێنۆفۆن بەڕاکردن بەرەو لای پشتەوە هەڵدەکشان، مەترسیی ئەوەیان لێ نیشتبوو کە ئیدی ئابلۆوقە بدرێن. هەر بۆیەش یەکسەڵەف بەبازدان خۆیان قوتارکرد و ڕایان کرد بەرەو ئەو ڕێگایەی دەیڕوانییە سەر رووبارەکە. کاتێ گەیشتنە بەرزایی هەرە بڵندی ئەو ڕێگایەش، ئیدی لەوێوە بەسەر شاخەکەدا هەڵگەڕان.

٢٢- لیکیۆس کە داوای خۆڕێکخستنی سوارچاکەکانی دەکرد، هەروەها ئەسخینیێس کە داوای خۆتەیارکردنی لە سەربازە پیادەکان دەکرد بۆ ئەوەی لە دەوری کریزۆف کۆببنەوە، ڕاستییەکەی، ئاگایان لە ڕەوکردنی لەناکاوی دوژمن نەبوو بۆ ئەوەی بچن ڕاوەدوویان بنێن؛ لەلایەکی دیکەشەوە سەربازە پیادەکان هاواریان دەکرد کە دوژمن لەدوای خۆمانەوە جێ نەهێڵێن. دەیانویست بەسەر شاخەکاندا هەڵبگەڕێین و ڕاوی دوژمن بنێین.

٢٣- کریزۆف کە لە ڕووبارەکە پەڕییەوە، نەیکرد بە دوای دوژمن بکەوێ: بێ ئەوەی بچێ کات بەفیڕۆ بدا، ڕێگای گرتەبەر و بەسەر ئەو گردانەدا هەڵگەڕا کە دەیانڕوانییە سەر ڕووبارەکە، لەوێش ڕووبەڕووی سەربازە پیادەکان هاتەوە.

سەربازە پیادەکان کاتێ دیتیان ئەسپسوارەکان ڕادەکەن و سەربازە قورسە چەکەکانیش هەر بەدوای ئەوانەوەن، ئیدی سەنگەرەکەی خۆیان- کە دەیڕوانییە ڕووبارەکە- چۆڵ کرد.

## دەستەبەرەکانی ئێگزێنۆفۆن

٢٤- ئێگزێنۆفۆن کاتێ هاتە لایان و دووپاتی ئەوەی کردەوە کە لە دیوەکەی دیکەیاندا هەمموو شتێک بەڕێکوپێکییەوە بەڕێوەدەچێ. یەکسەر بەزووترین کات گەڕایەوە لای ئەو سەربازانەی کە هێشتا هەر خۆیان لە ڕێگاکەدا هێشتبۆوە. چونکە دەیانزانی کاردۆخەکان داکەوتبوونە ناو دەشت و دۆشەلەکانی ئەو ناوە بۆ ئەوەی

بەسەر ئەو سەربازانەدا بدەن کە لە کاروانەکەدا بەجێ مابوون.

٢٥- کریزۆف فەرمانڕەوایەتی بەسەر هەموو بەرزاییەکاندا داگرتبوو. لیکۆس کە بەخۆی و دەستەیەک لە پیاوەکانیەوە خۆی بۆ ڕاوەدوونانی دوژمن تەرخان کردبوو، چوو هەندێ لە باوڵەکانی کریزۆفی بۆ کریزۆف هەڵگرت، ئەو باوڵانەی لە قەراغەکەدا داندرابوون: جلوبەرگ و گۆزەڵە شەرابیان تێدا بوو.

٢٦- لەو کاتەی پەیتوون و غەیرە چەکدارەکان خەریک بوون تێدەپەڕین، ئێگزێنۆفۆن نیوە پێچێکی خوارد و چوو چەکدارەکانی خۆی دەستەدەستە تەیار کرد دژ بە کاردۆخەکان، پاشان فەرمانی دایە دووربینەوانەکان کە هەر یەکێکیان لەناو چوار تیپی سەربازیدا لەگەڵی بڕۆن و لەکاتی شەڕیشدا خۆیان بخەنە سەنگەری دەستەچەپی لەشکرەکە. بەم شێوەیە، دووربینەوانەکان و دووچەرخە سوارەکان بە ئاراستەی دژ بە کاردۆخەکان دەڕۆیشتن؛ هەرچی سەربازەکانی پاشەنگیش بوون، دەبووایە پۆل پۆل بەرامبەر ڕووبارەکە ڕابوەستن.

٢٧- کاردۆخەکان کاتێ دیتیان پاشەنگ لە لەشکرەکە دابڕاوە و ژمارەی چەکدارەکانیش یەکجار کەمە، یەکسەر کەوتنە چڕینی جۆرە گۆرانییێک و بەپەلەپرووزێ هەنگاوەکانی خۆیان بەلەزتر کرد.

کریزۆف دیاربوو هەرکە لای خۆیەوە هەموو مەترسی و هەڕەشەیەکی تەفروتوونا کرد؛ پیاوە نیشانەچی و سەربازە پیادەکان و تیرهاوێژەکانی هەنارده لای ئێگزێنۆفۆن و داوای لێ کردن کە هەرچی شتێکی ئێگزێنۆفۆن داوای دەکا، بیکەن.

### ئێگزێنۆفۆن لە ڕووبارەکە دەپەڕێتەوە

٢٨- ئێگزێنۆفۆن کاتێ چاوی بەم هەموو خەڵکە کەوت کە خەریک بوون دەپەڕینەوە یەکسەڵەف ڕێبەرێکی ناردە لایان و داوای لێ کردن جارێ هەر لە قەراغەکەدا بمێننەوە و خۆیان لە ڕووبارەکە نەدەن. تیپەکانی ئێگزێنۆفۆن کە دەیانویست بپەڕنەوە، دەچوون بەملا و بەولای یەکتردا بڵاودەبوونەوە، وەک ئەوەی بیانەوێ بەناو یەکتردا بڕۆن: جڵەودارەکان قایشی ڕمبەکانیان بەدەستەوە، سەربازە تیرهاوێژەکان بە خۆیان و گوریس و تیرەکانیانەوە، بەڵام نەدەبووایە دەمودەست خۆیان لە ئاوەکە بدەن.

٢٩- کاتێ گاشەبەردی بەردهاوێژەکان کەوتنە ڕاوەشاندنان و تاقوتۆقی زرێکان دەنگیان دایەوە، ئێگزێنۆفۆن فەرمانی دایە خەڵکەکە بەدەم چڕینی سروودی جەنگەوە هێرش بکەنە سەر دوژمن؛ پاشانیش کاتێ دوژمن دەیویست ڕووی وەرچەرخێنێتەوە، لەو دەمەی شەیپووری هێرش بردن لەناو ڕووبارەکەدا بەرز دەبۆوە، داوای لێ کردن نیوە سوورێک بەلای دەستەڕاستەوە بدەن بۆ ئەوەی کلکەی لەشکرەکە بکەوێتە پێشەوە؛ هەروەها داوای لێ کردن لەو کاتەدا بە هەموو هێزی خۆیان، بەزووترین کات لە ڕووبارەکە بدەن و بپەڕنەوە، هەر کەسێک لە ڕیزەکەی خۆیدا شوێنی خۆی باش بپارێزێ بۆ ئەوەی خەڵکەکەی تەنیشت خۆی نەخاتە تەنگانەوە: ئیدی ئازاترین کەس ئەو کەسە بوو کە لە پێش هەموویانەوە دەگەیشتە قەراغەکەی ئەودیو.

### دوایین هێرشی کاردۆخەکان

٣٠- کاردۆخەکان کاتێ دیتیان ئێمە تەنیا یەک دەستە سەربازمان مابۆوە، - چونکە ژمارەیەکی زۆر لەو سەربازانەی فەرمانیان پێ درابوو بمێننەوە، چووبوون پارێزگاری گوزەرەکان بکەن یانیش پارێزگاری بارگیر یان ئافرەتەکان، - ئیدی هێرشێکی زۆر توندوتیژیان کردە سەرمانو دەستیان پێکرد دیسانەوە تیر و گاشەبەردیان تێ دەگرتین.

٣١- یۆناییــەکـانیش ئیـدی بەدەم چڕینی سـروودی جـەنگەوە ڕووبەڕوویان وەسـتـانەوە. ئەوان پێـشـبـینی ئەم پێکهەڵپژانەیان نەکردبوو: چەک و تەقەمەنییەکان، بێگومان، بەشی ئەوەیان دەکرد لەناو چیاکاندا هێرشی پێ ببەنەسەر دوژمن و ڕابکەن، بەڵام بۆ شەڕێکی ئاوهای تەن بە تەن هەمان شت نەبوو.

٣٢- لەو دەمـەدا شـەیپـوور لێـدرا، کـەچی دوژمن دیسـان زوو توانی خـۆی ڕزگـار بکات. ئنجـا یۆنانیــەکـان وەرچەرخانەوە و بەدەم برینی ڕووبارەکە ـ بەوپەڕی خێراییەوە ڕایانکرد.

٣٣- چەند قـەراوڵێکی دوژمنـان هێشـتـا هەر لێـوە دیاربوون، بە ڕاکردن بەرەو قـەراغی ڕووبارەکـە دەگـەڕانەوە و تیریان تێ دەگرتین: چەند کەسێکیان لێمان بریندارکرد؛ ئاپوورەی دوژمن لەوبەرەوە ڕزگاریان ببوو، کەچی ئێمەی یۆنانی هێشتا هەر لە قەراغەکەی ئەمدیودا بووین.

٣٤- لەنێو ئەوانەشدا کە چووبوون بە فریای هاوڕێکانی خۆیان بکەون، لە خوێن گەرمیی خۆیاندا زیاد لە پێویست دوور کـەوتبـوونەوە، چووبوون لەودیو تیپـەکـەی ئیگزێنۆفـۆنەوە دیسـان لە ڕووبارەکـەیان دابۆوە؛ ئەوانیـش چەند کەسێکیان بریندارکرابوون.

## لە ئەرمەنستاندا

### بەشی چوارەم

١- یۆنانییەکان ڕووبارەکەیان بڕی؛ دەستەدەستە لە شێوەی تەدارەکی سەربازیدا، دەمەونیوەڕۆ گەیشتنە سەر خاکی ئەرمینیا، دەشتێکی هەتا چاو هەتەردەکا بەرفراوان، جارجار نەبێ کە هەورازێکی دەهاتە بەرمانەوە.[١٠] بەڵام ئەو ناوە، نزیک ڕووبـارەکە، سەبارەت بە ناکۆکی و دووبەرەکایەتییـان لەگەڵ کاردۆخەکان، هیچ گوندێکی لێ نەبوو.

٣- یۆنانیـیـەکـان لەوێوە ڕێگاکـەیان بە دوو قـۆناغ بڕی و لە سـەرچاوەکـانی ڕووبـاری دیجلە پەڕینەوە. پاشـانیش لەوێوە، بە سێزدە قۆناغ گەیشتنە تێلێبۆواس Teleboas.[١١]

٤- ئەم وڵاتە ناوی ئەرمینیا Armenie بوو، سەرکردەکەیان ناوی تیریباز Tiribaze بوو.[١٢]

### ژێدەر:

(١) ئاشکرایە لێرەدا یۆنانییەکان لە باشووری کوردستانی عیراقی ئەمڕۆدان، بەڵام دیاریکردنی وردبینانەی ئەو شوێنە جوگرافییەی کە لێن ئاشکرا نییە.

(٢) مەبەستی لە (پاشا)، پاشای هەخامەنشییەکانە (٥٥٠-٣٣٠ پ.ز)، کە تازە ئیمپراتۆریەتی میدیاییەکانیان تێک شکاندبوو و سەرتاپای کوردستـانیـان خستـبـووە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. ئەم دژایەتی و ڕقە ئەستوورەی کاردۆخەکان لەهەمبـەر پاشای فـارسە هەخـامـەنشـیـیـەکـان، پەیوەندیی ئەتنیک، سیـاسی یان هاونەژادیی کـاردۆخـەکـانمان بۆ ڕوون دەکـاتەوە لەگەڵ مـیـدیاییـیـەکـاندا هەیانبووبێ، چونکە میدیاییەکانیش، ئەوکاتە، تازە تێکشکابوون و دژ بە پاشا بوون.

(٣) یۆنانییـەکان، دیارە لە شەڕی کاردۆخەکاندا هەستیـان بە مـەترسییـەکی زۆر گەورە کردووە، یەکسـەر ستراتیژیەتی سەربازیو ئابووریی خۆیان گۆڕیوە؛ هەر خواخوایان بووە لە دەست کاردۆخەکان ڕزگاریان بێت؛ کەچی لەناو ئەرمەنییەکاندا و لە شاری Euxin بیر لەوە دەکەنەوە کە کۆڵۆنیای خۆیان لەوێدا دابمەزرێن. (بڕوانە لاپەڕە ١٢ی پێشەکی بەرگی یەکەمی ANABASE).

(٤) ئێمە لە کۆتایی مانگی پایزی ساڵی (٤٠١)ی پێش زایینی مەسیح داین، لە وڵاتێکی شاخاویدا. هەوا خەریک بوو ماوەیەکی

دیکه خۆشی دەکردەوە. ئەم هەوا خۆشبوونەوەیەش لە نزیک گۆمی وانەوە سەرچاوەکەی خۆی وەرگرتووە، لە نزیک شوێنێک کە بەرزاییەکەی ١٦٢٠ مەترە. (وەرگێڕی فەرەنسی)

(٥) ئێگزێنۆفۆن گەلێک جاران وشەی بەربەر Barbareی بۆ کاردۆخەکان بەکارهێناوە، ئەم وشەیەش ئەمڕۆ واتای « خەڵکی دڕندە و دواکەوتوو» دەگەیەنێ، بەڵام لای یۆنانییەکان و لای ئێگزێنۆفۆنیشدا، بێگومان، هەموو ئەو میللەتانە دەگرێتەوە کە کولتووری هیللینی (یۆنانی) هێشتا باڵی نەهاویشتبووە سەر وڵاتەکەیان. بڕوانە: دوکتۆر جەمال ڕەشید: لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەبارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا؛ ١٩٨٨، لاپەڕە (١٢).

(٦) ئەم سێ دووربینەوانە، هەڵبەتا، هەر یەکەیان دەستەیەک سەربازی خۆیان لەگەڵە، کەواتە بە هەموویان ژمارەیان (٣٠٠) کەسە، کە بەشی هەرە زۆریان، لەگەڵ دوو سەرکردەیان، سەبارەت بەوەی لە دواوەی لەشکرەکە بەجێ مابوون، دەکوژرێن. ئەم زیانە هەژەندە ئێگزێنێفۆن ناچار دەکات لەگەڵ کاردۆخەکان بکەوێتە بەستنی پەیمانی ئاشتییەوە. (وەرگێڕی فەرەنسی).

(٧) ئێرە یەکێکە لەو شوێنە هەرە دەگمەنانەی کە ئێگزێنۆفۆن لە سەرتاپای کتێبی (ئاناباز)دا ژیانی بکەوێتە مەترسییەوە. (وەرگێڕی فەرەنسی).

(٨) زێی ناوەڕاست Centrites دەبێ هەر (بۆتان سوو) بێت. ئەو گوزرەگایەی کە یۆنانییەکان پێیدا ڕۆیشتوون، دەبێ کەوتبێتە باشووری شاری سیرت Sert ی ئەمڕۆ. بۆتان سوو کە سەربەرەوخوار دەبێتەوە، بە دەستەڕاستدا پێش ئەوەی لەگەڵ ڕووباری دیجلەی ڕۆژئاوا بە دە کیلۆمەترێک یەک بگرنەوە، زێی بەتلیسی تێ دەڕژێ. (وەرگێڕی فەرەنسی).

(٩) « کورد وەک میللەت دەبێت پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەم خالدییانە chaldeens دانیشتووی هەمان وڵاتی کوردەواری هەبووبێت: هەروەک مێژوونووس لێرخ LERCH ویستوویەتی بۆی بچێت» بڕوانە د. جەمال ڕەشید: لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەبارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری؛ بەغدا:١٩٨٨، ل١٥-٣٣ و ١٩١-١٩٥.

(١٠) ئەم وەسفکردنەی بۆ وڵاتی ئەرمینیا لەگەڵ واقیع و لەگەڵ بیروڕای مێژوونووسە هاوچەرخەکان یەکتر ناگرێتەوە. بڕوانە:
R.BLANCHARD:L Armenie, P. 109-127.in"Geographie universrlle de Vidal de la Blache el Gallios. T.Vlll. Paris: 1929".

(١١) زانراوە کە ئێگزێنۆفۆن لێرەدا سەرچاوەکانی دیجلەی لێ تێکەڵ بە زێی بەتلیس بووە. ئەم ڕووبارە سەرچاوەکانی خۆی لە باشووری ڕۆژئاوای گۆمی وانەوە هەڵگرتووە. واتە لە بۆتان سووەوە Centrites زێی ناوەڕاست. ڕاستییەکەی، سەرچاوەکانی دیجلە کە زۆر نزیکن لە ڕووباری فوراتەوە چەند سەد کیلۆمەترێک لە باشووریدا گۆمی Goljuk هەیە. بڕوانە نەخشە ژیۆگرافییەکەی: E. Reclus,p.387 (وەرگێڕی فەرەنسی).

(١٢) هەڵبەتا دەردەکەوێ کە بەشێکی فراوانی باکووری کوردستانی ئەمڕۆ، لەو سەردەمەدا لەژێر دەستی ئەرمەنەکاندا بووە. بەڵگەی ئەم قسەیەش ئەوەیە کە ئێگزێنۆفۆن باسی مەڵبەندە کوردنشینەکانی ئەمڕۆ لە چوارچێوەی وڵاتی ئەرمینیادا Armenie دەکات؛ تەنانەت لە بەشی پێنجەمدا، لە بەندی (١) تاکو(٥) دەبینین یۆنانییەکان هێشتا هەر لە دەوروبەری شاری وان و مەڵازگەرد دان. ئەم دوو شارەش ئەمڕۆ، وەک دەزانین، دوو شاری کوردنشینن. بڕوانە لاپەڕە ٢٦ی وەرگێڕانە فەرەنسییەکە.

### ئەندێکس

(لە لاپەرە ١٩١-١٠٩ی وەرگێرانە فەرەنسییەکە وەرگیراوە)

کاردۆخەکان Cardouques : خەڵکێکی چیایین لە کەناری چەپی ڕووباری دیجلەدا دەژین، مل بۆ پاشا شۆڕ ناکەن و یاخین. یۆنانییەکان کە دەگەنە دەستەویەخەیان دەبنەوە، حەوت شەو و حەوت ڕۆژیان پێ دەچێ تا لە دەستیان قوتار دەبن.

میدیا Madia: شاژنی وڵاتی مێد Medie.

میدیاییەکان Mrdes: لەلایەن فارسەکانەوە دەسەڵاتیان لێ سەندراوەتەوە؛ جوانیی ژنەکانیان.

ئەرمینیا: بە زێی ناوەڕاست Centrites لە وڵاتی کاردۆخەکان جیا دەبێتەوە؛ ڕووباری دیجلەو فورات لەوێوە سەرچاوە دەگرێ.

ئاسیریا: لە ڕۆژئاوایەوە ڕووباری دیجلەی پێدا دەڕوا، درێژ دەبێتەوە تا وڵاتی میدیاییەکان.

زێی ناوەڕاست Centrites: (=بۆتان سوو، دیجلەی ڕۆژهەڵات)

ژیمنباس Gymnias: (=بایبوورت Baibourt) لەوڵاتی Scythenes.

لاریسیا Larissa:(=نمرود) بیابانێکە دەکەوێتە خوارووی زاپاتاس Zapatas.

زاپاتاس Zapatas: (زێی گەورە) لەلای دەستەچەپی ڕووباری دیجلە.

مێسپیلا Mespila: بیابانێکە لە نزیک نەینەوا، لە دەستەچەپی ڕووباری دیجلە؛ کەلەک–Kalakh؛ بە ئاسیری ماشپیل Maschpil.

فارسەکان Prrse: دەسەڵات بەسەر ئیمپراتۆریەتی میدیاییەکاندا دەگرن، جوانیی ژنەکانیان؛ تیروکەوانیان، سوارچاکەکانیان، چۆن منداڵە شازادان دەڕفێنن، بەسەری ڕووتی دەچنە شەڕ.

تێلیۆواس Teleboas: (=قەرەسوو) دەڕژێتە ناو ڕووباری فوڕاتەوە.

هارپاسۆس Harpasos:(Tschorouk=) چەمێکە لە ڕۆژهەلاتی شاری ترابزۆن.



هەولێر، بەپەڕەمووچی مستەر ریچ - ١٨٢٠

# ئێدوارد زاخاو

## کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا ٥٥٠ی زایینی

کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا (تأريخ اربيل) کتێبێکی دانسقەی گرنگە، بە زمانی سریانی Syryaque لە ساڵی (٥٥٠)ی زایینی (واتە لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی خوسرەوی یەکەم نەوشیروان) پێش لە دایکبوونی پێغەمبەر (د.خ.)، لەلایەن قەشەیەکی مەسیحییەوە بەناوی (مشیحا زیخا) لەبارەی (مێژووی ژیانی سیاسی و دینی لە هەولێر) نووسراوە.

ئەم کتێبە سریانییە، کە یەکێکە لە کۆنترین دەسنووسەکان لەبارەی کوردستان، بەردەست کوردناسی ئەڵمانی، ئێدوارد زاخاو Edward Sachau کەوتووەو لە ساڵی ١٩١٥ لە بەرلینی رۆژئاوا تەرجەمەی کردووە، وێڕای پێشەکییەک چاپ و بڵاوی کردووەتەوە. برای دڵسۆزمان، کاک عەبدولموئمین دەشتی، تەرجەمە ئەڵمانییەکەی ئەم دەسنووسە سریانیەی، لەگەڵ پێشەکی و لێکۆڵینەوەکەی ئێدوارد زاخاو وەرگێڕاوەتە سەر کوردی و لە ساڵی ١٩٩٥ لە رێگەی بنکەی چاپەمەنی سەکۆوە لە بەرلینی رۆژئاوا چاپ و بڵاوی کردووەتەوە.

تەرجەمە کوردییەکەی عەبدولوئمین دەشتی بریتییە لە ١٧٠ لاپەڕەی نیو A4، لە شەش بەش پێکهاتووە: پێشەکی وەرگێڕ، پێشەکی دانەر، پێشەکی دانەری کرۆنۆلۆژیا، ئابلی مامۆستا، بڵاوبوونەوەی ئایینی عیسایی لە دەوروبەری ساڵی ٢٢٤ زاییندا، ئینجا وەرگێڕدراوی دەقەکان.

ئەم کتێبە سریانییەی مشیحا زیخا، کە لە ساڵی (٥٥٠)ی زایینیدا نووسراوەو خۆشبەختانە ئەمڕۆ وەک بەڵگەنامەیەکی کۆنکرێت لە بەردەست ئێمە دایە، چەندین بایەخی جۆراو جۆری هەیە:

١- ئەم کتێبە ئینسیکلۆپیدیایەکی فرەوانە لەبارەی هەولێری ساڵانی (٥٥٠)، واتە هەولێری سەردەمی ساسانییەکان و ئاشورییەکان. تۆژەری کورد دەتوانێ هەرچی زانیارییەکی پەیوەندییان بە ژیانی دینی و سیاسی ئەو سەردەمەی هەولێرەوە هەبێت، وەریانبگرێت.[١]

٢- لەسەر ئاستی کوردستاندا، ئەم کتێبە قۆناغەکانی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی دینی مەسیحییەتمان بۆ رووناک دەکاتەوە لە کوردستاندا، چونکە وەک دەزانین مێژووی کوردستان لە قۆناغی پێش بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلام هێندە ئاشکرا نییە.

٣- لەبواری نووسین بە زمانی کوردی و، هەروەها بەشێوەیەکی گشتی نووسین لە کوردستاندا، وەڵامی چەند پرسیارێکی گرنگمان دەداتەوە: ئایا ئەم کتێبە سریانییە دەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە لە ساڵی ٥٥٠دا نووسین لە کوردستان بە زمانی سریانی بووە؟ ئایە ئەم کتێبە سریانییە دەبێتە بەڵگەی ئەوە کە لە ساڵی ٥٥٠دا نووسینی کوردی بە ئەلفا بێی سریانی بووە؟ یان بە پێچەوانەوە بەکارهێنانی زمان و ئەلفا بێی سریانی تەنیا لەناو چین و توێژی رێبەرە دینی و قەشەکاندا بەکار هاتووە؟

کەواتە ئەدی – لەم حاڵەتەدا – زمانی کوردی چ شتێکی پێ نووسراوە؟ بۆ نووسین بە زمانی کوردی چ رێنووس و ئەلفا بێیەک بەکار هاتووە؟

٤- ئەم دەسنووسە گرنگەی کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا جەختی لەسەر ئەو راستییە مێژووییە دەکاتەوە کە شاری ئەربێللا (ئەربەئیلۆ) بە راستی یەکێک بووە لەو شەش بنکە گرنگەی کە دیانەتی مەسیحی لێوە بڵاوکراوەتەوەو یەکێک لە پایتەختەکانی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری بووە[٢].

رۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی، ئۆرتیز دوو ئوورین Ortiz de Urbine لە باسێکی ئەکادیمی خۆیدا بەناونیشانی (بەهای مێژوویی کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا) کە بە زمانی ئیتاڵی لە گۆڤاری وەرزیی رۆژهەڵاتناسیانەی مەسیحیدا لە رۆما لە ساڵی ١٩٣٦ بڵاوی کردووەتەوە، بە تێروتەسەلی بایەخی جۆراو جۆرەکانی ئەم کتێبەمان بۆ روون دەکاتەوە[٣].

شایەنی باسە، ئەم دەسنووسە سریانییە، پێش ئەوەی لەلایەن ئێدوارد زاخاوی ئەڵمانییەوە لە ساڵی ١٩١٥دا بکرێتە ئەڵمانی، لەلایەن قەشەیەکەوە بەناوی ئلفۆنس منکنا ساڵی ١٩٠٧ کراوەتە عەرەبی و بەناونیشانی (التأريخ الأربيلي) لە بەرگی یەکەمی گۆڤاری (مصادر سريانية) لە مووسڵ بڵاوکراوەتەوە.

ئێمە لە کاتێکدا دەسخۆشی و ئافەرین لە کاک (عەبدولمۆئمین دەشتی) وەرگێری ئەڵمانی ئەم دەسنووسە گرانبەهایە دەکەین دەڵێین، بە پێویستی دەزانین دێرێکیش لەبارەی ئێدوارد زاخاوی وەرگێری ئەڵمانی روون بکەینەوە.

ئێدوارد زاخاو Edward Sachau مۆژدەگارێکی Missionair کوردناسی ئەڵمانی بووە، لەماوەی نێوان نیوەی دووەمی سەدەی رابردوودا ژیاوە، بەپێی بروانامەی دکتۆراکەی کاک د. کەمال فوئاد کە لە بەرلین لە ساڵی ١٩٧٠دا چاپ کراوە، ئێدوارد زاخاو لە ماوەی ساڵانی ١٨٨١ تاکو ١٨٨٥ لە مووسڵ بووەو سەری لە کوردستانیش داوە. سەفەرنامەیەکی خۆیشی لەم بارەیەوە بەناونیشانی (لە حەلەبەوە تاکو مووسڵ) بڵاوکردووەتەوە.

ئێدوارد زاخاو دوو کتێبی گرنگی دیکەی بە زمانی ئەڵمانی بڵاوکردووەتەوە کە باسی کوردستانی تێدا کردووە، لەوانە: (بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت لە ئاسیا) لە ساڵی ١٩١٩ لە بەرلین؛ دووەمیان: (بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت لە وڵاتی فارس) لە ساڵی ١٩١٦ لە بەرلین، کە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای زانستی پرووسین.

ناوبراو، هەمان ئەم ئێدوارد زاخاوەیە کە دەیان دەسنووسی سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمی بە زمانی کوردی کۆکردوونەتەوەو لە فەوتان رزگاری کردوون. هەندێک لەم دەسنووسانە، ئەمانەن:

١- مەم و زینی ئەحمەدی خانی، شیعرە، بە دیالێکتی کرمانجی، بە ئەلفا بێی عەرەبی، لە ساڵی ١٨٨٥ لە مووسڵ نووسراوەتەوە.

٢- مەم و زینی ئەحمەدی خانی بە دیالێکتی کرمانجی، بە ئالفا بێی سریانی، تەرجومەیەکی خراپی عەرەبیشی لەگەڵە. لە ساڵی ١٨٨٥ لە مووسڵ نووسراوەتەوە.

٣- چەند تێکستێکی شیعری لیریکی فۆلکلۆری کوردی، بە دیالێکتی کرمانجی، بە ئەلفا بێی سریانی، ئارمیا شامیر Armya Shamir ناوێک لە ١٨٨٣ لە مووسڵ نووسیویەتیەوە.

٤- دوو حەکایەت، بە کوردی کرمانجی و بە (فلێحی)، بە شیعر، ئارمیا شامیر لە مووسڵ لە ١٨٨٣ نووسیویەتیەوە.

هەروەها قاموسێکی کرمانجی هەکاری و (محادثات) بە (فلێحی) و کوردی و چەندانی دیکەش.

شایەنی باسە، هەموو ئەم دەسنووسانەو چەندینی دیکەش، لە بڕوانامەی دکتۆراکەی د. کەمال فوئاددا کە بە زمانی ئەڵمانی لە بەرلینی رۆژئاوا لە ١٩٧٠دا چاپ کراوە، خراوەتە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەیەکی وردی ئەکادیمییەوە.

لە کۆتاییدا دەڵێین خۆزگە هەر قوتابییەکی کورد لە هەندەران، لە ئەوروپا، بە چەشنی کاک عەبدولموئمین دەشتی، ئاوها: هیچ نەبێ «یەک کتێبی» گرنگی لەبارەی کوردستان، لە زمانی ئەو وڵاتە ئەوروپییە وەردەگێڕایە سەر زمانی کوردی.

نەورۆزی ١٩٩٨

**سەرچاوە:**


١- پ. پیتەر P. Peeter: شەهیدەکانی ئەربێللا، لە (هەڵبژێردراوە پۆڵەندییەکان)، ژ (٤٣)، پاریس: ١٩٢٥، بە فەرەنسی.

٢- ف. زوریل: تأریخ کنیسة أربیل، في مجموعة الشرقيات المسيحية، عدد ٣١، مجلد ٤ و ٨، روما: ١٩٣١. لەم سەرچاوەیەدا باسکراوە:

جان فییەک تأریخ أربیل، مجله الشرق السریانی، عدد ١٢، ١٩٦٧، ص٢٦٥ - ٣٠٢، بە عەرەبی.

3- Hinna Fiee: Jalon Pour une histoire de Eglise en Iraq in “S.C.O”, Lovan: 1970, P.110 - 112.

# کوردستان

## لە سەفەرنامەکەی مارکۆ پۆلۆی جوگرافیاناسی ئیتاڵیدا

خوێندنەوە و شیکردنەوەیەکی مێژوویی

**مارکۆ پۆلۆ** M. polo

مارکۆ پۆلۆ (١٢٥٤ - ١٣٢٤)، جوگرافیاناس و گەڕاڵی ناوداری ئیتاڵی، لە شاری ڤینیز لە ئیتاڵیا لەدایک بووە. یەکێکە لە یەکەم ئەورووپاییەکان، دوای مێژوونووسە یۆنانییەکان، کە باسی کورد و وڵاتی کوردی کردبێت. کاتێ لەدایک بووە، باوکی چۆتە سەفەر و نەیبینیوە، ئیتر ئەویش کە گەورە دەبێ، شوێن پێی باوکی هەڵدەگرێت و دەڕوا. لە ساڵی ١٢٧٥ دەگاتە چین و لەلایەن پاشای چینەوە پێشوازی لێ دەکرێ. شازدە ساڵ دوای ئەوە، کە دەگەڕێتەوە ئەورووپا، لە ساڵی ١٢٩٧ لە جەنگێکدا دەسبەسەر دەکرێت و زندان دەکرێ. سەفەرنامەکەی خۆی لە زینداندا دەنووسێتەوە و دەینێری بۆ نووسەرێکی هاوڕێی خۆی بە ناوی رووستێچێللۆ. پاشان بە دەسنووس دەستاودەست دەکرێت و بڵاودەبێتەوە[١].

### مێژوولکەی سەفەرکردن بەرەو رۆژهەلات

یۆنانییەکانی زەمانی دێرین Grec، یەکەم کەسن هاتوونەتە کوردستان و بۆ یەکەم جار کتێبیان لەبارەی کورد نووسیوە.[٢] دوای ئەوان، کتێبە پیرۆز و ئاسمانییەکان بە دووەم سەرچاوەی گرنگ دەژمێردرێن لە باسکردنی وڵاتی کورددا[٣]. پاشان، گەڕاڵ و جوگرافیاناس و مێژوونووسە موسڵمانەکان لەباری کرۆنۆلۆژییەوە، دووەم دەستەی ئەو زانایانەن کە لە سەدەی دەیەمی زایینی بەملاوە رۆژهەلات و کوردستان بە دنیا دەناسێنن.[٤]

بە رای ژیرار شالیان، یەکەمین جوگرافیاناسی ئەورووپی هاتبێتە کوردستان جوولەکەیەکی ئیسپانی بووە، بنیامێن دو توودێل B. DE TUDELE کە لە ماوەی ساڵانی ١١٦٣- ١١٧٣ سەفەرنامەکەی خۆی نووسیوەتەوە.[٥]

جگە لە ئەو، چەند گەڕاڵ و جوگرافیاناسێکی دیکە رۆڵێکی گرنگیان هەبووە لە دامەزراندنی بیری رۆژهەلاتناسی و ناساندنی کورد، لەوانە: جوگرافیاناسی ئەرمەن، هیتوومی یەکەم HETDUM Iبا کە لە ساڵی ١٢٥٤دا بە کوردستاندا تێپەڕیوە و چۆتە تەورێز؛ جوگرافیاناسی چینی، رابان ساوما RabbanSAUMA لە ساڵانی ١٢٨٧ - ١٢٩٠دا لە شاری پەکینەوە بە رێگای سەمەرقەندەوە هاتۆتە تەورێز پاشان بە کوردستانی ئێران و تورکیای ئەمڕۆدا تێپەڕیوە تا گەیشتۆتە دەریای رەش و سەفەرنامەیەکی بایەخداری هەیە؛ جوگرافیاناس، مۆنتەر کۆرڤین MONTERCORVIN لە ماوەی ساڵانی ١٢٩١ - ١٢٩٤ هاتۆتە کوردستان؛ سێمپات کۆنێتابل Sempat Connetable کە لە ١٢٤٧ - ١٢٤٨دا بە شارەکانی کوردستانی تورکیای ئەمڕۆدا تێپەڕیوە و چۆتە سەمەرقەند.[٦]

**ئامانج و مەبەستی رۆژهەڵاتناسەکان:**

١- ستراتیژیەتی دینیی مەڵبەندی کوردستان

کوردستان بێشکەی دین و دینزاکانی جیهانە. رێبەرانی هەر دینێک ویستوویانە خەڵکی کورد بۆ لای خۆیان رابکێشن، یان بە لای کەمەوە بێن کوردستان بکەنە مەیدانی پەرە پێسەندنی ئەو دین و مەزهەبە دیاریکراوەی خۆیان. لەوانە جوگرافیاناس و موژدەگارMissionnaires و گەڕاڵە ئەوروپاییەکانیش.(٧)

لە سەدەی ١٢مدا، شەڕی خاچپەرستەکان لەگەڵ هێزی ئەییووبییەکان و هێرشهێنانیان بەرەو رۆژهەڵات، لەلایەکی دیکەشەوە بەهێزبوونی دەسەڵاتی هەنگاریا و لە رۆژهەڵاتیشدا بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی مەنگۆلیی جەنگیزخان، پاشانیش بڵاوکردنەوەی دینی مەسیحی و بە مەسیحی کردنی جیهان Evangilisation لەنێوان سەدەی ١٢ و ١٣مدا بوونە هۆی ئەوەی کە پەیوەندیی سیاسی و بازرگانی و هاتوچۆکردن لەنێوان ئەم دوو جیهانەدا پەرە بستێنێت.(٨)

یەکەمین گرووپی ئەو موژدەگارە مەسیحییانە، بە سەرۆکایەتیی Aorentin RICOLDO لە ساڵی ١٢٨٨ دا بوو، واتە لە سەردەمی گەشتەکەی مارکۆ پۆلۆدا، گەیشتنە ئێران (شاری تەوریز) پاشان بە ناوجەرگەی کوردستاندا چوونە شاری مووسڵ.(٩)

٢- ستراتیژیەتی سیاسیی مەڵبەندی کوردستان

لە رووی سیاسی و سەربازیشەوە، کوردستان بایەخێکی ستراتیژیی مەزنی هەبووە. ئێگزێنۆفۆن، بۆ نموونە، ئەگەر مەبەستێکی سیاسی و سەربازیی لە کوردستاندا نەبووایە نەدەهاتە کوردستان و شاکارەکەی بەناوی ئاناباز بنووسێت. بە هەمان شێوە، ئەسکەندەری مەکەدۆنیش ئەگەر هەولێری بە مەڵبەندێکی ستراتیژی - سیاسی نەزانیبایە و کوردستانی داگیر نەکردایە، نیگارکێشە ئەوروپاییەکان ئەو هەموو تابلۆ و دیواربەندە جوانایەیان لەبارەی شەڕی ئەربێللا دروست نەدەکرد. تەنانەت عەرەبە موسڵمانەکانیش، لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا، لە سەرەتادا هاتن کوردستانیان داگیر کرد: کوردستانیان کرد بە بنکەیەک بۆ بڵاوکردنەوەی دەسەڵات و هێرشەکانی خۆیان بۆ سەر ئەستەمبۆڵ و رووسیا.(١٠)

٣- ستراتیژێەتی بازرگانی و ئابووریی مەڵبەندی کوردستان

لە سەدەکانی رابردوودا، بەشی هەرە زۆری رێگا بازرگانییەکانی نێوان دەوڵەتانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بە کوردستاندا تێدەپەڕین. کوردستان کاروانسەرای رێگا ناوادارە بازرگانییەکەی '' ئاوریشم '' بووە. ئەم رێگا بازرگانییانەی خوارەوە، هەموویان بە کوردستاندا تێپەڕیون: رێگای بازرگانیی نێوان چین و ئاسیای بچووک، رێگای بازرگانیی نێوان چین و وڵاتانی رۆژئاوا، رێگای نێوان رووسیا و وڵاتانی عەرەب، رێگای نێوان وڵاتی فارس و جیهانی رۆژئاوا.(١١)

ئیمپراتۆریەتی مەنگۆلی لە سەدەی سێزدەهەمدا، واتە لە سەردەمی مارکۆ پۆڵۆدا، لە وڵاتانی رۆژئاوادا وا ناسرابوو کە تاقە هێزێکە لە رۆژهەڵاتدا لەدوای ئێسلام شان لە شانی هێزی ئیسلام بدا. ئەمە خولیای جوگرافیاناس و سیاسییەکانی بەجۆشتر دەکرد بۆئەوەی بێن سەر لە رۆژهەڵات بدەن و لێی بکۆڵنەوە. شاری ڤینیز بە هۆی هێزە دارایی و دەریاییەکەیەوە، لە سەدەی ١٢م بەملاوە، ببووە مەڵبەندێکی گرنگی هاتوچۆی ئەورووپا.

بەم شێوەیە، مارکۆ پۆلۆی گەنج، تینووی گەڕان و پشکنین، لە ڤینیزەوە بەڕێ کەوت. دوای شازدە ساڵ گەڕان و سووڕانەوە بە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا، سەفەرنامەکەی خۆی نووسییەوە؛ بووە سەرچاوەیەکی گرنگی مێژووی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات. ئەم سەفەرنامەیەی، چەند وەختی زیاتری بەسەردا بڕوا هێندە بە نرختر دەبێ. لەم سەفەرنامەیەیدا بە ناونیشانی (کتێبی عاجباتییەکان Le Livre des Merveilles) باسی ورد و درشتی ئەم وڵاتانە دەکات: ئاسیای بچووک، چین، مەنگۆلیا، هیندستان، خۆراسان، عیراق، ئێران، تورکستان، گۆبێ، تیبت، سۆمەترە..هتد(١٢).

## کورد لە سەفەرنامەکەی مارکۆ پۆلۆدا

کتێبی ڕۆژهەڵاتناسەکان، تەنانەت تا سەدەی نۆزدەهەم، ڕاستەوخۆ باسی کوردستانیان نەکردووە: بەشێکی زۆر کەمیان تەرخان کراون بە کورد. هۆی ئەمەش، دیارە ئەوەیە کە کورد، بەپێچەوانەی عەرەب و تورک و فارس یان ئەرمەن، هەرگیز دەوڵەتێک یان قەوارەیەکی سیاسیی سەربەخۆی بە ناوی خۆیەوە نەبووە. هەمیشە لە چوارچێوەی چەند ویلایەتێکی جۆراوجۆری سەر بە دەوڵەتێکی فارس و عەرەب و تورکدا ژێردەستە ژیاوە، یانیش بەسەر چەند میرنشینێکی سەر بەو دەوڵەتە غەیرە کوردانەدا دابەش کراوە. وەک لەم سەفەرنامەیەی مارکۆ پۆلۆشدا دەبینین، بۆ ساغکردنەوەی وێنەی ژیانی کورد و نیشتیمانەکەی، پێویستە بچین ئەو لاپەڕانە هەڵبدەینەوە کە لەبارەی بۆ نموونە "ئەرمینیا"، "عیراقی عەجەم" یان "جیبال" و "ویلایەتی مووسڵ" نووسراون.

ئەو سەردەمەی کە مارکۆ پۆلۆ گەشتەکەی بەرەو کوردستان کردووە بریتی بووە لە ساڵانی ١٢٧٠. کتێبەکەیشی لە کۆتایی ساڵانی ١٢٩٠دا نووسیوەتەوە. مەنگۆلەکان لە ساڵی ١٢٥٨دا بە سەرکردایەتیی هۆلاکۆ بەغدایان داگیرکرد و خەلافەتی عەبباسی کۆتایی پێ هات. هۆلاکۆ یەکەم فەرمانڕەوای ئیلخانییەکان بووە (١٢٥٦ ـ ١٢٦٥). مارکۆ پۆلۆ لە کتێبەکەیدا ئیلخانییەکان بە Tartares ناو دەبات.

کەواتە، لە سەردەمی گەشتەکەی مارکۆ پۆلۆدا بارودۆخی سیاسیی کوردستان بەشێوەیەکی گشتی بەم شێوەیە بووە(١٣):

- میرنشینی کوردە حەمدانییەکان لە ناوچەی جەزیرە (٩٢٩ - ١٠٠٤).
- شەدادییەکان لە ڕۆژئاوای باکووری کوردستاندا (٩٥١ - ١١٧٤).
- حەسنەوییەکان لە باشووری کوردستاندا (٩٥٩ - ١٠١٥).
- مەڕوەندییەکان لە دیاربەکر (٩٩٠ - ١٠٩٦).
- بەنو ئەنناز لە کوردستانی تورکیای ئەمڕۆدا (٩٩١ - ١١١٧).
- ئەییووبییەکان (١١٦٩ - ١٢٥٠)... تازە هەرەسیان هێناوە و کۆتاییيان هاتووە. پۆلۆ زوو پێیان ڕانەگەشتووە باسیان بکات.
- میرنشینی کوردەکانی شەبانکارە (شوانکارە) لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێرانی ئەمڕۆدا (لە سەدەی ١١ و ١٢ و ١٣دا) فەرمانڕەوا بوونە، بەڵام قەوارەی سیاسیی سەربەخۆیان نەبووە و لەژێر چاودێری خوارەزمەشاهی و سەلجووقییەکاندا بوونە. پۆلۆ لەم نووسراوەیدا ناوی بردوون.
- سوڵتان سەنجاری سەلجووقی لە ساڵی ١١٥٠دا، بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی ئیسلامیدا ئۆتۆنۆمی دەبەخشێتە کوردەکان لە باشووری ڕۆژئاوای کوردستاندا (ئێرانی ئەمڕۆ)، ناویش لەم ناوچە ئۆتۆنۆمییە دەنێ "ئوستانی کوردستان". بەپێی قسەی مارکۆ پۆلۆ، ل ١٦: دواین ئیمپراتۆری بەهێزی سەلجووقیی ئێران سوڵتان سەنجاری سەلجووقی بووە.

سنووری سیاسیی ئەم کوردستانە سەلجووقییە گەلێک تەنگ و بچووک بووە، بریتی بووە لە تەنیا چەند شارێکی کوردستانی ئێرانی ئەمڕۆ. پایتەختی ئەم ئوستانە شاری (بەهار) بووە کە پاشان لە کۆتایی سالآنی ۱۲۹۰دا گوێزرایەوە شاری سوڵتان ئاباد. هەر ئەم ئوستانەشە کە مارکۆ پۆلۆ لەم نووسینەیدا ـ لە چوارچێوەی ژماردن و ناوبردنی ویلایەتەکانی ولآتی پێرس دا ـ باسی دەکا.

کەواتە ئەو کوردستانە سەلجووقییەی لەسەر نەخشەی سیاسیی گەشتەکەی مارکۆ پۆلۆدا دەبینرێت کوردستانی گەورە نییە، بەڵکو بریتییە لەو ئوستانەی کە سوڵتان سەنجاری سەلجووقی لە ساڵی ۱۱۵۰دا لە باشووری رۆژئاوای کوردستاندا (کە تاکو ئەمڕۆش لە ئێرانی ئەمڕۆ دا بە ناوی ئوستانی کوردستان ناوی هەر ماوە) دروستی کرد. واتە کورد لە ویلایەتی دیکەشدا هەبوونە و لە شوێنی دیکەشدا ژیانیان هەبووە. چونکە ئەو کاتەش هەر نیشتیمانی کورد بەسەر ئیمپراتۆریەتی فارس و تورک و عەرەبەکان دابەش کرابوو، کورد بە پەرت و بلآوی لە ویلایەت و ئوستان و میرنشینە جۆراوجۆرەکاندا دەژیان. بۆیەش دەبینین، مارکۆ پۆلۆ، جگە لەم ئوستانی کوردستانە، لە شوێنی دیکەشدا ناوی کورد دەهێنی و باسی نەژادی کورد دەکات، بۆ نموونە لە باسکردنی ویلایەتی مووسڵدا، کە ئەو کاتە لەژێر چنگی ئیمپراتۆریەتی مەنگۆلیدا بووە.

– ئەو ماوەیەی گەشتەکەی پۆلۆ، سالآنی دوای بلآوبوونەوەی مەزهەبی یەزیدی و ژیانی شێخ عەدی (۱۰۷۳ ـ ۱۱٦۳) بووە.



ژن و مێردێکی یەزیدی

ـ مارکۆ پۆلۆ ئاماژەی ئەوە دەکات کە کوردەکانی ویلایەتی مووسڵ، مەسیحیی ژاکۆبی و نەستۆرین. ئەمە واتای ئەوەیە کە کوردەکانی ئەو ناوچەیە لە مێژووی پێش بلآوبوونەوەی دینی ئیسلامدا مەسیحی بوونە و لە سەردەمی پۆلۆدا هێشتا بەتەواوەتی نەبوونەتە موسڵمان.

### تێکستەکە[١٤]

### دەسپێکردنی ئەرمینیای بچووک

ئەمە راستە کە دوو ئەرمینیا Armenie هەیە، یەکێکی گەورە و یەکێکی بچووک[١٥]. بچووکەکەیان پاشایەک فەرمانڕەوایەتیی دەکا کە لە شاری سیڤاستۆ Sevasto دادەنیشی و لە هەموو شوێنێک ناسراوە. دادپەروەرانە فەرمانڕەوایەتی دەکا و هیچ پیاوخراپێک لە دەستی قوتار نابێ. دانیشتوانەکەی هەرچەند مەسیحین، بەڵام باوەڕێکی راستەقینەی وەک باوەڕی رۆمانییەکانیان نییە. من پێتان دەڵێم کە ئەمە مەڵبەندێکی مەسیحیانی نییە. جاران پیاوماقووڵەکانی ئەم مەڵبەندە لە بەکارهێنانی چەکدا کارامە و جەسوور بوون، بەڵام ئەمڕۆ بوودەڵە و هیچن. ـ بەشی بیستەم، ل ٦٧ ـ ٦٨.

سنوورەکانی ئەم میرنشینەی ئاسیای بچووک ئاوهان: بە لای دەریای ناوەڕاستەوە Midi : سەرزەمینی پەیمانەکە موسڵمانی تێدا دەژی، لە نزیک رۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستیشدا خەڵکانێک دەژین پێیان دەڵێن تورکمان Turco-man[١٦] کە بە قارەمانیش Caramani ناویان دەبەن. لە لای رۆژهەڵاتیشدا تورکیایە و شاری قەیسەری و سیڤاسSevasto. لە بەری رۆژئاواشدا: ئەو دەریایەی کە پێیدا دەچینەوە وڵاتی مەسیحییەکان. ـ ل ٦٨.

بەشی ٢١: ل ٦٩.

لە مەڵبەندی تورکمان Turcomanدا سێ جۆر خەڵک دەژین: تورکمان، کە محەمەد دەپەرستن و وەکو ئاژەڵان دەژین. لە هەموو شتێکدا میللەتێکی نەزان و جاهیلن، زمانێکی وەحشییانەیان هەیە و لە زمانی میللەتانی تر ناچێ. ماڵیان نییە، لەناو شاخ و داخان لەگەڵ ئاژەڵەکانیان دەژین و کۆچەرن. خەڵکی تر: ئەرمەنییەکانن، کە خەڵکانێکی مەسیحیی زۆر رێک و پێکن، پاشانیش یۆنانییەکان کە هەردووکیان تێکەڵ لەناو شار و دێهاتەکان دەژین. خەریکی بازرگانی و پیشەی جۆراوجۆرن. ناودارترین شارەکانی ئەم مەڵبەندە ئەمانەن: قۆنیا[١٧]، قەیسەری، سیڤاس. سانت بلاسیۆس لە ساڵی ٣١٦دا لە سیڤاس شەهیدکرا لەپێناو مەسیح. ئەم سێ شارە زۆر دەوڵەمەند و ئاوەدانن.

### ئەرمینیای گەورە

بەشی ٢٢: ل ٧٠

ئەرمینیای گەورە مەڵبەندێکی یەکجار فراوانە. لە هەموو شوێنێکدا هەمان زمان بەکاردەبەن و لە زمانی مەڵبەندەکانی تر جیاوازە. بەشێوەیەکی گشتیش دەچێتەوە سەر زمانی ئەرمێنیای پچووک. لە ئەرزنجانەوە دەست پێدەکا. بەشی هەرە زۆری خەڵکەکە ئەرمەنین. شارەکانی دیکەش بریتین لە ئەرزەڕۆم Argiron، ئەرجیش، بایبوورت کە دەکەوێتە سەر رێگای ترابزۆن بەرەو تەورێز.

لەم مەڵبەندەی ئەرمینیای گەورەدایە کە کەشتییەکەی نوح، وەک بیستووتانە، لەسەر لووتکەی چیایەکی یەکجار بەرز گیرساوەتەوە[١٨].

ئێستاش با وەسفی سنوورەکانی ئەم ئەرمینیا گەورەیە بکەین. باشووری، ئەمانەن: مووسڵ، مووش، ماردین[١٩]. خەڵکی مووسڵ مەسیحین: ژاکۆبی Jacobites و نەستۆرین Nestoriens. – ل ٧٣.

**وەسفی میرنشینی مووسڵ**

بەشی ٢٤: ل ٧٧

مووسڵ میرنشینێکی گەورەیە کە چەندین جۆر میللەتی تێدا دەژی. لەپێش هەموویانەوە عارەب کە هەموویان محەمەدپەرستن. جۆرە نەژادێکی دیکەشی تێدایە کە پەیڕەوی مەسیحیەتن: نەستۆری Nestoriens و ژاکۆبییەکانJacobites.

لە ناوچە شاخاوییەکانی ئەم میرنشینەدا میللەتێک دەژین پێیان دەڵێن کورد Courdes کە مەسیحیی نەستۆری Nestoriens و ژاکۆبین Jacobites. بەڵام هەندێکیان موسڵمانن Sarrazin، محەمەد دەپەرستن. ئەم میللەتە زۆر جەسوور و بەجەرگن. رم وەشێنی کارامەن، بەڵام خەڵکێکی زۆر دڕیشن، کاروانان رووت دەکەنەوە. باشترین قوماشی لە زێڕ و زیو چنراو، هەروەها جلوبەرگی بە مرواری چنراو، لەم شارەدا دروست دەکرێت. پیشەوەرەکان لەم هونەرەدا دەستێکی باڵایان هەیە.

جگە لەم شارە، مووش و ماردینیش هەن کە باشترین جۆری لۆکەی لێ دەڕوێ و قوماشی بوخێرێن و شتی تریشی لێ دروست دەکەن. بازرگانی و پیشەوەری لەم دوو شارەدا یەکجار زۆرن. ئەربێل یەکێکە لە شارە ناودارەکانی دیکەی ئەم میرنشینە. - ل ٧٨.

مارکۆ پۆلۆ، پاشان بە سەرسوڕمانەوە باسی چاڵە نەوتەکەی شاری مووسڵ دەکات، ئنجا لە لاپەڕە ٧٨دا وەسفی بەغدا و لە لاپەڕە ٨١دا وەسفی تەورێز دەکات، دەڵێ: تەورێز شارێکی گەورەی شکۆمەندە لەنێوان ئەرمینیا و وڵاتی پێرس، سەر بە ویلایەتێکی گەورەی نزیک بەغدایە بە ناوی عێراق Yrac[٢٠]. خەڵکی تەورێز لەژێر فەرمانڕوایەتیی تەتەرەکاندان، خەریکی بازرگانی و پیشەی جۆراوجۆرن. شارەکە لە شوێنێکی وادا هەڵکەوتووە کە بازرگانی خەڵکی شارانی وەک بەغدا و هیند و مووسڵ و هورمز رووی تێ بکەن. - ل ٨١.

**وڵاتی پێرس** Perse

بەشی ١٦م: ل ٩٠

وڵاتی پێرس وڵاتێکی گەورەی ئەوتۆیە کە جاران زۆر خاوەن پایە و شکۆمەند نەبوو، بەڵام ئێستا تەتەرەکان هەموویان تێک و پێک داوە و هەموو شتێکیان کاول کردووە و لە چاو جاران بچووکترە. - ل ٩٠.

لە وڵاتی پێرسدا هەشت میرنشین Rayaume هەن[٢١]: چونکە وڵاتێکی زۆر فراوانە. ئێستا ناوەکانیان دەژمێرم. یەکەمیان کە لێرەوە دەست پێدەکا ناوی قەزوینە. دووەمیان دەکەوێتە لای رۆژهەڵات ناوی کوردستانە Courdistan. سێیەمیان لوڕستان. چوارەم شوولستان Cielistan. پێنجەم ئەسفەهان. شەشەم شیراز. حەوتەم شەبانکارە Son-cara[٢٢]. هەشتەم Tunocain.

لەم میرنشینانەدا سەدان جۆر وڵاخی بەرزە هەن. دەیانبەنە هیندستان و دەیانفرۆشن. هەروەها باشترین و جوانترین کەری دنیا لەم میرنشیتانەدا هەن کە نرخیان لە نرخی وڵاغ زۆر بەرزترە. هۆیەکەشی ئەوەیە: کەمتر دەخۆن، باری زیاتر و قورستر هەڵدەگرن، ڕێگای دووریش دەگرنە بەر.

خەڵکی ئەم میرنشینانە زۆر دڕ و سەرسەخت و نالەبارن، هەمیشە لەناو خۆیاندا بەگژ یەکتردا دەچن و یەکتر دەکوژن و لە پاشای خۆشیان ناترسن. بازرگانەکان دەبێ بەپێی درێژی و کورتیی ڕێگا باج بدەن. ـ ل ٩٥.

هەر هەموو خەڵکی ئەم میرنشینانە موسڵمانن، پەیڕەوی محەمەد دەکەن. لە شارەکاندا بازرگان و پیشەوەر خەریکی بازرگانی و کار و پیشەی جۆراوجۆرن. قوماشی جۆراوجۆری بە زێڕ و ئاوریشم چنراو دروست دەکەن و دەفرۆشنەوە. لۆکە زۆر دەچێنن. – ل ٩٦.

### سەرچاوە و پەراوێز:


1- Larousse, Dictionnaire Encyclopedique, Paris: 1979, P. 1019

(٢): حبيب الله صمدي: كردستان در چهل هزار سال پيش، مجله بغستان، جلد اول، شماره اول، ظهران: ١٩٦٣، ص ٣٨ ـ٣٩.

(٣): دوگلاس لایتۆن D.Layton: کورد دناڤ تەوراتی و ئینجیلی دا، بە ئینگلیزی و کوردی، وەرگێڕانە کوردییەکەی: بێدڵ مشەخت، بڵاوکراوەکانی S.G. I، نیۆیۆرک:١٩٩٤.

4- Atlas Historique, Histoire de l Humanite; Sous la direction de P. Vidal - Naquet, ed. Hachette, Paris: 1987, P. IX.

5- Gerard CHALIAND et J. P. RAGEAU: Atlas de la decouverte du monde, ed. Fayard, Paris: 1983, P. 41 -42.

6- Gerard CHALIAND et J. P. RAGEAU: Atlas, ed. Fayard, Paris: 1983, P. 41 -42.

7- S. YERASIMOS: Les voyages , Ankara: 1991, P. 9 -10.

8- Jean - Paul ROUX: Les explorateurs au Moyan age, ed. Fayard, Paris: 1985, P. 54.

9- Jean - Paul ROUX: Les explorateurs, Paris: 1985, P. 141.

10- J. BOULOS: Les peuples et les civilisationd au Proche - orient, Ed. La Haye, Paris: 1966.

(١١): ژان باپتیست تاڤێرنیێ: (بەشێک لە شەش سەفەرنامەکەی)، بازرگانێکی فەرەنسی لە کوردستاندا، وەرگێڕانی: فەرهاد پیرباڵ، گۆڤاری مامۆستای کورد، ژمارە (١٥)، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٢.

12- Rene CLOWIER: Histoire de la geographie, Que Sais - Je, N. 65, Paris: 1972.

13- Jean DELORME: Chronique des Civilisations, Presse Univ. de France, Paris: 1969.

Marco POLO: Le devisment du monde, Le Livre 14- des Merveilles, 1er tom, ed. Francois Maspero, Paris: 1980.


(١٥): ئەرمینیای بچووک بە ناوێکی تریش ناسراوە، پێی دەڵێن Cilicie کە دەشتی ئەدەنەی تورکیای ئەمڕۆ دەگرێتەوە. دوای داگیرکردنی ئەرمینیای گەورە، ئەرمەنییەکان هاتنە ئەو مەڵبەندە و لەوێ دەوڵەتێکی بچووکیان پێکهێنا کە تاکو ١٣٧٥ درێژەی کێشا. ئەرمینیای گەورەش کە دەشتە فراوانەکانی رۆژهەڵاتی تورکیای ئەمڕۆ دەگرێتەوە، دەوڵەتێک بوو لە سەرەتای سەدەی ١١مدا بە دەستی بێزەنتییەکان خاپووورکرا.

(١٦): چەند عەشیرەتێکی تورکی کۆچەری سەر بە گرووپی Oghne بوون کە بە رەسەن لە ناوچەی کازاخستانی ئەمڕۆدا دەژیان. بۆ یەکەمجار لە سەرەتای سەدەی ١١مدا هاتنە ئێران بۆ ئەوەی ئیمپراتۆریەتی سەلجووقی پێکبهێنن. دووەم جاریش لەگەڵ مەنگۆلەکان هاتن و لەلایەن سەلجووقییەکانی ئەنادۆڵەوە سەقامگیرکران لەو مەڵبەندەدا.

(١٧): پایتەختی ئیمپراتۆریەتی سەلجووقییەکان بوو.

(١٨): بێگومان مەبەستی چیای ئاراتە.

(١٩): مووسڵ و مووش لەو سەردەمەدا لەدەست ئێلخانییەکاندا llkhanide بوون، ماردینیش بە دەست بنەماڵەیەکی موسڵمانەوە بوو بە ناوی Artoukide تاکو سەردەمی مارکۆ پۆلۆ.

(٢٠): عیراقی عەجەم، ئەوەی بەغداش عیراقی عەرەبی کە دەکاتە عیراقی ئەمڕۆ.

(٢١): میرنشین لای پولۆ ویلایەت دەگرێتەوە.

(٢٢): ئەم میرنشینەش هەر کورد بوونە، لە سەردەمی مارکۆ پۆلۆدا لەژێر فەرمانڕەوای مەنگۆلەکاندا بووە. دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای ویلایەتی فارسی ئەمڕۆ لە ئێران.

# بازرگانێکی فەرەنسی لە کوردستاندا

## لە ساڵی ١٦٣٢

نەتەوەی کورد سەبارەت بەوەی کە هەمیشە نیشتمانەکەی لەژێر نێڵی داگیرکەرە عەرەب و فارس و تورکەکاندا بووە، هەرگیز مێژووی ژیانی نەنووسراوەتەوە. ئەمڕۆ باشترین ڕێگە بۆ ساغکردنەوەی مێژووی نەتەوەییمان ئەوەیە کە بتوانین پشت بە کتێب و سەرچاوە کۆنە ئەوروپاییەکان ببەستین، بەتایبەتی جوگرافیاناس و گەشتەوەرەکانیان.(١)

لێرەدا دەمانەوێ سەرنجی خوێنەر بۆ کتێبی (سەفەرنامەی) یەکێک لەو گەشتەوەرانە رابکێشین کە لە دەوروبەری ساڵی ١٦٣٢ دا بە کوردستاندا تێپەڕیوە و چەندین بەشی کتێبەکەی (سەفەرنامەکەی) تەرخان کردووە بۆ ئاخافتن لەبارەی سروشتی ژیانی نەتەوەی کوردەوە. ئەم گەشتەوەرە (ژان - پاپتسیت تاڤێرنییێ/ Jean- Bap tiste Tavernier بازرگانێکی فەرەنسی بووە. لەساڵی ١٦٠٥ لە پاریس لە دایک بووە، واتە هاوسەردەمی لویسی چوارەم بووە.(٢)



دوو کوردی دەوڵەمەند، سەدەی نۆزدەم

تاڤێرنییێ Tavernier کە کوڕی بازرگانێکی فرۆشیاری نەخشەی جوگرافی بووە، لە ماوەی ساڵانی ١٦٣٢ تا ١٦٦٣ دا شەش جاران هاتۆتە وڵاتی ئێران و تورکیا، لە دووەمین و پێنجەمین سەفەریدا بە ناوچەرگەی کوردستاندا تێپەڕیوە و باسی ژیان و شێوەی ژیانی کوردەکانی کردووە. تەنانەت- وەک دەگێڕێتەوە- چووە سەری لە شەرەفخانی پاشای بەتلیسیش داوە و لە دیوەخانی شەرەفخانی بەتلیسدا میوانداری کراوە.

تاڤێرنییێ لە سەرەتای مانگی چواری ١٦٣٢ دا گەیشتۆتە ئەستەمبوڵ، لەوێوە بەرەو ئەرزەڕۆم، تەورێز، ئەمجا لە کۆتایی بەهاری ساڵی١٦٣٢ دا دەگاتە ئەسفەهان، واتە لە سەردەمی چوارەمین ساڵی فەرمانڕەوایەتیی (سەفی عەلی شا) دا کە بە یەکێک لە

یەکەمین پاشایانی سەفەویی ئێران دەژمێردرێ. لەم سەفەرەی یەکەمیدا، خۆی نەک وەک بازرگان، بەڵکو وەک توریستێک پیشان دەدا و تەنیا دوو سێ مانگێک لە ئەسفەهان ماوەتەوە.[٣]

لەو سەردەمەی ئیمپراتۆریەتی سەفەویی ئێراندا، قزڵباشەکان «سەرسوورەکان» کە فیداکارانی شیعەگەری و شیعە مەزهەب بوون، ماوەیەکی زۆر بوو جڵەوی حوکمدارییان گرتبووە دەست.

شایەنی باسە، سەردەمی ئەم سەفەرەی Tavernier بەرەو کوردستان، هاوکاتە لەگەڵ سەردەمی شاعیری گەورەمان ئەحمەدی خانی (١٦٥٠- ١٧٠٦) و مێژوونووس، شەرەفخانی بەتلیسی (١٥٩٦) و گەشتنامەکەی ئەولیا چەلەبی (١٦٥٥) بە کوردستاندا.

گەشتنامەی ئەم نووسەرە فەرەنسییە، لەپاڵ سەفەرنامەکەی ئەولیا چەلەبی، بە یەکێک لە گرنگترین و دانسقەترین کتێب لە قەڵەم دەدرێن بۆ ساغکردنەوە و لێکۆڵینەوەی مێژووی ژیانی نەتەوەی کورد لە سەدەی حەڤدەیەمدا.

فەیلەسووفی گەورەی فەرەنسا «ڤۆلتێر» لە کتێبەکەی خۆیدا (Essai Sur Les Moeurs des Nations) دەڵێ: (تاڤێرنیی TAVRNIER لە گەشتنامەکەی خۆیدا باسی بازرگانێتیمان بۆ دەکا نەک باسی فەلسەفە جگە لە شارەزایی لەبارەی رێگاو شا رێگاکانی بازرگانی، هیچی دیکەی لێ فێر نابین)[٤] بەڵام لەگەڵ ئەوەش تاڤێرنیێ لە بواری رۆژهەڵاتناسیدا بە یەکێک لە گەورەترین گەشتەوەرە فەرەنسییەکان لە قەڵەم دەدرێ لە ماوەی سەدەی حەڤدەمەوە تاکو سەدەی نۆزدەمین، بە یەکێک لە یەکەمینی ئەو گەشتەوەرە فەرەنسییانە دەژمێردرێت کە شارەزایی و ئاگانامەی لە بارەی وڵاتی ئێران بە زمانی فەرەنسی بڵاو کردبێتەوە[٥] هەر بۆیەش فەیلەسووفی ناوداری فەرەنسی مۆنتسکیۆ MONTSQUIEU بۆ نووسینی کتێبە ناودارەکەی خۆی بە ناونیشانی (چەند نامەیەکی فارسی / Lettres Persanes) لە ساڵی ١٧٢١ دا سوودێکی زۆری لەم گەشتنامەیەی تاڤێرنیێ وەرگرتووە و وەک سەرچاوەیەکی بنچینەیی بەکاری هێناوە.[٦]

بایەخی ئەم کتێبەی تاڤێرنیێ بۆ کوردان تەنیا لەوەدا نییە کە چەند لاپەڕەیەکی درەخشان دەخاتە پاڵ لاپەڕە دەگمەنەکانی دیکەی نووسینەوەی مێژووی ژیانی نەتەوەی کورد لە سەرەتای سەدەی حەڤدەیەمدا، بەڵکە چەند تیشکێکی تازەش دەخاتە سەر هەندێ گۆشە و لایەنی تاریکی ژیانی نەتەوەکەمان لەو رۆژگارە دێرینەدا: ژیانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، بازرگانی، سیاسی، داب ونەریت ئارکیۆلۆژیا... تەنانەت لە رووی زمانەوانیشەوە، دەتوانین سوود و بەرەنجامی زۆر دانسقە لەم کتێبەوە هەڵبهێنجین، لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، ئەم کتێبە بینین و گۆشە نیگای بابایەکی روناکبیری ئەوروپایی دەردەخات بەرامبەر کۆمەڵی کوردەواری و مرۆڤی کورد. ئەم کتێبە بابەتێکی سەربەخۆو تابلێی گرنگە لە بواری لێکۆڵینەوەی کوردناسیی فەرەنسیدا.

ئێمە لێرەدا تەنیا ئەو بەشانەمان وەرگێڕاوەتە سەر کوردی کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ باسی کوردان دەکەن. بەداخەوە نەمانتوانی ئەو بەشانەی دیکەی کە باسی هەندێ شاری دیکەی کوردستان دەکەن وەربگێڕین، هەوڵمان داوە خۆمان لە تەرجەمەکردنی ئەو بابەتانە بە دوور رابگرین کە لە سەفەرنامەکەی (ئەولیا چەلەبی) دا باس کراون، زیاتر ئەو کۆپلە و پەرەگرافانەمان وەرگێڕاون کە زانیاری و ئاگانامەی تازە، لە سەفەرنامەکەی ئەولیا چەلەبی و لە شوێنی دیکەدا باس نەکراون[٧] وەرگێڕانەکەشمان دەقاودەق کردووە، بە بێ زیاد و کەم کردنەوەی هیچ وشەیەک.[٨]

گەشتنامەکەی TAVERNIER لە دوو بەرگ پێک هاتووە. بەرگی یەکەم دوو کتێبە، کتێبی یەکەم: دووازدە بەشە، کتێبی دووەم: دە بەشە.

بەرگی یەکەم، کتێبی یەکەم

بەشی یەکەم: ڕێگای فرانسا بەرەو ئاسیا، تا ئەستەمبوڵ، ل ٣٩-٤٤

بەشی دووەم: لە ئەستەمبۆڵەوە تائەسفەهان (ئەمە سەفەری یەکەمیەتی) ل ٤٤-٧٣

بەشی سێیەم: لە ئەسفەهانەوە بەرەو یەریڤان، ل ٧٣-٧٨

بەشی چوارەم: لە یەریڤانەوە تا تەورێز، ل ٨٧-١١٢

بەشی پێنجەم: لە تەورێزەوە بەرەو ئەسفەهان (ئەمجارە بە ڕێگای شاری زنجان و سوڵتانییەوە) ل. ١٢-١٣٥

بەشی حەوتەم: لە ڕێگای Smyrne بۆ ئەسفەهان (بە ڕێگای ئەنادۆڵەوە، ل ١٣٥-١٥٩

بەشی هەشتەم: باسی ژیانی کشتوکاڵ و پیشە دەستییەکانی ئەو ناوچانە ل ١٥٩-١٦٥

بەشی نۆیەم: کرمان- ئەسفەهان

بەشی دەیەم و یازدەیەم: کاروان و کاروانسەراکان، پۆلیس، حوشتر و ماڵات بەخێوکردن، سروشت (لە کرمان و ئەسفەهان) ل ١٧٣-١٩٠

بەشی دوازدەهەم: پارەی ئێرانی، ژیانی دارایی ل ١٩٠-١٩٥

بەرگی یەکەم، کتێبی دووەم:

بەشی یەکەم: سەفەری دووەمی نووسەر لە پاریسەوە تا ئەسفەهان ل ١٩٥-١٩٧

بەشی دووەم: وەسفی شاری حەلەب ل ٢٠٩-٢١٨

بەشی سێیەم: ڕێگا گرنگەکانی دیکە بۆ چوونە حەلەب ل ٢١٨-٢٣٨

بەشی چوارەم: لە حەلەبەوە تا ئەسفەهان بە ڕێگای مێزۆپۆتامیادا (ئەمە ئەو بەشەیە کە نووسەر لە سەفەری سێیەمدا نووسیویەتی) ل ٢٣٨-٢٧٦

بەشی شەشەم: لە پاریسەوە بەرەو ورمێ (لە سەفەری چوارەمیدا نووسیویەتی) ل ٢٧٦-٢٨٩

بەشی حەوتەم: هەمان سەفەر، بەڵام بە ڕێگای کەناری دیجلەوە تاکو شاری بابل Babylon ل ٢٨٩-٣٠٣

بەشی هەشتەم و نۆیەم: لە بەغداوە تا بەسرا، لە بەسراوە تاکو هورمز ل ٣٠٣-٣٣٢

بەشی دەیەم: سەفەری پێنجەمی نووسەر ل ٣٣٢-٣٣٧

پێش ئەوەی گوڵبژێرە تەرجەمەکراوەکانی ئەم کتێبە بخەینە بەرچاو، پێویستە پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین کە دەزگای بڵاوکردنەوەی چاپی سێیەمی ئەم گەشتنامەیە، دەزگای La Decouverte، ژمارەیەکی زۆر لە تێبینی و پەراوێزی بۆ ئەم کتێبە نووسیوە. ئێمەش پوختەی ئەم پەراوێزانەمان، لە کاتی پێویستدا لە دامێنی وەرگێڕانە کوردییەکەدا بە ناوی (ب/ دەزگای بڵاوکردنەوەی La Decouverte) وەکو خۆی نووسیوەتەوە. هەر سێ نەخشەکەی لێرەدا پیشان دراون، لە چاپی سێیەمی پاریس (La Decouverte ١٩٨١) وەرگیراون، وێنەی ژمارە (١) و(٢) و(٣)یش لە بەرگی یەکەمی چاپەکەی ئەمستردام (١٦٧٨) وەرگیراون. ئێستاش ئێوە و گوڵبژێرێک لە گەشتنامەکەی[٩] Jean-Bapteste TAVERNIER:

Les Six Voyages en Turquie et en Perse, l er edition Amstrdam chez johannes Van Someren, 1678.

## بەرگی یەکەم

لە لاپەڕە (٧٠-٧٣) دا باسی سەفەری ڕێگای بەرەو ئەرزەڕۆم و یەریڤان دەکات، پاشان ڕێگا و مەڵبەندەکانی سەرسنووری تورکیا- ئێران و دەوروبەری شاری قارس و ڕووباری ئاراس. لە لاپەرە (٢١٨) دا دەڵێ:

پێنج ڕێگای بنچینەیی هەن کە لە شاری حەلەبەوە بتگەیەننە ئەسفەهان، ئەو پێنج ڕێگایانەش لەگەڵ دوو ڕێگای دیکە یەکتر دەگرنەوە. واتە بەهەمووی حەوت ڕێگا هەن بۆ گەیشتنە وڵاتی فارس لە شاری ئەستەمبۆل و حەلەبەوە، « یەکێک لەم ڕێگایانە، لە شاری حەلەبەوە، دەکەوێتە لای چەپ، واتە ڕێگای بەرەو دیاربەکر و پاشان تەورێز. دووەمین ڕێگا بەلای ڕاستەوە، بەرەو مێزۆپۆتامیا، بە ڕێگای مووسڵ و ئامێدی» ل ٢١٨

لە لاپەڕە (٢٤٧) دا پێش ئەوەی جارێ بگاتە ناو شاری ماردین، وەسفی ئەو دەوروبەرە دەکات و پاشان دەڵێ:

لە ڕۆژی بیست و شەشەمی سەفەرەکەماندا، لە شاری Cousasar دا ڕامانگرت.(*) چونکە لەوێ دەبوایە گومرگی چوونە ناو دیاربەکر بدەین بازرگان دەبوایە دوو قرۆش و چارەگێک بۆ هەر بارگەیەک. ل ٢٤٩.

لە وەسفی شاری ماردیندا دەڵێ:

ماردین ئەوەندە لە Cousasar دوور نییە، شارێکی بچکۆلەیە و لەسەر شاخێک قوت بۆتەوە و شوورەیەکی جوانی بەدەوردا کراوە. نافوورەیەکی جوانیشی لێیە کە لە قەڵاکەیەوە دادەڕژێتە خوار. قەڵاکەی لەلای باکووردایە، لە سەر دوندێکی بەرز هەڵکەوتوە. ل ٢٤٩».

«ماردین پاشایەک بەڕێوەی دەبا. ئەو پاشایە دوو سەد سپاهی و چوار سەد سەربازی ئینکشاریی لە ژێر دەستدایە» ماردین ئەو شوێنەیە کە سینۆزا (خاتوو)مانی ژیۆرید Maani Gioerida یەکەمین ژنی پیەترۆ دێللا ڤاللا Pietro della VALLA بەوێدا ڕەت بووە(١٠) ئەم ژنە بە سەفەرە خۆشەکانی زۆر بەناوبانگە ل ٣٤٩». پاشان لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێ: «من تەنیا لە سەفەری چوارەمدا بەم شارەدا تێپەڕیم».

لە لاپەڕە (٢٥٢) تا ٢٥٤) باسی شاری نوسەیبین Nesbin دەکات: « دەبوایە بەڕێ کەوین و یازدە سەعات بەڕێوە بین بۆ ئەوەی بگەینە مووسڵ، کە هێندە لە نەینەوای کۆنەوە دوور نییە- ل ٢٥٤». «مووسڵ شارێکە کە لە دوورەوە، بەخۆی و شوورە بەردینە بەرزەکانییەوە زۆر جوانە، بەڵام لە ژوورەوە هەمووی هەر کەلاوەیە، لە چەند بازاڕێکی بچکۆڵانەی «گومانلێکراو» زیاتر، لەگەڵ قەڵایەکی بچکۆلانە کە لەسەر ڕووباری دیجلە هەڵکەوتووە و ماڵی پاشای لێیە هیچی دیکەی لێ نییە. - ل ٢٥٣». «هیچ شتێکی ئەوتۆی دیتەنی لەناو شاری مووسڵدا نییە، شوێنەکە هیچ شتێکی وای لێ نییە سەرنجت ڕابکێشێ، جگە لە دیمانەی شکۆمەندی بازرگانەکان. بەتایبەتی بازرگانە کورد و عەرەبەکان. کوردەکان ئەو کەسانەن کە خەڵکی ئاسیریای کۆنن Assyrie و ئەمڕۆ بەکوردستان Cur-distan ناو دەبرێت(١١)، ئەو شوێنەی کە ئەمڕۆ بەرووبوومێکی کشتوکاڵیی گەورەی تێدا دەهێندرێتە بەرهەم، هەروەها بازرگانێتی گوێز و مازووی لێدەکرێ. ٢٥٤».

نووسەر کاتێ لە مووسڵەوە بەرەو هەولێر بەڕێ دەکەوێ، دەڵێ:

«ڕۆیشتین، گەیشتینە ڕووبارێکی دیکە بەناوی زابی گەورە، بەسەر پردی ڕووبارەکەدا پەڕینەوە، ئەو پردەی کە بە بیست و نۆ قەنتەرەی بەردین Arcade دروست کرابوو. دەیانگوت کە ئەسکەندەری گەورە ئەم پردەی دروست کردووە. بۆ ئەوەی خۆی و لەشکرەکەی بتوانن بەسەریدا بپەڕنەوە و هێرش ببەنە سەر داریووش، چارەگە فرسەخێک دوور لەو پردە، بەرەو ڕۆژ ئاوا، دوو زێبار هەبوون کە یەکتریان دەگرتەوە و دەڕژانە ڕووباری دیجلەوە. پردەکەمان

بەجێ هێشت. ڕۆیشتین بەرەو شارۆچکەیەک بە ناوی Chirdzoul کە کەتبووە سەر گردۆلکەیەک و لە سێ لاوە قوت ببۆوە(A) پاشایەک لەو شارۆچکەیە هەبوو، کە ناچاربووین بچین خۆمانی پێ پیشان بدەین بۆ ئەوەی ڕێگامان بدا کاروانەکەمان تێپەڕ ببێ، ئیتر بنەوبارگەمان لەوێ، لە کەنار زێیەک خست و دوو ڕۆژان ماینەوە. ل ٢٦٠-٢٦١»

« کە لەوێوە بەڕێ کەوتین، ڕۆژێکی تەواو بە ناو شاخ و داخێکی وشک و برنگدا بەڕێوە بووین، بێ ئەوەی هیچ پرووشکە ئاوێک ببینین، بێ سبەینێ گەیشتینە دەشتێکی خۆش و هەراو، پڕ لە دار و درەختی میوە بوو. ئەو دەشتە دەشتی ئاربیل Arbeles بوو. ئەو شوێنەی کە ئەسکەندەری گەورە داریووشی تێدا شکاند».



«ئەو دەشتە، پانایییەکەی نزیکەی پانزدە فرسەخ بوو، چەندین جۆگەلە و زێباری دەچووە سەر. لە ناوەڕاستی ئەو دەشتەدا چیایەکی بچکۆلانە، کە نیوە تیرەکەی -Cir cuit نزیکەی نیو فرسەخ بوو، قووت ببۆوە، ئەو شاخە سەرتاپا بە داربەڕووی یەکجار قەشەنگ داپۆشرابوو، کە من پێشتر هەرگیز داربەڕووی هێندە قەشەنگم نەدیبوو، لەژێر کەلاوەکانیشەوە قەڵایەکی بەرز قووت ببۆوە ئەم قەڵایە « خەسڵەت و نیشانەکانی، ئەوەیان پیشان دەدا کە وەختی خۆی عیمارەتێکی Editice گەلێک قەشەنگ بووە. -ل٢٦١»

«خەڵکی ئەم وڵاتە دەڵێن کە ئێرە ئەو شوێنەیە کە وەختی خۆی داریووشی لێ ژیاوە، ئەو کاتەی لە شەڕەکەی خۆیدا دژی ئەسکەندەری گەورە شکا» « سێ فرسەخێک لەولاتر، لە نزیک چیایەکی گەورەدا، بەلای باکوورەوە پاشماوەی کەلاوەی قەڵایەکی دیکە دەبینرا، هەروەها چەند خانوویەک. خەڵک دەڵێن کە داریووش، وەختێ لە شەڕەکەی خۆیدا بەزی، هەندێ لە ژنەکانی خۆی لەوێ دانابوو، ئەو قەڵایە دیمەنێکی بەڕاستی قەشەنگ و سەرنجڕاکێشی هەبوو. - ل ٢٦١»

«سەرچاوە ئاوێک لە دامێنی ئەم شاخەدا هەبوو،

دەڕۆیشت. فرسەخێک دوورتر دەبووە زێبارێکی ئەوتۆ کە دەیتوانی چەندین بەلەمی قورس لەسەر پشتی خۆی رابگرێت، ئەو زێبارە بەرەو باشوور، بەناو ئەو شاخانەی کە لە باشووردا بوون پێچاو پێچ شۆڕ دەبۆوە، پاشان دوای رۆژە رێیەک بەناو شارێکدا تێدەپەڕی کە ناوی شارەزوور Cherezoul بوو (B) «ئەو شارە پردێکی لە بەرد دروستکراوی لێ بوو کە نۆزدە قەنتەرە Arcade ی هەبوو. شا عەبباس دوای ئەوەی هاتبوو بەغدای گرتبوو، سێ لەو قەنتەرانەی شکاند بوو. ل ٢٦١»

«شاری شارەزوور بە شێوەیەکی جیا لە شێوەی شارەکانی دیکە دروست کراوە: بنکەی ئەو شارە کە نزیکەی چارەگە فرسەخێک دەبێ هەمووی بەبەردی سەخت escarpe دروست کراوە، خەڵک بە پێبلکەی پانزدە و بیست پەیژەیی بۆ سەر خانووەکانی خۆیان هەڵدەگەڕێن، هەندێ جار بە پەیژەی زیاتریش و هەندێ جار کەمتر، ئیدی بە پێی قەبارەی بەردەکان. ئەم خانووانە هیچ دەرگایەکیان نەبوو، جگە لە جۆرە دەرگایەکی قفڵداری وەک دەرگای قفڵداری ئاشێک، کە خەڵک بۆ بەرۆژ کردنەوەی و بە شەو داخستنەوەی، هەمیشە پشتێنەی کۆڵەگەی دەرگاکەیان پاڵ پێوە دە، ئەو پشتێنەیەی کە لە دیوی ژوورەوەدا لە رێکی بەردەکەدا داندرابوو.

«لە سەری سەرەوەی ئەو خانووانەدا، کە وەک هێلانەی سەر چیا وابوون، خەڵک ژێرزەمینیان خۆش کردبوو. مەڕومالاتی خۆیان تێدا راگرتبوو، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە ئەم شوێنە وەک شوێنێکی خۆ پاراستن وابوو بۆ بەرگریکردنی هێرشی عارەبان و هێرشی بەدەوییەکانی Bedouins مێزوپۆتامیا. ل ٢٦٢». (١٢)

کەمێکی دیکەش هەر وەسفی شاری شارەزوور دەکات و پاشان دەگاتە سەر رووباری ئاڵتوون سوو، ل ٢٦٢-٢٦٣. لەلاپەرە ٢٦٦ دا باسی داب و نەریتی نامە ناردن و داروغە Daroga کوردەواری دەکا. لە لاپەڕە ٢٩٠ دا دەگاتەوە کەنار رووباری دیجلە، لەوێ وەسفی قەلایەکی ئەو ناوچەیە دەکات و پاشان بە شاری Kiletدا تێپەڕ دەبێ.

«گەیشتینەوە رووباری زاب (C) کە دەڕژێتە رووباری دیجلە، لەسەر ئەم رووبارە قەلایەکی لە خشت دروستکراو لەسەرگردێک قوت بۆتەوە، بەلام لەبەرئەوەی کە ئێستا کەسی تێدا ناژی، خەریکە دەبێتە کەلاوە(D) «ئێمە لەوێدا دارمان بڕی و ئاگرێکی گەورەمان تێیدا کردەوە، لەبەر ئەوەی ئەو ناوچەیە شێری لێ هەبوو - ل ٢٩١».

لە وەسفی رووباری (ئاڵتون سوور) دا(E) دەڵێ: ئەم رووبارە لە چیای مێدەکانەوە هەڵدەقوڵێ. من بە درێژایی سێ رۆژ کە لە تەورێزەوە دەچوومە حەلەب، بە تەنیشت ئەم رووبارەدا دەڕۆیشتم، لە شارۆچکەی Mesia شدا لە رووباری دیجلەم دا»(F) « ئاوی ئەم رووبارە یەکجار سازگارە. لە لای ئاسیریاوە Assyrie دەڕژێتە رووباری دیجلەوە. ئێمە لەوێ بە درێژایی ئەو رۆژە هەر چاومان بە خەڵکی عارەب و کورد دەکەوت، کە وێڕا وێڕای رووبارەکە هەر دەهاتن و دەچوون، دەهاتن ودەچوون، عارەبەکان لە دیوی مێزۆپۆتامیادا، کوردەکانیش لە دیوی ئاسیریادا.

ئەم دوو میللەتە جەنگیان لە نێواندا هەبوو، هەر یەکێکیان لە دیوی خۆیاندا بەتەدارەکی سەربازییەوە en ordre هاتوچۆیان دەکرد. گەنجەکان بە خۆیان و تیروکەوانەکانیانەوە، هەندێکیشیان دەست بە تفەنگەوە لە پێشەوە راوەستابوون، ژمارەیەکیش لەو گەنجانە نیوە رمبێکیان بە دەستەوە گرتبوو، دەماندیتن، ژن و کچەکانیان لەگەڵ زارۆکەکانیان، بەگەڵ مێگەلە مەڕ و بەرخۆڵەکانیان یان بە گەڵ حوشترەکانیان کەوتبوون، پیرەکانیش بە دوایاندا دەڕۆیشتن.

هەم عارەب و هەم کوردەکانیش، هەر دوو لا، جار بە جار، سێ چوار سوارچاکیان دەنارده سەر دوندی تەپۆلکە بەرزەکان بۆ ئەوەی هەواڵی تازە بێننەوە، چونکە هەر وەختێکی بواری هێرش بردنە سەر یەکتیریان بۆ برەخسایە، بە پەلە بە خۆیان و ولاغەکانیانەوە رووبارەکەیان بەمەلە دەبڕی، ئەمە شتێک بووکە من هەر لەسەرەتاوە پێشبینیم

کردبوو. ئێمە کە نەماندەویست خۆمان تێکەڵ بەو جۆرە خەڵکە بکەین، نۆزدە سەعات ڕێگەمان بڕی بۆ ئەوەی بتوانین خۆمان لێیان بە دوور رابگرین، ل ٢٩٢». « لە بیستەمین رۆژدا گەیشتینە شارێک بەناوی تکرێت Tigrit هەر لەوێ لە نزیک ئەو شارەدا بنەو بارگەمان خست. عارەبەکان دەیانگوت جاران ئەم شوێنە بەهێزترین شوێنی میزۆپۆتامیا بووە. ل. ٢٩٢» (G).

## بەرگی دووەم

بەرگی دووەمی ئەم سەفەرنامەیە لە سێ کتێب پێک هاتووە، کتێبی یەکەم (کە دەکاتە کتێبی سێیەم) بریتییە لە ناوەڕۆکی سەفەری شەشەمی نووسەر بەرەو رۆژهەڵات کە لە دە بەش پێک هاتووە لە بەشی سێیەمدا لاپەڕە ٣٤-٣٨ « لە حەلەبەوە تا تەوریز- بە ڕێگای دیاربەکرو واندا» باسی کوردستان دەکا. بە هەمان شێوە لە بەشی چوارەم و پێنجەمیشدا، لاپەڕە ٣٨-٤٨ « لە حەلەبەوە تا تەوریز بەڕێگای جەزیرەدا «لە حەلەبەوە بەرەو ئەسفەهان بە ڕێگای شاری کنگاوەردا».

کتێبی دووەم (چوارەم) ل ٨٣- ٢٢٠ بەشێوەیەکی گشتی باسی وڵاتی ئێران دەکا: جوگرافیا، مێژوو شارو باژێڕەکان، ژیانی ئابووری، کشتوکاڵ، سیاسەت، داب و نەریت دیانەت و مەزهەبەکان، زەردەشتگەری، ئەرمەنەکان... هتد. کتێبی سێیەمیش (پێنجەم) وەسفێکی گشتیی ژیانی سیاسی و مێژوویی وڵاتی ئێرانە، لەگەڵ وەسفی ڕێگای ئەسفەهان بەرەو ورمێ، لاپەڕە ٢٤٥-٢٣٦ Tavetnier لە بەرگی دووەمدا، لە کتێبی (سێیەم) دا لە لاپەرە ٣٤ دا دەڵێ: «من هەموو ئەو ڕێگا جۆراوجۆرەم وەسپ کردن کە لە شەش سەفەرەکەمدا بەرەو ئێران Perse پێیاندا تێپەر ببووم، بەڵام هێشتا دوو ڕێگای دیکە ماون کە مرۆڤ دەکارێت بۆ هەمان مەبەست بیانگرێتە بەر: یەکێکیان بە باکووری تورکیادا، ئەوی دیکەشیان بە باشووریدا یەکەمیان بە دیاربەکرو واندا کە دەچێتەوە سەر تەوریز، دووەمیشیان بە ئاننا Anna و بیابانی بچکۆڵەدا کە دەچێتەوە سەر بەغدا»

« هەر چەند من ئەم دوو ڕێگەیەم تەنیا لەکاتی گەڕانەوەمدا گرتە بەر، بەڵام بڕیارم دا کە ئەمانیش بخەمە سەر ئەوانی پێشوو، وەک ئەوەی کە ئەمانیشم هەر لەکاتی چوونم بۆ وڵاتی ئێران گرتبێتە بەر-ل ٤٣».

«لە شارۆچکەی بیر Bir یان Feri یەوە پیاو دەتوانێ وێڕا وێڕای ڕووباری فورات بەڕێ کەوێ تا دەگاتە جەشەمێ Cecheme لە جەشەمێ- وە دەگەیتە میلەسەرا Mileseta (H) کە لەوێ پێویستە بۆ گومرگی چوونە ناو شاری ئورفە Ourfa چوار قرووش بدەیت بۆ باری هەر بارگیرێک.

لە میللی سەراوە دەگەیتە ئارزلان چای Arzlan- Chay (I) واتە (ڕووباری شێر) خەڵکەکە ڕووبارەکەیان وا ناوزەد کردووە. لەبەر تیژڕۆیی ڕووبارەکە، کە دەڕژێتە فوراتەوە. لە ئارزلان چایەوە دەگەیتە سیڤەرەک Severak ئەمەش شارێکە، زێبارێکی بچکۆلە ئاوی دەدات و پاشانیش دەرژێتە فوراتەوە، ئەم شارە لە لای باکووریدا، بە دەشتێکی هەراو دەورە دراوە- ل ٢٥».

نووسەر بە درێژی وەسفی ئەم شارە دەکات، پاشان یەکە یەکە بە شارەکانی (بۆگازی) و (دەگرمان بۆگازی) و (میرزا تەپە) تێپەڕ دەبێت و وەسفیان دەکا. لە میرزا تەپەوە دەگەیتە دیاربەکر کە تورکەکان پێی دەڵێن Car-emu ل ٢٦».

دیاربەکر شارێکی گەورەیە. بەلای دەستەراستی دیجلەوە لە سەر بەرزاییەک هەڵکەوتووە و شێوەی نیوە مانگێکی لەو مەڵبەندەدا دروست کردووە. بە خۆی و شوورەکانی خۆیەوە کە درێژ دەبنەوە تا دەگەنە ڕووباری دیجلە. دیاربەکر بە جووتێک شوورە دەورە دراوە، لەسەر شوورەی دیوی دەرەوەدا حەفتاودوو بورج (منارە) دەبیندرێت، وەک

بڵـێی کـە ئەم حـەفـتـاو دوو بورجـە بۆ یادکـردنەوەی (شەرەفی) حەفتاو دوو یاوەرەکانی مەسیح دروست کرا بن. شارەکە تەنیا سێ دەرگای هەیە، لەسەر یەکێک لەو دەرگایانەی کە دەڕوانێتە ڕۆژئاوا نووسراوێکی یۆنانی و لاتینی بەرچاو دەکەوێ کە هیمای شەریعەتێک نیشان دەدا. ئەم شـارە دوو سێ مـەیدانی دڵگیـری لێـیـە. هەروەها مـزگـەوتێکی قـەشـەنگیش، کـە وەخـتی خۆی کەنیسە بووە. ل٢٦) [J].

شارەکە بە چەند گۆڕسـتـانێکی یەکـجـار بەدەو دەورە دراوە، کـــە پڕن لە مـــەلاو دەروێش و بـازرگـــان و کـتـێـبـفـرۆش، یان ئەو جۆرە خـەڵکەی کـە خۆیان بە خزمەتکردنی شەریعەت تەرخان کردوە.

فرسـەخێک دوور لە شـارەکـە، بەرەو باکوور، خـەڵک جـۆگـەلەکـیـان لە ڕووباری دیجلەوە ڕاکـێـشـاوەتە ناو شارەکە. خەڵک بەم جۆگە ئاوە بچکۆلانەیە ئەو پێستە خـۆشـەکـراوە سـوورانە دەشـۆن کـە دیاربەکـر پێی بەناوبانگە. ئەم ئاوە جۆرە ئاوێکی تایبەتییە و پێست ئێجگار باش خۆش و جوان دەکا. ئیـدی ئەم پێـسـتـە خـــۆشـــەکـــراوانە، هەم لەبەر ڕەنگیـــان، هەم لەبەر چەشنەکـەیان، بە باشـتـرین پێـسـتـەی خـۆشـەکـراوی ڕۆژهەڵات دەژمێردرێن ل ٢٦».

«پێستەی خۆشەکراو لەوێ چەشنێکی زۆر دانسقەی هەیە، ئەم کـارەی پێـســتـە خـۆشـەکـردن چواریەکی دانیشتوانی شارەکە پێوە خەریکن ل ٢٦»

«نانی دیاربەکــر و شـــەرابی دیاربەکــر بێهاوتا و خـۆشن، پیـاو هەرگـیــز ئەوەی دەست ناکـەوێ کـە لەدەرەوەی دیاربەکر گۆشتی لەهی ئەوێ خۆشـتـر بخوا. خـەڵک لەوێ زیاتر گـۆشـتی کـۆتر دەخـۆن. شـارەکـە شارێکی ئاپوورەیە و ژمارەی دانیشتوانی گەلێک زۆرە. خەڵک دەڵێن کە تەنیا مەسیحییەکان ژمارەیان دەگاتە زیاتر لە بیـست هەزار کـەس. دوو لە سـەر سـێی ئەو مـەسـیـحـیـیـانە ئەرمـەنن، ئەوانی دیکەش نەسـتـۆری و کەمێکیشیان یاقووبین Jacobites ل ٢٦-٢٧»



وێنەی ناو دەسنووسی خورشید و خاوەر سەدەی هەژدەم

«پاشای (میری) دیاربەکر[K] یەکێکە لە وەزیرەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. ئەم پاشایە لەشکری پیادەی کەم هەیە، چونکە لەم وڵاتەدا لەشکری پیادە هێندە پێویست نییە. کوردەکان لەبەرئەوەی بەردەوام لەگەڵ عارەبەکاندا لە شەڕوشۆڕ دان، هەمیشە ئەسپسوارن. بۆیە ئیتر ئەم پاشایە، زیاتر ئەسپسواری هەیە، نەک پیادە. دەتوانێ بیست هەزار ئەسپسوار بخاتە مەیدانەوە. ل ٢٧».

«چوار فرسەخ[L] لەولای دیاربەکرەوە، گوندێکی گەورە هەیە کە کاروانسەرایەکی مەزنی لێیە، ئەو کاروانچییانەی هاتوچۆی وڵاتی ئێران دەکەن، لەرێگای چوون و گەڕانەوەی خۆیاندا، کاروانەکەیان لەو گوندەدا رادەگرن و دەمێننەوە، نەک لەدیاربەکر، ئەمەش لەبەر ئەوەی کاروانچی لە کاروانسەرای شارەکاندا پێویستە مانگانە سێ چوار قروش بۆ کرێی هەر ژوورێک بدا، لە کاتێکدا لە گوندان پیاو کرێی هیچ نادا- ل ٢٧».

نووسەر لە لاپەڕە ٢٧-٢٨ دا باسی هەندێ لایەنی دیکەی شاری دیاربەکر و هەندێ کاروانسەرای ئەو ناوچەیە دەکات. هەروەها باسی شارۆچکەکانی باتمان و Chaye Batm و شکاران و ئازۆ Azo و زیارەت و زەرقە zer-ki\Zerque کۆشاکان و چارەکان و ... هتد دەکات[M].

لە شاری چارەکانەوە دەگەیتە شاری بەتلیس، واتە شاری ئەو میرەی، یان ناوەندی ئەو وڵاتەی کە لە هەموو وڵاتێکی دیکە بە هێزترو سەرنجڕاکێشترە، لە بەر ئەوی نە سەر بۆ سوڵتانی عوسمانی دادەنوێنێ و نە پاشای فارسەکانیش بە هیچ دەزانێ، ئەمە لەکاتێکدا هەموو میرەکانی دیکە سەر بە یەکێک لەم دووانەن - ل٢٨»[N].

ئەم دوو دەسەڵاتدارییەی عوسمانی و فارس بەرژەوەندییان لەوەدایە کە خاتری ئەم میرنشینە بگرن، چونکە ئەم میرنشینە ئەگەر بیەوێ زۆر بە ئاسانی دەتوانێ ئەو رێرەوە دابخات کە رێگای حەلەب بە تەورێزەوە یان رێگای تەورێز بە حەلەبەوە دەبەستێتەوە- ل ٢٨».

نووسەر لە لاپەڕە ٢٨-٢٩دا وەسپی رێگای بەتلیس و حەلەب دەکا، پاشان وەسپی ناوبازێڕ و قەڵاکانی شاری بەتلیس. لە وەسپی قەڵایەکی گەورەی شاری بەتلیسدا دەڵێ: «رێگای سەرکەوتنە سەر ئەم قەڵایە یەکجار سەختە، دەبێ وڵاخی گەلەک چاپووکت پێ بێ بۆ ئەوەی بتوانی پێیدا هەڵگەڕێی. تەنیا میر و ئەسپەوانەکەی دەتوانن بەسەر ئەو قەڵایەدا هەڵگەڕێن. ئەو کەسانەی کە ئەسپەوانیان لەگەڵدا نییە، لەم توانایە بێبەشن- ل٢٩».

هەروەها لە بارەی میری بەتلیسەوە دەڵێ: «پاشای بەتلیس بیست یان بیست و پێنج هەزار سوارچاکی لەژێر دەستایە، هەروەها ژمارەیەک لە هێزی پیادەی زۆر چاپووک، کە بەشی زۆریان لە شوانەکانی پاشا پێک هاتوون، هەر کە داوایان لێ دەکرێ ئیدی لەسەر پێن و ئامادەن.ل٢٩».

«من ئەو وەختەی لە یەکێک لە سەفەرەکانی خۆمدا دەگەڕامەوە، بە شاری بەتلیسدا تێپەڕیم. هەر کە کاروانەکەمان گەیشتە ئەوێ، هەواڵ درایە پاشا کە بابایەکی فەرەنسی هاتۆتە ئەو ناوە، ئەویش دیار بوو یەکسەر فەرمانی دابوو پێمی رابگەیەنن کە حەز دەکا بمبینێ. پیاو کە دەچێ میرێک یان دەسەڵاتدارێک لە شارێکی تورکیا یان لە ئێران دەبینێ، ئیدی رێ و رەسمەکان هەمان شتن. چووم سڵاوێکم لە پاشای بەتلیس کرد و دوو پارچە ساتان (ئەتلەس)م پێشکەشی کرد، یەکێکیان زێڕ بوو، ئەوی تریان زیو. هەروەها دوو کڵاوجامانەی Toque سپیشم دایێ، لەوانە تورکەکان لەسەری دەنێن. نێوچەوانەکەی بە ناسکترین تاڵەزیو چنرابوو. هەروەها دوو پارچە دەسماڵی سپی و چەند پارچە قوماشێکی خوریی بە زیو چنراویشم پێشکەشی کرد. پاشا بەو سەردانەی من کەیفی زۆر خۆش داهات، لە دیمانەی مندا ناردبووی دوو مەڕم بۆ سەر ببڕن. نانێکی خۆش و شەرابێکی خۆش و دوو سەبەتە ترێی زۆر تەڕ و پاراو، کە لەو وەرزەدا شتێکی زۆر دەگمەن بوو- ل٣٠».

نووسەر دوای ئەوە، باس لە فەرمانبەرەکانی پاشای بەتلیس دەکا و پاشان دەڵێ:

«ئەوەم لە بیر کرد بێژم، کاتێ لای پاشا دانیشتبووم، دوای ئەوەی داوای قاوەی لە دەست و پەیوەندەکانی کرد، یەکسەر نامەیەک لەلایەن پاشای حەڵەبەوە گەیشت. پاشای حەڵەب تکای لێ کردبوو ئەو نژدارە (تیمارکارە) فەرەنسییەی کە بە ئەسیر لە لای پاشا گیرابوو، بۆی بنێرێ. ئەو نژدارە فەرەنسییە لە جەنگی candie دا بە ئەسیری گیرابوو، ئیتر پاشا لە هەمبەر ئەمە رق و کینەی خۆی دەردەبڕی. پاشای بەتلیس کە باش لە پیرۆزیی مەسەلەی پەناهەندەیی تێدەگەیشت و دەیویست بە ڕاستی ئەو پەنابەرە فەڕەنسییە باش داڵدە بدا، نامەکەی پاشای حەڵەبی بە ڕق و کینەیەکی زۆر سەیرەوە ونجڕ ونجڕ کرد، تەنانەت هەڕەشەی ئەوەیشی دەربڕی کە ئەگەر پاشای حەڵەب لەو داواکارییەی خۆی پاشگەز نەبێتەوە، ئەوا یەکسەر کارێکی وا دەکات کە بە کوشتنی بدات» ل٣٠.

«سوڵتانی عوسمانی بەرژەوەندیی لە پاشای فارس زیاتر لەگەڵ میری بەتلیسدا هەیە، هەر بۆیەش ئەو زیاتری خاتر دەگرێ، چونکە میری بەتلیس ئەگەر حەز بکات و بیەوێ رێگا بداتە پاشای فارس کە بێت شاری (وان) ئابڵووقە بدات، ئەوا سەبارەت بەوەی کە لەو کاتەدا وڵاتی عوسمانی هەر لە تەورێزەوە تاکو شاری (وان) دەرگای بەسەر دا ئاواڵا دەکرێت: سوڵتانی عوسمانی زۆر بە زەحمەت دەتوانێ بە فریای خۆی بکەوێت، خۆ ئەگەر بە فریای خۆیشی بکەوێت، ئەم کارە تەنیا لە رێگەی ئەو گوزەرگا و ڕێڕەوانەوە دەکرێت کە لەژێر رکێفی ئەم میرەدان، ئێ میریش هێزێکی سوپایی زۆر و باشی هەیە بۆ ئەوەی بتوانێ ئەم ڕێڕەوانەی لێ بەند بکات. ئەمە لە حاڵەتێکدا ئەگەر سوڵتان هەڵسوکەوتی بە خراپە لەگەڵ بکات». «بەکورتییەکەی، شتێکی زۆر خۆشە کە بە سەفەر بەناو وڵاتی کورداندا بگەڕێی. ل٣٠-٣١».

پاشان نووسەر بە درێژی وەسفی جوانی و سروشت و ئاوو هەوای کوردستان دەکا، دەڵێ: «باشترین جۆری گەنم، باشترین چەشنی جۆ لە هەموو وڵاتی عوسمانیدا، لە کوردستان دەست دەکەوێ». «لە شاری بەتلیسەوە، کە کاروانچی لەوێ تەنیا پێنج قرووش ئەسپانە دەداتە گومرگ، دەگەیتە شاری تادڤان Tadvan لەو شارەی کە باجت دوو قات لێ وەردەگرن.[(O)] ل٣١».

پاشان نووسەر لە ل٣١-٣٢-٣٣دا، وەسفی ئەم شارانە دەکات: قارمووشە Karmouche، قەڵات Kellat[(P)] ئەرچەک... هتد.

«لە شاری وانەوە دەگەیتە Derchek[(Q)] لەوێشەوە دەگەیتە (نۆشار) کە گوندێکی زۆر لاتەرقەوچە، تەنیا چوار پێنج ماڵی لێیە، سەر بە مەرزوبوومێکە کە لەژێر رکێفی میرێکی کورد دایە، واتە لە چوارچێوەی هەمان ئەو وڵاتەی کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن کوردستان Curdistan کە وەختی خۆی بەشێک بووە لە ئاسیریای کۆن Assyrie- ل٣٤».

«ئەم میرانە (لەبەر ئەوەی لەم وڵاتەدا زۆر میر هەن و وڵاتەکە وڵاتێکی شاخاوییە) هەموویان وەک جۆرە پاشا و سوڵتانێکی تایبەتی وان، لە سەر سنوورەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و پاشای ئێراندا هەڵکەوتوون[(R)]، باکیان نە بە سوڵتان هەیە و نە بە پاشای ئێران. ئەم میرنشینانە، لە شێوەی حوکمدارێتیی بچووک دەستیان بەسەر شاخ و ڕێڕەوە سەختەکاندا گرتووە، هیچ لەوەش ناترسێن کە خەڵکی بێگانە بێن هێرشیان بکەنە سەر.

ئەم کوردانە Curdes بە شێوەیەکی گشتی، خەڵکێکی دەست و دڵ سەختن، هەر چەند دەڵێن گوایە محەممەدین، بەڵام مەلا و پیاوی شەریعەت لە ناو ئەواندا زۆر کەم هەن بۆ ئەوەی بیانهێننە رایێ -ل٣٤». «ئەو کوردانە، سەگی ڕەشیان زۆر لە لا پیرۆزە..» «خەڵک ناتوانێ لەبەردەم ئەواندا بەرخ بە چەقۆ سەر ببڕێت، بەڵکە دەبێ سەری بەرخەکە لە نێوان دوو بەرد دابندرێت و بپلیشێندرێتەوە. ئەم خورافاتەیان هەر یەکجار عەنتیکەیە»[(S)].

ئەو ئاغایەی Beg گوندی نۆشاری لە ژێر دەستـایە، شازدە عـەبباسیی بۆ باجی ولاغـان دانـاوە، بەڵام بێ ئەوەی بچیتە لای و خۆتی پێشکەش بکەی، وەک ئەوەی لە شوێنی دیکەدا باوە. ئەمەش حەوت- هەشت تومەن، گەلێک جاران زیاتریشی تێ دەچێ، ئیدی بە پێی سووکی و گرانیی ئەو بارەی پێتە. کاروانباشی ناچارە خۆی دیارییەکەت لێ وەربگرێت و بچێ بەو شاخەوە پێشکەش بە ئاغای بکات- ل٣٥».

نووسەر پاشان باسی هەندێ داب و نەریتی دیکەی بازرگانی و باج وەرگرتنی ئەم مەڵبەندە دەکات، ئەمجا باسی گەیشـتنی خۆی بۆ شـارۆچکەکانی (کـووچکی/ کـوچیکلار)و کـالڤـات، کۆگیـاCogia، دارکەڤن Darkevin، سولەیمان سەرا، کوورس Chors Cours/، دەڤۆگلی، مەرەند، یەکە یەکە وەسفیشیان دەکا: چۆنیەتیی ژیان لەم شارۆچکانەدا ل٣٦-,٣٨

## لە دیاربەکرەوە بۆ جەزیرە بە چوار رۆژ

«جەزیرە (١٣) شارێکی بچکۆلانەیە، کەوتۆتە میـزۆپۆتامیـاوە». «جەزیرە، ئەو بازرگانانەی لێ کۆدەبێتەوە کە دەچنە کوردستان بۆ کڕینی گوێز و کونجی و تووتن، یان ئەوانەی لەکوردستانەوە دێن دەیانەوێ بچنە حەلەب- ل٣٨».

«گوێزی کـوردسـتـان، رەنگەکـەی یەکـجـار نایاب و دانسـقـەیە، گـوێزی ولاتانی دیکـە، هەرگـیـز وەک گـوێزی ولاتی کوردان هێند پڕ کاکڵ و سەنگین نییە. کـیلۆ گوێزێکی ولاتی کـوردان بە ئەندازەی سێ کـیلۆ گوێزی ولاتـانی دیکـە سەنگینتر و خۆشترە- ل٣٩».

## لە جزیرەوە بۆ ئامێدی بە دوو رۆژ

«ئامێدی(T) شارێکی خۆشە. ژمارەیەکی زۆر لە جوتیـارەکـانی مەڵبەندی Assyrie باری تووتن و گوێز و کونجیی خۆیـان دەهێننە ئەوێ. ئەم شـارە لەسـەر شـاخـێکی بەرز هەڵکەوتـووە، کە پیـاو بە سـەعـاتێک ئەوجـا ئەگەر بتـوانێ بەسەریدا هەڵگەڕێ. شارەکە گەورەیییەکی مامناوەندیی هەیە. مەیدانێکی قەشەنگ لە ناوەڕاستی شارەکەدا هەیە، کە هەمـوو تەرزە بازرگـانێکی تێدا کۆ دەبێتـەوە. شـارەکە میـرێک بەڕێوەی دەبا کە هەشت تـا دە هەزار ئەسپـسـواری لەژێر دەسـتـدایە، لەو ژمارەیە زۆر زیاتر هێزی پیادەشی هەیە. ئەمە لە لای هیچ یەکـێک لە میـرەکـانی دیکە بەدی ناکرێ. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو شارانەی لەژێر دەسەڵاتی ئەم میرە دان ژمارەی دانیشـتوانیان یەکجار زیاترە لەچاو شوێنە کورد نشینەکانی دیکە. ل٤٠».

## لە ئامێدییەوە بۆ چیۆسمێرگ Giousmark بە چوار رۆژ(U)

نووسەر پاشان باسی شاری چۆڵەمێرگ و ئەلباک Albak و سەلماس و تەورێز دەکا -ل٤١-٤٢. لە لاپەڕە ٨٥دا باسی ولاتی ئێران دەکا، دەڵێ: «ئوستانەکانی ولاتی ئێران ئەمانەن:

١- ئەرمینیای گەورە... کە شارە گەورەکانی ئەمانەن: یەریڤان، قارس، نەکسیڤان، زولفە، وان.

٢- دیاربەکر، کە جاران ناوی (میـزۆپۆتامیـا) بوو لە نێوان دیجلە و فوراتدا. شارە گـەورەکـانی ئەمـانەن: بیـر Bir لەسەر رووباری فوراتدا، دیاربەکر Car- emit(W) لەسەر رووباری دیجلەدا، ئورفە، مووسڵ، جەزیرە، ماردین... هتد.

٣- کـوردسـتـان. کـە جـاران ناوی Assyrie بوو، وێراوێرای رۆژهەڵاتی دیجلە دەگـرێتـەوە، هەر لە گـۆمـی وانەوە تا دەگـاتە کەوشـەنەکـانی بەغـدا. شارە گرنگەکانی ئەمـانەن: نەینەوا Niniva شارەزوور Cherisoul ئامێدی، سنێرن

Sneirne بەتلیس، سەلماس Salmastre.

٤- عیراقی عەرەبی Hierak- Arabi کە جاران ناوی Babylon یان Chaldee بوو. شارە گرنگەکانی: فەللووجە، بەغدا، مەشەدی عالی، گوورنۆ، بەسرە... هتد.

٥- عیراقی عەجەم یان ولاتی پارث Parthی کۆن، شارە گرنگەکانی ئەمانەن: ئەسفەهان، تورکستان، هەمەدان، کاشان، قوم، قەزوین، لەوانەیە یەزدیش.

نووسەر پاشان باسی ئوستانی شەشەم و حەوتەمی ولاتی ئێران دەکات.

ئەمە پوختەی ئەو بەشە گرنگانەی کتێبەکەی Tavernier بوو کە باسی گەل و ولاتی کوردیان تێدا کراوە.

## ئاماژەکان:

(A) [گەشتەوەرێک بە ناوی THEVENOT لە سەفەرنامەکەی خۆیدا، باسی شارێکی لە هەمان ئەو دەورو بەرەدا کردووە بە ناوی Kodgiasar. هەروەها گەشتەوەرێکی تر A Insworth باسی شاری Koch Hisarی کردووە کە ئەمڕۆ گوندێکی بچووکە. ئەم شارە ئەمڕۆ ناوی قزڵ تەپەیە، چەند کیلۆمەترێک لە شاری ماردینەوە دوورە- د.ب].

(B) دەزگای بلاوکردنەوەی ئەم کتێبە، پەنجەی بۆ ئەوە راکێشاوە کە نووسەر TAVERNIER شاری هەولێری لەگەڵ سلێمانی تێکەڵ کردووە. چونکە ئەم مەڵبەندەی Chirezoul دەبێ هەولێر بێت، نەک سلێمانی.

(C) شاری «سلێمانی»ی ئەمڕۆ، بڕوانە نەخشەکە.

(D) «زابی گەورە» بە پێی روونکردنەوەی (د.ب).

(E) Thevenot و Kinneir باسی ئەم قەلایەیان کردووە، بە قەلای Kochaf یان Sehaff ناویان بردووە. (د.ب).

(F) د.ب دەڵێ (ئەم رووبارە دەبێ رووباری «زابی بچووک» بێت).

(G) د.ب دەڵێ (ئەو شارۆچکەیە دەبێ Mushorah بێت، ئەو شوێنەی کە لە باشووری جەزیرەدا هەر سێ سنووری سووریا و عێراق و تورکیا بە یەکتر دەگەن، بەلام لەم حالەتەدا، رووبارەکە نابێ زابی بچووک بێت دەبێ زابی گەورە بێ).

(H) د.ب دەڵێ (رۆژهەلاتناس Thevenot رای وایە کە شارۆچکەی تکریت جاران شارێکی زۆر گەورە بووە، بەلام ئێستا لە کەلاوەیەک زیاتر هیچی تر نییە).

(I) د.ب :(شاری میللی سەرای Milli Saray کەمێک بە رۆژهەلاتی رێگای ئورفە- دیاربەکردا هەڵکەوتووە).

(J) د.ب :(ئارسلان چای Arslan Cay دەکەوێتە لای چەپی رووباری فورات).

(K) د.ب: (دیاربەکر لە کۆندا پێی وتراوە ئامێد Amide. هەمیشە لە لایەن تورکەکانەوە پێی وتراوە قەرە ئامێد Kara Amid).

(L) نووسەر وشەی (پاشا Bacha)ی بەکارهێناوە.

(M) یەک فەرسەخ دەکاتە نزیکەی چوار کیلۆمەتر.

(N) د.ب :(ئەولیا چەلەبی کە لە ساڵی ١٦٥٥ دا بە رێگای دیاربەکر- بەتلیس دا تێپەڕیوە، رووباری باتمانیشی بڕیوە و دەڵێ کە هەموو ئەم مەڵبەندە ناوبراوانە «لەو سەردەمەی ئەولیا چەلەبی دا» لە ژێر دەسەلاتی میرێکی کورددا بووە بە ناوی «خانی بەتلیسی»).

(O) ئەم میرنشینە بەهێزە کوردە، تەنیا بەناو سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بووە. «د.ب».

(P) شاری تادڤان کەوتۆتە رۆژئاوای گۆمی وانەوە (د.ب).

(Q) د.ب :(Ahlatی ئەمڕۆ. ئەم گوندە لە سەدەی یازدەهەمەوە هەبووە، ناوێکی ئەرمەنیی هەبووە «کلات Klath»).

(R) دەرچەک، دەرشاک، ئەرچەک Ercek کەوتۆتە رۆژهەلاتی گۆمی وان. ئەولیا چەلەبی باسی کردووە (د.ب).

(S) مەبەستی ولاتی کوردستان و میر و میرنشینە کوردەکانن.

(T) بیری ئەفسانەیی هەندێ لەو خێڵە کوردانە لە بارەی سەگی رەش و بەرخ و هتد، لە لایەن ئەولیا چەلەبیشەوە باس کراوە (د.ب).

(U) ئامێدی/ کوردستانی عیراقی ئەمڕۆ، ڕۆژهەڵاتناس Ainsworth لە ١٨٤٠ دا باسی ئەم شارەی کردوە (د.ب).
(V) شاری چۆڵەمێرگ Colemerk لە ڕۆژئاوای باشووری تورکیای ئەمڕۆ. هەم لە سەردەمی Tavernier و هەم لە سەردەمی Ainsworthدا «١٨٤٠» میرێکی کورد حوکمداریی ئەم شارەی کردووە (د.ب).
(W) مەبەستی (قەرە ئامێد)ە، کە تورکەکان بۆ (دیاربەکر) بەکاریان هێناوە.

## سەرچاوە و پەراوێز:

١- بۆ ساغکردنەوەی مێژووی نەتەوەی کورد لە سەدەکانی پێش سەدەی دووازدەهەمدا، تاقە سەرچاوەیەک لەبەر دەستماندا هەبێ، کتێبی جوگرافیاناس و گەشتەوەرە عەرەب و موسڵمانەکانن.
گرنگترین کتێب لەم بارەیەوە نووسرابێ کتێبێکە بە ناونیشانی (کوردەکان لە سەدەی حەوتەم تا دەیەمی زایینیدا)، لە لایەن نووسەری ئەرمەنی «ئارشاک پۆلادیان» بە زمانی تورکی بلاوبۆتەوە. بڕوانە:

Arsak poladyan: VII.-X. Yuzyillarda, KURTLER, Oz-GE Yayinlari, Ankara, 1991.

2- J.B. TAVERNIRER: Les Six Voyages en Turquie et en perse, T.1, ED. FM/La Decouverte, paris: 1981, P.6.

٣- هەمان سەرچاوە، ل١١.
٤- هـ. س، ل٧.
٥- هـ.س، لاپەڕەی سەر بەرگی دواوەی کتێبەکە.

6- Alain VEQUAUD: Lettres Persanes de MONTESQUIEU, ED. Hatier, N.83. Paris: 1983,pp.10,13,32.

٧- ئەولیا چەلەبی: کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا (سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی) وەرگێڕانی سەعید ناکام، چاپخانەی ک.ز.ک، بەغدا: ١٩٧٩.
٨- ئەم کتێبە TAVERNIER بەناونیشانی (شەش سەفەر بەرەو وڵاتی تورکیا و ئێران Les six Voyages en Turpuie et en Perse) بۆ یەکەمین جار لە سویسرا لە ساڵی ١٦٧٦ دا لە سێ بەرگدا بلاوکراوەتەوە، پاشان لە ساڵی ١٦٧٨ دا لە هۆڵەندا، لە شاری ئەمستردام، لە دوو بەرگدا بلاو کراوەتەوە
- لە دەزگای بلاوکردنەوەی Johannes Van Someren، چاپی سێیەمیشی لە ساڵی ١٩٨١دا لە پاریس، لە دوو بەرگدا، لە دەزگای بلاوکردنەوەی La Decouverte بلاوکراوەتەوە، ئێمە بۆ ئەم وەرگێڕانە، هەر دوو چاپەکەی (ئەمستردام ١٦٧٨) و (پاریس١٩٨١)مان لەبەردەستدا بووە، هێمای لاپەڕە تەرجەمە کراوەکانیشمان دەگەڕێتەوە بۆ چاپەکەی پاریس (١٩٨١)، هەندێ لە وێنەکانیشمان لە چاپەکەی ئەمستردام (١٦٧٨) وەرگرتوون.
٩- ئەم چاپە کۆنەی ئەم کتێبەمان لە کتێبخانەی (لانگزۆ) لە پاریس دەست کەوت، ژمارە کۆدەکەی ئەمەیە: AL.V111.131.
١٠- (پیێتەترۆ دێللا ڤاللا Pietro dell a VALLA) گەڕیدەیەکی ئیتالی بووە. لە ماوەی سەدەی شانزدەهەم و سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا چەندین سەفەری بەرەو وڵاتی ئێران کردووە. سەفەرنامەکەی خۆی لە بارەی وڵاتی ئێران، لە چەندین بەرگدا نووسیوە. لەو سەفەرنامەیەی خۆیدا، لە چەندین شوێندا، ئەویش بە درێژی لە ژیانی گەلی کورد و وڵاتی کوردان دواوە. سەفەرنامەکەی ئەم نووسەرە ئیتاڵییە، لە ساڵی ١٦٦٤دا بە ناونیشانی Voyages Farneux لە چوار بەرگدا تەرجەمەی سەر زمانی فەرەنسی کراوە. هیوادارین لە داهاتوودا ناوەڕۆکی ئەم کتێبەش (ئەو فەسلانەی کە باسی کوردیان تێدا کراوە) پێش چاوی خوێنەرانی کورد بخەین.
١١- گەشتەوەر و ڕۆژهەڵاتناسە فەرەنسییەکان، لەژێر تەئسیری شێوەی نووسینی ئیتاڵییەکاندا (لەبەر ئەوەی ئیتاڵییەکان زووتر و پێشتر- هەر لە سەدەی چواردەهەمەوە- کوردیان ناسیوە) تا سەرەتای سەدەی بیستیش لە جیاتی KURDISTAN دەیاننووسی CURDISTAN یان COURDISTAN یان KOURDISTAN.
١٢- لەم فەرهەنگەدا، وشەی Bedoine لە زمانی فەرەنسیدا بە عارەبە کۆچەرەکان وتراوە، واتە «بەدەوی».
١٣- فەرهەنگی لارووس، هەمان سەرچاوەی پێشوو، کە لە ساڵی ١٩٢٥دا چاپ کراوە، لە لاپەڕە ٦٦٦دا دەڵێ (جەزیرە، واتە جەزیرەی ئیبن عومەر: شارێکە لە کوردستان لەسەر ڕووباری دیجلە هەڵکەوتووە. ژمارەی دانیشتووانی «٩٠٠٠» کەسن).

# ویلایەتی کوردستان و ویلایەتی جەزیرە

## لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا

گەڕیدەیەکی ئەڵمانی بەناوی ئادەم ئۆلێریووس Adam 0learivs لەماوەی چارەگی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەمدا گەشتێکی فراوانی بەرەو وڵاتی ئێران کردووە و لەساڵی ١٦٣٦دا ئەو گەشتنامەیەی خۆی بە زمانی ئەڵمانی بڵاو کردۆتەوە. گەڕیدەی ناوبراو، لەو گەشتنامەیەی خۆیدا چەند لاپەڕەیەکیشی بۆ باسی ویلایەتەکانی «کوردستان» و «جەزیرە» و «دیار بەکر» و «ئازەربایجان» تەرخان کردووەو تێیدا باسی گەلی کورد دەکات لەماوەی دەسەڵاتدارێتی سەفەوییەکان لە ئێراندا. ئێمە لێرەدا پوختەی ئەو چەند لاپەڕەیە، لە زمانی فەرەنسییەوە، وەردەگێڕینە سەر زمانی خۆمان و هیواداریین سوودێک بە لێکۆڵینەوە مێژووییەکان لەبارەی ساغکردنەوەی جوگرافیاو مێژووی کوردستان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بگەیەنێت.[١]



کەریم خانی زەند

نووسەر کاتێ دەگاتە وڵاتی فارس Perse [ئێرانی ئەمڕۆ] یەک بە یەک باسی ویلایەتەکانی دەکات و وەسپیان دەکات. بێگومان لەو سەردەمەشدا، واتە لە ساڵی ١٦٣٦دا، ویلایەتی «ئەرمینیا» و «جیۆرجیا» (کە هەر یەکەیان بەشێک لە خاکی کوردستانیان خرابووە سەر) سەر بە ئیمپراتۆریەتی سەفەویی فارس بوونە، چونکە نووسەر لە لاپەڕە ٣٦٢دا دەڵێ: «ئەم دوو ویلایەتەی ئەرمینیا و جیۆرجیا بریتین لە دوو ویلایەتی هەرە قەشەنگی وڵاتی فارس».

لە باسی ویلایەتی ئازەربایجانیشدا، لە لاپەڕە ٣٦٢دا دەڵێ:

«ئەوروپییەکان بە ویلایەتی ئازەربایجان دەڵێن Aderbajan یان Adarbigian کە بریتییە لە بەشی باشووری وڵاتی میدیای کۆن، واتە ئەو بەشەی کە مێژوونووسەکانی سەردەمی کۆن بە میدیای ناوەڕاست

Media Major ناویان دەبرد». پاشان، لە هەمان لاپەڕەدا، نووسەر پەنجەنومای ئەوە دەکات کە لەو سەردەمەدا، لە ساڵی ١٦٣٦دا، لە پاڵ ویلایەتی ئازەربایجان، ویلایەتێک بەناوی «کوردستان،Kurdestan، هەبووە»، لەم بارەیەوە دەڵێ: « سەبارەت بەوەی کە ئەمڕۆ، بێگومان، ئاشکرایە کە ویلایەتی کوردستان Kurdestan ئەو وڵاتەیە کە مێژوونووسەکانی سەردەمی کۆن بە ئاسیریا Assyris ناویان بردووە، بۆیە لێرەدا دەتوانین – لە هەندێ رووەوە – باوەڕ بە بیروڕاکەی جوگرافیاناسی ناودار نوبیی NUBIE بهێنین لەوەی کە دەڵێ : ئەم وڵاتە بریتییە لە بەشی باکووری ئاسیریا Assyris کە هەردووکیشیان سنووری هاوبەشیان لەگەڵ یەکتردا هەیە و تەنانەت لە گەلێک شوێندا سنووریان تێکەڵ بەیەکتریش بووە».

نووسەر، لە هەمان لاپەڕەدا، بەم شێوەیەی خوارەوە سنووری سیاسی – ئیداری ویلایەتی کوردستانی ساڵی ١٦١٣مان بۆ دیاری دەکات:

«ویلایەتی کوردستان Kurdestan بە بیابانی مۆکان Mokan خۆی لە ویلایەتی شیروان Schirüan جودا دەکاتەوە، هەروەها بە رووباری ئاراس Arax خۆی لە ویلایەتی قەرەباغ جیادەکاتەوە، لە بەری رۆژهەڵاتی ویلایەتی کوردستانیشدا ویلایەتی گیلان Kilan هەیە».

ئەم وێنەیەی سەرەوە، کە نووسەر لەبارەی جوگرافیای «ویلایەتی کوردستان» لە ساڵی ١٦٣٦دا پێمان دەبەخشێ، بێگومان یارمەتیمان دەدات کە بتوانین بە تەواوەتی لە سنووری جوگرافیای ئەم ویلایەتەی «کوردستان» دڵنیابین کە لە ساڵی ١٦٣٦دا واتە لە سەردەمی سەفەوییەکانی ئێراندا ئەم ناوچەیە بوونێکی ئیداریی سەربەخۆی هەبووە. بەڵام بێگومان نابێ ئەوەش لەبیربکەین کە لە هەمان سەردەمدا میرنشینێکی بەهێزی کوردیی دیکە لە باکووری کوردستاندا، واتە لە دیوی تورکیای ئەمڕۆدا، لەژێر فەرمانڕەوای تورکە عوسمانییەکاندا، قەوارەیەکی سیاسیی بەهێز و نیمچە سەربەخۆی هەبووە. میرنشینە بەناوبانگەکەی بەتلیسی، کە پایتەختەکەیان شاری بەتلیس بووە.[٢]

پاشان نووسەر لە لاپەڕە ٣٦٧دا هێما بۆ ئەوە دەکات کە ویلایەتێکی کوردنشینی دیکە بەناوی ویلایەتی جەزیرە Tzisireیان ویلایەتی دیاربەکر Diarbek، هەر لە ژێر فەرمانڕەوایەتیی سەفەوییەکانی ئێراندا هەبووە، دەڵێ: «جەزیرە Tzisire ناوەکەی لە تۆمارخانەی ناوی شارەکانی وڵاتی فارسدا قەید کراوە، کە بریتییە لەمیزۆپۆتامیای کۆن، ئەمڕۆ بە ویلایەتی دیاربەکر Diarbek ناوی دەبەن، کەوتۆتە نێوان هەردوو رووباری ئۆفوڕات Euphrates و تیگریسەوە Ti-gris، ئەو رووبارەی کە تورکەکان بە دیجلە Digel ناوی دەبەن».

لەرێگەی ئەم چەند دێڕە گەواهیدەرە مێژووییانەی نووسەرەوە، کەواتە دەتوانین بڵێین کە خاکی کوردستان لەماوەی ساڵانی سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا، لە نێوان دوو ئیمبراتۆریەتی گەورەی سەفەوی و عوسمانیدا، بەسەر چەندین ویلایەتی جۆراوجۆردا دابەش کرابوو: ویلایەتی کوردستان، ویلایەتی جەزیرە یان دیاربەکر. ویلایەتی ئازەربایجان، ویلایەتی ئەرمینیا...هتد.

نووسەر لە لاپەڕە ٣٦٧دا، هەر لەبارەی ویلایەتی دیاربەکرەوە دەڵێ:

« ئەم ویلایەتە چەندین جاران لەلایەن تورکەکانەوە لە فارسەکان سەندراوەتەوەو داگیرکراوە، پاشان دیسان داگیرکراوەتەوە و داگیرکراوەتەوە. هەروەها دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە ئەم ویلایەتە هەمیشە هەر وەکو ئێستە لەژێر فەرمانڕەوای شای ئێراندا Schah نەبووە، سەریشی بۆ شا Schah دانەنواندووە: مەگەر تەنیا لەو سەردەمەدا نەبێ کە شا سنووری فەرمانڕەوایەتیی تاکو شاری بەغداو پاشانیش مووسڵ رۆیشتبوو».[٣] هەروەها نووسەر، لەهەمان لاپەڕەدا دەڵێ: « دەبێ ئەوەش بڵێین کە بەغدا بەتەواوەتی سەر بە ویلایەتی دیاربەکر نییە، بەڵکو سەر بە

ویلایەتێکی دیکەیە بەناوی عیراقەین Eracain» ، واتە (عێراقی عەرەب) و (عێراقی عەجەم). «فارسەکان واتێدەگەن کەکاتی خۆی بابلییەکان Babylon بەخۆیان و خانووبەرەو باخچەکانیانەوە لە شاری بەغدادا شارستانیەتێکی گەورەیان هەبووە، راستییەکەشی وشەی Bag واتە (باغ) دەگەیەنێ، وشەی بەغدادیش پێکرا Bagdat واتە ئەو شوێنەی کە پربێت لە باغ. ئەم دیاردە زمانەوانییە تا رادەیەک راستبوونی تێگەیشتنەکەی ئەوان دەسەلمێنێ».

هەروەها نووسەر باس لە لورەکانیش دەکات و دەڵێ:

« ئەوانەی لە هەموو کەسێک زیاتر خەریکی قاچاغچییێتی و بازرگانین، لورەکانن، لور کۆمەڵە خەڵکێکی تایبەتین، لە فارسەکان جیاوازن. ئەم جیاوازییەش بە سەرو پۆتەڵاک و شێوەی قژ بەردانەوەیانەوە دیارە. زۆر جاران پیاو دەیانبینێ تێڵەگەیەکیان لە پشتی خۆیاندا هەڵداوە» ،(٤) - ل.٣٦٦.

نووسەر لەلاپەرە ٤٥٣دا باسی ویلایەتی شیروان Schirüan دەکات و پاشان دێتە سەر باسی یەکێک لە زنجیرە چیاکانی تۆرۆس و دەڵێ:

« ئەم لقەی زنجیرە چیای تۆرۆس Taurus پێی دەڵێن کەیدەر پێغەمبەر Keider Peyamber کە لە باکوورەوە بەرەو باشوور درێژدەبێتەوە، دەروا تا دەگاتە کوردستان Kurdestan ، ئەو شوێنەی کە ئیدی لەوێ، گڵکۆی یەکێک لە پێغەمبەرە هەرە کۆنەکانیانمان دەکەوێتە بەر چاو: ئەو پێغەمبەرەی، وەک خۆیان دەڵێن، ناوی چیاکە لە ئەوەوە هاتووە».



خەنجەری لورستان

لە لاپەرە ٥٧٦یشدا سەرلەنوێ ناوی کوردستان و گەلی کورد دەهێنێتەوە و پاشان لە باسی ئەفسەرەکانی شا عەبباسی سەفەویدا دەڵێ:

« ژەنەراڵی لەشکر پێیان دەڵێن سەردار Serdar ئەو کۆڵۆنێلەی کە دە هەزار یان دووازدە هەزار سەربازی لەژێردەستە پێی دەڵێن:Kurtzibaschi، ئەو کاپیتانەی

که سەد پیاوی لەژێر دەستە پێی دەڵێن «یووزباشی» ، ئەو ئەفسەرەی کە دە سەربازیشی هەیە پێی دەڵێن "ئۆنباشی" پاشان باسی ئەوە دەکات کە لەشکرە فراوانەکەی شا عەبباسی سەفەوی لە چەندین میللەتی جۆراوجۆر پێکهاتوون، وەکو «عەرەب – ئەرمەن، فارس، کورد...هتد» دەڵێ: «ئاغاخان Aga Chan، کە کوڕە شوانێکی خەڵکی دەوروبەری شاری مەراغە بوو، پاراستنی شاری وان Wan پێ سپێردرابوو، کارتزوو باشیخان کە کوڕە مەسیحییەک بوو و فرۆشرابووە شا عەبباس کرابووە ژەنەڕاڵی لەشکر، سەلما خان Salma Chan کە بەڕەگەز کورد بوو، ئەویش بەرپرسیارێتی Palefrnier ی لەشکری شاعەبباسی پێ سپێردرابوو». (٥)

**سەرچاوەو پەراوێز:**

(1) Adam 0lEARIVS: Relation dv Voyage D A.OlEARIVS en Moscovie, Tartarie, et perse, Nouvelle Edition, Contenant Le Voyage Iean Albert De Mandelslo aux Indes Orientales, Trad. de L Allemand Par A.de WICZVEFORT, T.1, Paris: 1666, PP.362 - 650.

کۆدی ئەم کتێبە لە کتێبخانەی «لانگرۆ» لە پاریس [N.IV.32].

(٢) بەڕای ئێمە باشترین سەرچاوەی فەڕەنسی، کە بەشێوەیەکی فراوان و وردبینانە باسی ئەم میرنشینەی شەرەفخانی بەتلیسیی کردبێت بریتییە لە شەش گەشتە بەناوبانگەکەی TAVERNIER، هەروەها بڕوانە وەرگێڕانە کوردییەکەی (سیاحەتنامەی ئەولیای چەلەبی) بەقەڵەمی مامۆستا سەعید ناکام، چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغدا.

(٣) دیارە مەبەستی نووسەر داگیرکردنی شاری بەغدایە لەلایەن شا عەبباسی سەفەویەوە.

(٤) هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٣٦٦ .Adam Olearivs.

(٥) هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٦٥٠ .Adam Olearivs.

# زمانی کوردی لە ساڵی ١٦٥٥دا

## خوێندنەوەیەکی سیاحەتنامەکەی ئەولیای چەلەبی

یەکێک لەو بابەتە گرنگانەی کە گەڕاڵ و کوردناسەکان دەیکەنە کەرەستەی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان بریتییە لە زمانی کوردی و دیالێکتە جۆراوجۆرەکانی. یەکەم گەڕاڵ کە بەفراوانی و تێروتەسەلی باسی زمانی کوردی و لەهجەکانی زمانی کوردیی کردبێت - جگە لە ئاماژەکەی ئێگزێنۆفۆن (٤٠١ پ. ژ) - بریتییە لە ئەولیا چەلەبی، کە لە کتێبی سیاحەتنامەکەیدا، لە ساڵی ١٦٥٥دا، هەندێ تێبینی لەبارەی زمانی کوردی نووسیوە و چەند وردە تێکستێکی(قسەی ژیانی رۆژانەی) بە زمانی کوردی بۆمان گواستۆتەوە[١].

لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا هەوڵ دەدەین، لەرێگەی خوێندنەوەی فەسڵێکی سیاحەتنامەکەی ئەولیای چەلەبییەوە، چەند تیشکێک بخەینە سەر بار و دۆخی زمان و نووسینی کوردی لە ساڵی ١٦٥٥دا. پێویستە ئاماژەی ئەوەش بکەین کە تەرجەمە کوردییەکەی ئەم سیاحەتنامەیە، کە لەلایەن مامۆستا سەعید ناکامەوە کراوە، بەداخەوە، گەلێ بابەتی گرنگی پەڕاندووە و نەینووسیوە. کۆڕی زانیاریی کوردیش لێی بێ خەبەر بووە. ئێمە، بۆ نووسینی ئەم باسە، ناچار بووین بگەڕێینەوە سەر تێکستە ئەسڵییە عوسمانییەکە، واتە چاپە تازەکانی[٢]. بەشێکی ئەو تێکستانەی لێرەدا بەکارهاتوون، لە چاپەکەی مامۆستا سەعید ناکام دا نین و لە چاپە تورکییەکەوە وەرمانگرتوون.



دوو ئافرەتی کرمەشانی

### ئەو سەرچاوانەی لە هەمان سەردەمدا باسی زمانی کوردییان کردووە

١- زانایەکی موسڵمانی عەرەب لە سەدەی دەیەمدا، ئەلتەننوخی، ناوی (لسان الاکراد)ی هێناوە. بەڵام نەچۆتە بنج و بناوانی زمانەکەوە[٣].

٢- حەیدەر چەلەبی، گەڕاڵێکی عوسمانی بووە و لە دیوانی بایەزیدی دووەمدا کاری کردووە و سکرتێری دیوانی پاشا بووە، لە ساڵانی ١٥١٤ - ١٥١٨ گەڕاوە. لە سەفەرنامەکەی خۆیدا هەموو کوردستانی وەسف کردووە. باسێکی کورت و بەپەلەی زمانی کوردیشی کردووە.

٣- گەڕاڵێکی دیکەی عوسمانی، ناسح مەترەقچی، کە لە ١٥٣٤ - ١٥٣٦دا لە کوردستاندا گەڕاوە و سەفەرنامەیەکی نووسیوە، باسی زمانی کوردی و کوردستانیشی کردووە: ئاڵتوون کۆپری، دیاربەکر، کەرکووک. سەفەرنامەکەی بە ناوی سولەیمان نامە بووە، لە ١٥٤٥دا لەگەڵ کۆمەڵێک وێنە و میناتۆردا بڵاوکراوەتەوە. تەرجەمەی فەرەنسی و ئینگلیزیش کراوە(٤).

٤- کتێبی " نۆبار"ی ئەحمەدی خانێ، کە قاموسێکە بۆ منداڵان لە ١٦٨٢ - ١٦٨٣دا نووسراوە بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی، تاقە کتێبێکی پەخشانە (جگە لە مەم و زینە شیعرەکەی خانێ) کە لەو سەردەمەی ئەولیا چەلەبیدا (لە سەدەی حەڤدەهەمدا) بە کوردی نووسرابێت(٥).

ئەحمەدی خانی لەوە گەیشتبوو کە گەشەسەندنی کولتووری نەتەوەیی، تەنیا بەوە دەبێت کە بە زمانی کوردی بنووسرێت، بۆیە خانی لەسەرەتادا دەستی کردووە بە دەرسی کوردی وتنەوە و دواییش لە حوجرەکەیدا بە کوردی دەرسی وتۆتەوە، بۆیە ئەو فەرهەنگەی بۆ منداڵان داناوە(٦):

نە ژ بۆ ساحێب رەواجان

بەڵکە ژ بۆ بچووکێد کورمانجان

٥- سەرچاوەیەکی دیکە کە لە هەمان سەردەمدا باسی زمانی کوردیی کردبێت بریتییە لە کتێبەکەی رۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی، پیەترۆ دیللا ڤاللا کە لە ساڵی ١٦٦٧دا باسی زمانی کوردیی کردووە، دەڵێ: "کوردەکان زمانی تایبەتی خۆیان هەیە و زمانەکەیان لە زمانی دراوسێ عەرەب و عەجەمەکانیان ناچێ(٧).

**نووسین بە زمانی کوردی لە کوردستانی ساڵانی ١٦٥٠ لە دیاربەکر و بەتلیس و وان**

بە پێی قسەکانی ئەولیا چەلەبی، ژیانێکی ئەدەبیی فراوان لە دیاربەکر و بەتلیس و وانی ساڵانی ١٦٥٠دا هەبووە. لەم بارەیەوە دەڵێ:

"لەم دیاربەکرەدا چەند شاعیری قسەڕەوان و زمانپاراو هەن کە هەر یەکەیان فزووڵی و رۆحی ییێکە بۆ خۆی. لەگەڵ زۆریان دانیشتم و ئاخاوتم. بەڕاستی نموونەی ئەدەب و گەورەیین.- ل ٥٠. هەروەها دەڵێ:

"لە بەتلیس، حەوت شاعیرم ناسی کە دیوانی شیعرییان هەیە.لەوانە: کاتب چەلەبی، مەلا رەمەزان چەلەبی، جەننەتی چەلەبی، گەنجی چەلەبی.- ل ١١٣.

ئەولیا لەبارەی شاری وانیشەوە، دەڵێ: " لە وان شای شاعیران: شانی ئەفەندی یە، جگە لە ئەو وانی چەلەبی، میر سوپەهر". - و: سەعید ناکام، ل ٢١٨.

بەڵگەنامەیەکی دیکەی بایەخدانی کوردان بە نووسین و ئەدەبیات و فەرهەنگ لەو سەردەمەدا، لە کتێبخانەکەی عەبداڵخانەوە دەردەکەوێ. ئەولیا چەلەبی لەم بارەیەوە دەڵێ:

سامانی عەبداڵخانی میری بەتلیس، کە هەراج کران: لە شەرەفنامە و شانامە و گوڵستانی شیرازییەوە بگرە تا دەگاتە حەفتا بەرگ تەفسیری قورئان. هەزار بەرگ دەسخەتی جۆراوجۆر. باری حەوت حوشتر کتێبی باییدار. لەگەڵ

حەفتا و شەش بەرگ کتێبی فارسی و عەرەبی و تورکی لە دانانی عەبداڵ خان، لەگەڵ سەد و پێنج نامیلکەی جوربەجۆر کە زۆربەیانی بە فارسی نووسیبوو. ل ٢٧٨ - ٣٠٠.

جگە لەمانەش، قامووسەکەی ئەحمەدی خانی (نۆبار) لە ساڵی ١٦٨٢ - ١٦٨٣دا و مەم و زینەکەی لە هەمان سەردەمدا؛ هەروەها چەندین بەرهەمی شیعریی سەلیمی سلێمان و مەلای باتی و بێسارانی و بایەزیدی و شاعیرانی تری ئەردەڵان، نوونە و بەڵگەی دیکەی ئەوەن کە نووسین بە زمانی کوردی لە سەدەی حەڤدەهەمدا هەبووە. بەڵام وەک دەردەکەوێ، شیعر لەو سەردەمەدا پانتایی هەرە فراوانی نووسینی کوردیی داگیرکردووە(٨).


کوردێکی یەزیدی مستەر ریچ ١٨٢٠

### ئایا نووسینی پەخشان بە زمانی کوردی هەبووە؟

ئەولیا چەلەبی دەڵێ: عەبداڵخانی میری بەتلیس، حەفتا و شەش بەرگ کتێبی فارسی و عەرەبی و تورکی، لەگەڵ سەد و پێنج نامیلکەی جوربەجۆر، زۆربەیانی بە فارسی نووسیبوو". - ل ٢٧٨- ٣٠٠.

کەواتە، بەم قسەیەی سەرەوەدا دەردەکەوێ کە نووسینی پەخشان لە کوردستانی ساڵانی ١٦٥٠دا بەشێوەیەکی گشتی بە عەرەبی و تورکی، زۆربەی جارانیش بە زمانی فارسی بووە.

ئەوەش لەبیر نەکەین کە شەرەفخانی باپیرە گەورەی عەبداڵخانیش، کاتێ شەرەفنامەی مێژووی کوردانی نووسیوەتەوە لە ساڵی ١٥٩٦دا، ئەویش هەر بە فارسیی نووسیوە نەک بە کوردی. جگە لەمەش، مەلا مەحموودی بایەزیدی لە (عادات و رسوماتنامەی ئەکرادیە)دا لە ساڵی ١٨٦٠، دووپاتی دەکاتەوە کە (دنێڤ ئەکراداندا مەکتووب و کاغەزێد وان فارسی العبارە دبن. خووندنا ترکی و زمانی ترکی کێم دزانن. کتێبێد ترکی لنک وان موعتەبەر نینن). ئەم سێ بەڵگەیەی سیاحەتنامە و شەرەفنامە و بایەزیدی، بۆمان

روون دەکەنەوە کە نووسینی نامە و کتێب و وتار و پەخشان لەو ساڵانەدا (١٥٠٠ – ١٨٦٠) بەشێوەیەکی گشتی و پێش هەموو زمانێکی دیکە بە زمانی فارسی بووە.

لە گەواهیدانێکی دیکەی چەلەبیدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە عەبداڵخان بە تورکی شیعری نووسیوە و نووسینی شیعر بە تورکی باو بووە. بڕوانە ئەم گەواهییەی چەلەبی:

سەروەری گەورەمان، جەنابی عەبداڵ خان پیاوێکی شاعیر و قسە رەوان و نووسەر و زانا و لە هەموو هونەرێکدا وەستایە، قەسیدەیەکی بە تورکی و شێوەی رۆژەکی داناوە کە لێرەدا دەینووسم. هەواکەی لەسەر مەقامی سێگا دەگوترێ[٩].

ئەم قسەیەی چەلەبی ئەوە دەردەخا کە نووسینی شیعر بە زمانی تورکی باوی بووە.

هەر چۆنێک بێت، تاک و تەرا ئەگەر هەر نووسینێکیش بە کوردی نووسرابێت، وەک قاموسی نۆبارەکەی ئەحمەدی خانی لە ١٦٨٢ – ١٦٨٣دا، ئەوا لە ئەنجامی تاڵان و سووتان و جەنگەکانی عوسمانیدا، لەناوچوون و نەماون. ئەولیا چەلەبی لەم بارەیەوە دەڵێ:

"هەزاران بەرهەمی هونەرکارە بەرزەکانی دنیا لێرەدا خرابوونە هەراجەوە. ئەو کوردە هەمە ڕەنگە جروجانەوەرانە و ئەو خەڵکەی هینی خۆی و گێزەر لێک ناکەنەوە، ئەم وێنانەیان دەستاودەست دەگێڕا و لەم خێوەتەوە دەیانبردە خێوەتێکی دیکە و بێ قەدر ئەمەدیو ئەودیویان دەکردن تا وای لێ دەهات بە شڕوڕاکاوی دەدرایەوە دەستی دەڵاڵەکە. – تەرجەمە کوردییەکە، ل ٢٨٤– ٢٨٥.

## باری خوێندنی قوتابخانە و حوجرەی مزگەوتەکان

هەر لەبارەی زاڵبوونی کولتووری فارسییەوە لە کوردستانی باکووری ئەو سەردەمەدا، ئەولیا چەلەبی لەبارەی قوتابخانەکانی شاری وانەوە دەڵێ:

شاری وان پێنج مەدرەسەی لێ بووە. " ئەو مەدرەسانە لەناو مزگەوتەکاندا بوونە". دەرسی عیلمییان تێدا خوێنراوە. لە دوو مزگەوتان قورئان خوێنراوە. بەڵام وەکو وڵاتی رۆم خوێندنگای نوێی نییە. بیست قوتابخانەی منداڵی ئەبجەد خوێنی لێیە. منداڵە زیرەکەکانی زۆر جوان فارسی دەخوێننەوە. ل ٢١٤.

لەبارەی ئەوانی مەلاتیە و بەتلیسیش، دەڵێ: مەلاتیە ٥٢ مزگەوتی لێیە. چونکو ئێرە کوردستانە قورئان لەبەری زۆر نییە. ل ٤٥. بەڵام لە بەتلیس: ٤ مەدرەسە هەن. هەر یەکی یەک مودەریس و یەک یا دوو مامۆستای دەرسی گشتییان هەیە. عیلمی حەدیس و تەفسیری قورئانیان تێدا دەگوترێتەوە. حەفتا قوتابخانەشی لێیە. ل ١١٠

دیار نییە، ئاخۆ لە مەدرەسەی ئەو شارە کوردنشینانەدا ئەو دەرسە عیلمییانەی حەدیس و تەفسیر و ئەبجەد خوێندن بە چ زمانێک گوتراونەتەوە؟ بەڵام چەلەبی دەڵێ: " منداڵە زیرەکەکانی زۆر جوان فارسی دەخوێننەوە". ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێ کە فارسی خوێندنەوە و نووسین هونەرێک بووە و باو بووە، زمانێکی باڵا و رەونەقدار و سەپاو بووە لە مەڵبەندەکانی کوردستاندا. لەبارەی زمانی عەرەبیشەوە، کە زمانی قوڕئان بووە، سەبارەت بەوەی کە کورد لە عەرەبستان دوور بوونە و هێندە خوویان نەداوەتە زمانی عەرەبی، بۆیە قورعانخوێنیشی هێندە زۆر تێدا نییە.

**دوو تێکستی قسەکردن بە زمانی کوردی**

١) یەکێک لە تێکستەکان، بریتییە لە گۆرانییەکی فۆلکلۆریی ناوچەی زاخۆ کە لەبارەی رووباری خاپوورەوە بە مەقامی شوورەگر دەیلێن. گۆرانییەکەش ئەمەیە:

کــوردێ چوومـــە جــەزیری کــەلەک بەردانێ

چوومـــــە خــــاپووری خـــــێـــــوەت وەددانێ

ئا یا یا یا ئوو یوو یوو، ئوویـیـــوو یـیــوو یوو

ئامــان مــروەت، عـــەزیزم، بۆچی کــەلەندوو(١٠)

٢) دووەم تێکست، کە بە دیالێکتی "کوردیی سۆران" نووسراوە، بێگومان، زمانی نووسین نییە؛ بەڵکو زمانی قسەکردنە. تێکستەکە بایەخێکی ئەدەبیی ئەوتۆی نییە، بەڵکو بەڵگەنامەیەکی زمانەوانییە و تەرجەمەی تورکیش کراوە:

ژمارەکان: یەک، دوو، سێ، چار، پێنج، شەش...

تۆ کرمانجی وەرە روونێ. سەلامەت هاتە. حال تە چیە. خۆش قلاوێ. هەرە شوغڵی خۆ. حەسپی سوار بە. وەرە روونە. وەرە خوار. هەرە ژوور. هەرە بینە. هەیە بینە. هەیە نان. هەیە. چ هەیە بینە. مرشک هەیە، بینە. نزانم مرشک. تۆ درۆ دکە. هەیە چەندن. نزانم هەرە بینە. رادبم سەری تە چار تانکم. ب سەری میری تە. وەرە. هەرە رابە. زانم. نزانم. نان. ئاو. گۆشت. هنگوێ. دبس. تراماله. زبش. هەژیر. پەز. بزن. سێو. ئەسکرک. مێوژ. جویز. شاپک هەیە. فرۆش. فرۆشم. بە چەند فرۆش. چارێک. گۆپاڵ. لکان. تاخوک. خێوەت. چوومە جەزیرێ. کەلەک بەردانێ. بۆچی کلندر تاخورە. ئێرۆ دوو رۆژە. مەکان دوورە. خان عالیشانە. ئی شەو چ شەوە. شەوەکە داری باران دبارێ. شەوی حاجیان. بەژنەک زراو خال خالتە گەوهەر د گۆهان. – ل ٩٢.

ئەولیا چەلەبی لە هەندێ شوێنی دیکەش ئاماژە بۆ زمانی کوردی دەکات. لە لاپەڕە ٢٤٠ی تەرجەمەی سەعید ناکامدا، دیلێکی کورد بە کوردی قسەی کردووە و گوتوویەتێ: "نزانم خەبەری خانێ". هەروەها لە لاپەڕە ١٧ و ٢٤٧شدا نموونەی دیکە دەبینین.

چەلەبی لەبارەی لەهجەکانی کوردستان دەڵێ:

لەناویاندا گەلێک شێوەی جیاواز هەیە، وەکو زازا، لۆلۆ، هەکاری، عونیکی، مەحموودی، شیروانی، جەزیری، پسـانی، شـەنگاری، هەریری، ئەردەڵانی، سـۆرانی، خـالتی، چەکـوانی، رۆژەکی". ئنجـا پاشـان، باسی لەهجـەی کوردەکانی رۆژەکی دەکات: "کوردەکانی رۆژەکی، هەرچەند لە کوردە کۆنەکانن، بەڵام لەناو خۆیاندا زۆر بە ناسکی و رەوانی دەئاخەون. جۆرە وشەیان هەیە کە کوردەکانی دیکە تێی ناگەن، کەچی ئەمان هەر دوازدە شێوەی کوردی بەباشی دەزانن". ل ٩٢ – ٩٣

ئەولیا چەلەبی، لە لاپەڕە ١٨ و ١١٤ و ٢١٨دا لیستێک ناوی کوردیشی پێشکەش کردووین:

ناوی ژنان: حەوا، هوما، روقیە، کەلسوومە، دڵفیگار، پەرێشان، زۆزان، شای خوبان، مریەم، زلێخا، دڵدار، ئەگلەنجە، گەوهەر، ئەسماخان، پەری بۆی خانم، میسکبار، دلارام، نوورەبان، باخ جینان، خەندان.

ناوی پیاوان: سینان، بەگداش، زۆراب، شاسوار، دلاوەر، سەروەر، هونەروەر، مراد، جوانمەرد، حەیدەر، قوباد، لەوەند، ئەڵوەند، سیاوەش.

هەموو ئەمانە و دەیان بابەتی دیکە، لە سیاحەتنامەکەی ئەولیا چەلەبی دا شایستەی لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەن. ئەوەش لەبیر نەکەین کە ئەم چەند دێڕە کەمانەی نێو کتێبەکەی ئەولیا چەلەبی دەبن بە یەکێک لە یەکەم تێکستە تەرجەمەکراوەکان - لە کوردییەوە بۆ زمانێکی بێگانە - کە چاپ کرابێ.

نووسەری ناوداری هۆڵەندی، مارتن ڤان برۆنسن، لێکۆڵینەوەیەکی بەپێزی لەبارەی زمانە تورکییەکەی سیاحەتنامەی ناوبراو نووسیوە. نەخشە و دەسنووس و وێنەکەی لەم باسەدا پێشاندراون، لە سەرچاوەکەی مارتن ڤان برۆنسن وەرگیراون[١١].

**سەرچاوە:**

١: ئەولیا چەلەبی: سیاحەتنامە، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، لە بڵاوکراوەکانی ک. ز. ک.، بەغدا: ١٩٧٩.

٢: چاپە عوسمانییە تازەکان هەڵگێڕدراونەتە سەر ئەلفابێی تورکیی تازە، بریتین لە:

-Evliya Celebi Seyahatnamesi, Altinci Kitab, Mehmed Zilli oglu, Turkcelestiren: Zuhuri DANISMAN, Ankara: 1970. p. 136-185.

-Evliya Celebi Seyahatnamesi, Cild: III- IV, Ucdal Nesryati, Ankara: 1986. p. 474-490.

٣- ئارشاک پۆلادیان: کورد لە سەدەکانی حەوتەم - دەیەمدا، بە پێی سەرچاوە ئیسلامییەکان، یەریڤان: ١٩٨٧، هەڵسەنگاندنی: د. رەشاد میران لە گۆڤاری رووناکبیری، ژ ١، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٢.ل ٩ی ئارشاک پۆلادیان. ل ١٢٤ ی رووناکبیری.

4- Metin AND: Turkishe Minatur painting, The Ottoman period, Dost publication, 4the ed., Istanbul: 1987.

٥: یەکەم جار لە پاشکۆی فەرهەنگەکەی یوسف ضیاء الدین باشا الخالدی المقدسی : الهدیە الحمیدیە فی اللغە الکردیە، استنبول: ١٨٩٣. (٣١٩) لاپەڕە، بڵاوکراوەتەوە.

٦: ئارشاک پۆلادیان: کورد لە سەدەکانی حەوتەم - دەیەمدا، بە پێی سەرچاوە ئیسلامییەکان، یەریڤان: ١٩٨٧، هەڵسەنگاندنی: د. رەشاد میران لە گۆڤاری رووناکبیری، ژ ١، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٢.ل ٩ی ئارشاک پۆلادیان. ل ٨٠ی رووناکبیری.

٧: میریللا غالیتی: التراث الکردی فی مولفات الایطالیین، ت: د. یوسف حبی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، بەرگی هەشتەم، بەغدا: ١٩٨١، ل ٢٢٥- ٣٠٠.

٨: م. ب. رۆدنکۆ: ئەدەبی کوردیی سەدەی حەڤدەهەم، گۆڤاری رووناکبیری، ژمارە (١)، ستۆکهۆڵم: مارتی ١٩٩٢، ل ٧٣ - ٧٩.

٩: پێنج خشتەکییە. نەنووسراوە. ل ١١٨.

10- Evliya Celebi Seyahatnamesi, Cild: III- IV, Ucdal Nesryati, Ankara: 1986. p. 451.

11 :Martin Van BRUNSSEN: Evliya Celebi, The Relevant Section of the Seyahetname, edited with translation, commentary and introduction by M. V. BRUNSSEN, Holland: 1988.

## ڕەوەندە شکۆمەندەکانی ئاسیا

ئەم چەند دێڕەی لە خوارەوە دەیانخوێنیتەوە، بریتین لە بیروبۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسایی بە ناوی (ئەلفرێد ژاکوب) کە لە چارەگی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا سەفەرێکی دوورودرێژی بە کیشوەری ئەفریقا و ئاسیادا کردووە: لەو سەفەرەیدا سەری لەکوردستانیش داوە و یاداشتەکانی خۆی لەکتێبێکدا بە ناونیشانی Voyages en Asie en Afriqne لە ساڵی ١٨٥٣ دا لە پاریس چاپ کردووە. ئێمە لێرەدا تەنیا بەشێکی کەم، واتە پوختەی بیروڕاکانی لەبارەی گەلی کوردەوە دەخەینە پێش چاو.

لە بەشی سی و نۆیەمی گەشتنامەکەیدا لەلاپەڕە ٢٨٩ دا، دوای باسی شاری یەریڤان و چیای ئارارات و ڕووباری ئاراس، لە دەستپێکردنی شاری (وان)دا دەڵێ:

« شاری وان دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی گۆمی وانەوە، هەر چوار دەوری بە شوورەیەکی بەردین دەوردراوە، لە ناوەوەشدا قەڵایەکی بەرز کە لەسەر کەڵەبەردێکی تاق و تەنیا هەڵچندراو، پارێزگاریی شارەکە دەکات. شاری وان نزیکەی ٢٠٠٠٠ بیست هەزار کەسی تێدا دەژی، بەشی زۆریان ئەرمەنین، شاری وان بە کۆنترین شاری ئەرمەنیا لە قەڵەم دەدرێ، هەر بۆیەش لە ڕووی مێژووییەوە بەختی ئەوەی هەبووە کە هەمیشە گەڕیدەکان ڕووی تێبکەن. - ل ٢٩».

پاشان باسی شاری ئەرزەرۆم دەکات:

«گرنگترین شاری ئەرمینیای تورکیا لە ڕووی بازرگانی و ژمارەی دانیشتوانەوە بریتییە لە شاری ئەرزەرۆم، ئەو شارەی کە بەم دواییە ژمارەیەکی زۆر لە فەرەنسییەکان ڕوویان تێکردبوو. شاری ئەرزەرۆم ئەمڕۆ بریتییە لە ناوەندێکی زۆر گرنگی پاشایەتی کە سەرتاپای بەرزاییەکانی ئەرمینیا دەگرێتەوە؛ تورکەکان بەم ناوچەیە دەڵێن کوردستان. ل ٢٩».



کوردێکی موکری
بەرهەمی نیگارکێشێکی کورد، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا

« ئەرزەرۆم پێدەشتێکی تا چاو هەتەر دەکا هەراو دەگرێتەوە، ناو شارەکەی بەشوورەیەکی بەرزی بەردین دەور دراوە، قەڵایەکی زەبەلاحیش لە ژوورەوەیدا پارێزگاریی دەکات». « خەڵک لێرە، وەک لە سێبیریا، بە هەڵم خۆیان گەرم دەکەنەوە؛ خۆ هەرچەندە دار لە ناو شاخەکاندا دەستیش دەکەون، بەڵام لەوەدەچێ دار لە شاخەکانەوە بەرەو ناو شار نەبووبێتە عادەتی خەڵک». «خەڵووزیش لە چیاکانی کوردستان نەبێ لە هیچ شوێنێکی دیکەدا دروست ناکرێ؛ پیاو پێویستە شەش تا حەوت ڕۆژان بەڕێوە بێت بۆ ئەوەی خەڵووز لە کوردستانەوە بێنێتە ئەرزەڕۆم. ل ۲۹۱».

ئینجا لە لاپەڕە ۲۹۲ دا لە باسی یەزیدییەکاندا دەڵێ:

« ئەرمینیا جگە لە خەڵکی تورک و دووڕەگ، ژمارەیەکی سەرنجڕاکێشی لە یەزیدییەکانیش تێدا دەژی، یەزیدییەکان ئەو کۆمەڵە خەڵکەن Peuplades کە لە سەرتاپای میزۆپۆتامیای کۆندا، دەژین، هەروەها لە سوریا، لە حەلەبەوە تا بەسرە، لە مووسڵ، لە تەوریز، لەیەریڤان». «ئەم کۆمەڵە خەڵکە بەشێکیان ڕەوەند و جەڵەبدارن و بەشەکەی دیکەیشیان نیشتەجێن، ئایینێکی تایبەتییان هەیە کە لە هەندێ ڕووەوە لە ئایینی مەسیحی دەچێ، هەر سەبارەت بەمەشە کە موسڵمانەکان بە نەفرەت لێکراو لە قەڵەمیان دەدەن».

ئەم یەزیدییانە ڕقی دنیایان لە دینی محەممەدە. تورکەکان چەند هەوڵیان لە گەڵیان دا کە بیانکەنە موسڵمان و بیانخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە، نەیانتوانی. ئەمەش لە ئاکامدا شەڕوشۆڕێکی خوێناویی بەدوودا هات، چونکە یەزیدییەکان، کە خەڵکێکی جەنگاوەر و کۆچەرن، هەمیشە توانای ئەوەیان هەیە دوژمنەکانی خۆیان تەفروتوونا بکەن، ڕاوەدوویان بنێن و شپرزەیان بکەن، پاشانیش بۆخۆیان لە شوێنیکی دیکەدا سەرهەڵبدەنەوە». « M.Texir لە شاری ئەرزەڕۆمدا ئەفسانەیەکی سەرنج ڕاکێشی یەزیدییەکانی تۆمار کردبوو، ئەم ئەفسانەیە زۆر بە جوانی ئەم کۆنە ڕقەی یەزیدییەکان لەهەمبەر دوژمنەکانیان روون دەکاتەوە».

نووسەر لە وەسپکردنی دەوروبەری شاری ئەرزەڕۆمدا، واتە ئەو شوێنانەی کە یەزیدییەکان تێدا دەژین لە لاپەڕە ۱۹۲دا دەڵێ:

«لەم ناوەدا کەلاوەیەک هەیە بەناوی قەڵای موورگۆ، خەڵک دەڵێن کە ئەم موورگۆیە سەرکردەیەکی یەزیدی ئاگرپەرست بووە، وەختی خۆی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکە چیاییەکانی لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە و ڕووبەڕووی سوڵتان مورادی عوسمانی بۆتەوە، سوڵتان موردایش لەوەدەمەدا چووبوو بەغدا داگیر بکات. لەشکری موورگۆ، دوای ئەوەی دەگاتە ناوچەیەک بەناوی دەربەند کە لەشکری تورکە موسڵمانەکان خۆیان لەوێدا حەشاردابوو، دەبێتە جەنگێکی بێئامان. یەزیدییەکان لەوێدا لە سەر چیاکانەوە بەرد بەسەر تورکە موسڵمانەکاندا گلۆر دەکەنەوە و هەموویان تەفروتوونا دەکەن».

«موورگۆ، جەنگاوەرێکی هەتا بڵێی قۆز بوو، بەرێکپوشی و بە جلوبەرگی چنراوی جوانەوە نەبوایە هەرگیز بەرێدا نەدەڕۆیی، هەمیشە کلاوێکی بە مرواری چن، درەوشاوەی لەسەر دەنا، کۆمەڵێک چەکی لە خۆی دەبەست، ئەو هەموو چەکە، مەگەر تەنێ ئەو بۆخۆی بیتوانیبا هەڵیان بگرێ».

نووسەر هەر لەسەر باس وخواسی موورگۆ و رق و کینەی موورگۆ لەهەمبەر تورکەکان دەڕوا، پاشان کە بەرەو باشووری شاری ئەرزەڕۆم لێژ دەبێتەوە دەگاتە گوندێکی کوردنشین بەناوی Daar، دەڵێ:

لە ماوەی وەرزی زستاندا لەدەست ڕەنووە بەفری چیاکان ڕادەکەن و ئەو پێدەشت و قەدپاڵە شاخە جوانەیان جێدەهێڵن کە بەهاران عادەتیانە بنەو بارگەی خۆیان، لەگەڵ مێگەلەکانیان تێدا رابخەن. ل: ۲۹٤».

ئینجا لە وەسپکردنی کوردەکاندا دەڵێ:

« کوردەکان وەک یەزیدییەکان گەلێکی ڕەوەند و سوارچاک و جەڵەبدارن، بە تاڵانکردنی خەڵک و لە هەمان کاتدا بە بەروبوومی مەڕ و ماڵاتەکانیان دەژین، لە بەشی ڕۆژئاوای وڵاتی فارس، بەشێوەیەکی بنچینەیی لە کوردستان، هەروەها لە ڕۆژهەڵات و باشووری تورکیای ئاسیادا دەژین، هەروەها لە سووریا و ئەرمینیاشدا. کوردەکان خۆیان وا تێدەگەن کە بە بنەچە لە مەنگۆڵە داگیرکەر و ئۆزبەکەکانەوە کەوتوونەتەوە، بەڵام ئەو کوردانە، بەرزیی باڵایان، جوانیی چاوەکانیان، چەماوەیی لووتیان، سپیاتیی پێستیان، هەروەها چوارشانەیی قەدوباڵایان، ئەوە بە درۆ دەخاتەوە کە بەڕەگەز بگەڕێنەوە سەر تەتەرەکان. بنەچەی کوردان زیاتر لە پارثەکانەوە Parthe نزیکە، ئەو پارثانەی کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا بە سەرتاپای مەڵبەندەکانی سوریا و میزوپۆتامیادا بڵاوببوونەوە». کوردەکان سوارچاکی یەکجار لێهاتوون، کە سواری ئەسپ دەبن هەمیشە چەک بە شانی خۆیانەوە دەکەن، جەنگاوەرەکانی ساپۆر Sapor کە تیر و کەوان لە خۆ دەبەستن، مرۆڤی تا بڵێی بە جەرگ و جەسوورن، هۆز هۆز، بە کۆچەری دەژین، تارادەیەک سەربەخۆن، لەکاتی کۆچکردن و ڕەشماڵ گواستنەوەدا باج و خەراج زۆرکەم دەدەنە دەوڵەت. لە ناو کوردەکاندا، ئەوانەی کوردستانی تورکیا Kurdistan turc. بەشێوەیەکی سەقامگیر و نیشتەجێ دەژین، بەناو گوایە سەر بە والیی بەغدان، بەڵام ڕاستییەکەی چەند یاسایەکی تایبەتی خۆیان هەیە و لەژێر سەرپەرشتی سەرکردەی تایبەتی خۆیاندا بەڕێوەدەچن. کوردەکانی دەوروبەری دیمەشق و حەلەب و مووسڵیش، هەروەها ئەوانەی وڵاتانی فارس بەشێوەی هۆز هۆز، لەناو ڕەشماڵاندا بە کۆچەری دەژین. - ل ٢٩٤».

«دەتوانین بڵێین کە هەموو هۆزە کوردەکان هەمان داب و نەریت و ئاکاریان هەیە، سەر بە مەزهەبی عومەرن، جلوبەرگیان کەم جیاوازی لەگەڵ جلوبەرگی تورکەکاندا هەیە، هێندە نەبێ کە جلوبەرگی کوردان کەمێک سووکترە، کوردەکان زۆربەی جاران لە جیاتی جبە، پاڵتۆی لە تووکی بزن دروستکراو لەبەردەکەن. کڵاوێکی درێژی ئەستووری لە خوری دروستکراوی سوور لەسەردەکەن کە بە شاڵێکی ئاوریشمین وەرپێچراوە: بە پارچە قوماشێکی پڕ ڕەنگ دەدرەوشێتەوە». «کوردەکان تا بڵێی ئازا و جەسوورن، زۆر حەز لە تاڵانکاری دەکەن، بەڵام لە هەمان کاتدا هەتا بڵێی بەخشندە و میواندۆستن، زۆر لەسەر بەڵێن و گفتی خۆیان ڕژدن».

«ئەم میللەتە، کە بە تەواوەتی لە دەرەوەی بازنەی یاساکانی ئەو ڕژێمانەدان کە ئاسیا بەڕێوە دەبەن، لە ناو خۆیاندا ژیانێکی ئازاد و سەربەخۆیان بۆ خۆیان پێکهێناوە. ئەم میللەتە جەنگاوەرە، کە بەڕاستی خوێنێکی شکۆمەندانە لەناو دەمارەکانیدا دەگەڕێ، پێویستی تەنیا بەوە هەیە کە سەرکردەیەکی ئازادیخواز و یاسادان بۆ خۆی پەیدا بکات: بۆ ئەوەی بتوانێ کە ڕژێمە کۆن و کەودەنەکانی تورکیا و فارس سەرەونگوون بکاتەوە، هەروەها بۆ ئەوەی (لەوانەشە) بتوانێ بە یارمەتیی شارستانیەتی ڕۆژئاوا، دەسەڵاتدارییەکی گەنجانە و بەهێز لە ناوچەکەدا دابمەزرێنی. - ل ٢٢٩٥».

**سەرچاوە:**

Alfred JACOBS. Voyqges en Asie et en Afrique; Furne Librairie; paris. 1853; p: 289-296:

# هینری بیندەر

## لە کوردستاندا (١٨٨٧)

گەڕیدەی کوردناسی فەڕەنسی، هینری بیندەر Henry BINDER یەکێکە لە یەکەمین ئەو گەڕاڵە فەڕەنسییانەی کە سەرجەم سەفەرنامەیەکی خۆی تەرخان کردبێت بە میللەتی کورد و ناونیشانی کوردستانی Kurdistan لەسەر بەرگی کتێبەکەی خۆیدا بەکارهێنابێت.[١]

هینری بیندەر، وەک خۆی لە پێشەکیی سەفەرنامەکەیدا دەڵێت کە لە ناوەڕاستی ساڵانی هەشتای سەدەی ڕابردوودا بەڕێگای ئەستەمبۆڵەوە گەیشتۆتە دیاربەکر، پاشان هاتۆتە مووسڵ و تا کرمەشان و بەغداش ڕۆیشتووە. زۆربەی شارە کوردییە گەورەکانی هەر چوار پارچەکەی کوردستان گەڕاوە. پاشان، کاتێ گەڕاوەتەوە پاریس، بیرەوەری و تێبینییەکانی خۆی لە سەفەرنامەیەکدا بە ناونیشانی (لە کوردستاندا Au Kurdistan) لەساڵی ١٨٨٧ لە دەزگای Quantin لە پاریس چاپ کردووە.[٢]

هینری بیندەر یەکێکە لە یەکەمین ئەو گەڕاڵە ئەورووپاییانەی کە بۆ یەکەمین جار کامێرای وێنەگرتنی فۆتۆگرافی لەگەڵە خۆی هێناوەتە کوردستان و چەندین وێنەی دیمەنەکانی کوردستان و خەڵکی کوردی بەم کامێرا فۆتۆگرافییە گرتووە، بەڵام لە هەمان کاتدا کتێبەکەی پڕە لە تەختیت و گراڤوور و نیگاری دەستی و ئاوی. زۆرترین وێنە و نیگار و تەختیت لەم کتێبەی هینری بیندەردا هەن.

ناوبراو، ئەرکیۆلۆگ و شوێنەوارناسێکی شارەزا بووە، لەلایەن دەزگایەکی دەوڵەتیی فەڕەنساوە، وێڕای شاندێکی زانستی، بە حەز و هەڵبژاردن و بڕیاری خۆی هاتۆتە کوردستان. لە گەلێک شوێنی نێو سەفەرنامەکەیدا بەراوردی کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و ئێرانی دەکات. بایەخێکی زۆریشی داوەتە شیکردنەوەی سایکۆلۆژیای گەلی کورد و داب و نەریتەکانی. گەشتبێتە هەر گوند و شارێکیش، بەوپەڕی وردبینی و فراوانییەوە باسی ئەو شارەی یان ئەو گوندەی کردووە.

هـ. بیندەر، کە خۆشەویستییەکی زۆر لەهەمبەر خەڵکی کورد دەردەبڕێت، وای بۆ دەچێت کە گەلی کورد تا ئێستا نەیتوانیوە سوود لە خاک و سامانە سروشتییەکانی وڵاتی خۆی وەربگرێت.

ئەم سەفەرنامەیەی بیندەر لەڕووی شوێنەوارناسی و بیناسازی و ئەتنۆگرافی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتیشەوە، کە دیدگای ئەورووپاییەک پیشان دەدات لەبارەی گەلی کورد، بایەخێکی گرنگی هەیە.

لە بەشێکی کتێبەکەدا، بەناونیشانی (لە چۆڵەمێرگەوە بۆ ئامێدی)، باسی ئەم بابەتانە دەکات:

دۆڵ و گوندی چۆڵەمێرگ- بەخشیشی فەڕەنسی و بەخشیشی تورکی- دیمانەی فەرماندار- جلوبەرگی کوردی- گەڕان بەناو گوندەکەدا- کاروان و هاوسەفەرەکانمان- پەڕینەوە لە پردێک- کێڵگە و کشتوکاڵ لە کوێستانەکاندا- گوندی کوردان- پاشماوە هونەرییەکان- گەیشتنە زابی گەورە- دارستانی بەڕوو- گەزۆ- دۆڵی، باغەکانی.

لەم بەشەدا بەم شێوەیە باسی (چۆڵەمێرگ) دەکات:

چۆڵەمێرگ کەوتۆتە خوار دۆڵێکی داخراوی زۆر گەورە. ئاوانەکانی، بە چوار زێی بچووک، لە شاخەکانەوە بەخوڕ دێنە خوارەوە و لەناو گوندەکەدا دوو ڕووبار پێکدەهێنن. ئەم دوو ڕووبارەش لە خوار دۆڵەکەدا پێک دەگەن و لە دەربەندێکی زۆر تەسکەوە بۆی دەردەچێت.

پاشـان، بەم شـێـوەیە باسی ئەفـسـەرە تورکـەکـانی چۆڵەمێرگ دەکات:

ئەفسەرەکان بۆ وەرگرتنی بەخشیشی خۆیان هاتوون. بەخشـیـشـێکی باشـیـان دەدەمێ. ئەمـانە هەرگـیـز بەوە ڕانەهاتوون ڕەفـتـاری وا پیـاوانەیان لەگـەڵ بکرێت. چونکە ئەم تورکانەی کە بەسەفەر لەگەڵت دێن، چەندی بیری لێ بکەیتەوە قرچۆک و پوولەکێن؛ جگە لە قامچی هیچ بەخشیشێک نادەنە ئەم شەیتانە بێچارانە.

بەهەمـان شـێـوە، هینری بیندەر جـەخـتی لەسـەر دەستپیسیی قوماندارە تورکەکان دەکاتەوە:

لە جوتیـارێکی کـورد، دەستەجلێکی نوێ کە بۆ جەژن دروستی کردبـو، دەکرم. نیـازم وایە لە بەغـداوە بـینێرم بۆ فـەرەنسـا. بەڵام بەداخـەوە لەلایەن کـارمـەندانی گومرگی تورکەوە دەدزرێت!

لەگەڵ دەستەجلەکەدا «گەنجینەیەک» و سنووقێکی پڕ لە کـەللەسـەر، کـە دوای جەربەزەییـیـەکی ترسناک، لە گۆڕستانێکی کوردییەوە دەرم هێنابوون و ناردبوومن بۆ (مۆزەخانەی ئەتنۆگرافیی پاریس)، لەناوچوون.

هینری بیندەر لەو یادداشـتـانەیدا کـە لە ڕۆژی ٧ی تشـرینی یەکـەمـدا نووسـیـویەتی، ئاوها باسی (دهۆک) دەکات:

دهۆک گـوندێکە، نزیکەی شـەست مـاڵ، بایەخێکی مـامناوەندیی هەیە. فـەرمـانڕەوای گوندەکە شازادەیەکە، بیست فەرماندەی لەژێر دەستدایە. خانووەکەی، بریتییە لە حـەسـارێکی کـۆنی وێرانە، بەڵام ئێـسـتـا خـەریکی دروستکردنی خانوویەکی تازەیە.


No. 26. Ms. or. oct. 1171, Bl. 43a

دەسنووسی خورشید و خاوەر
سەدەی هەژدەم

خەڵک لە سەربانەکانیـان بە دار و چروو کەپرۆکەیان دروست کـردووە و تێـیـدا دەژین. بەرامـبـەر کـۆشکە وێرانەکـەی خـان قـاوەخـانەیەکی بچکۆڵەی تورکی، کەپرەشرێکی بۆ موشتەرییەکانی خۆی دروست کردووە. لای چەپ گــردێکی پڕ لە کــەند و شــێــوی تێــدا هەڵکەوتووە کـە ڕێگایەکی بەناودا درێژ دەبێـتـەوە. لافـاوی بەردەوامی ڕووبار، ئەوە بەڕەوا نیـشـان دەدات

که لەبەر چی ڕێگایان بردۆتەوە سەر گردێکی پڕ هەوراز و نشێو: چونکە لافاوی ناگاتێ.

هینری بیندەر، لەبارەی چالاکی و ڕۆڵی ئابێ مەسیحییەکان لە شاری مووسڵدا دەڵێ: بنکە دینییەکان ڕۆژ بەڕۆژ فراوانتر دەبن، ساڵ بەساڵیش ژمارەی ئەوانەی پەیوەندی بە مەزهەبی ئەوانەوە دەکەن، زۆرتر دەبن. ئابێکان هەرگیز داوا لە موسڵمانەکان ناکەن بچنە سەر دینی ئەوان.

سەردانی خوێندنگە و چاپخانەکەیان دەکەین کە زۆر بەجوانی دامەزراوە. لە چاپخانەکەی خۆیاندا، کتێبی دینی بە زمانی ئەرمەنی و ئیسترانقیلی و کلدانی و سوریانی و عەرەبی چاپ دەکەن. فەرمانبەر و کرێکارەکانی چاپخانە ئەو گەنجانەن کە لەبەردەستی باوکە ڕۆحانییەکان پەروەردە بوونە.

ئەو کەلەکانەی لە دیاربەکرەوە دێن، لە بەردەم دەروازەی ئەم بەشەی شاردا لەنگەر دەگرن. جەنابی پ. دی ڤال، بەڕێوەبەری کۆمەڵەی ڕۆحانییەکان (موژدەگارەکان)، کە سێ ساڵ زیاترە لە مێزوپۆتامیادا دەژی، دێتەوە بیری: ئەویش هەر لێرە لە کەلەک دابەزیوە.

هینری بیندەر لەبارەی کۆشک و تەلارەکانی خورسابادی نزیک مووسڵ، بەم شێوەیە باسی ئەم شوێنەوارە مێژووییەی کوردستان دەکات:

لە هەر کۆشکێکدا حەوشەیەکی گەورە هەبووە کە کۆڕی پێشوازیی شکۆمەندی تێدا ئەنجام دراوە. لەم حەوشەیەدا کەمتر بەرد بەکارهاتووە. وا پێ دەچێ لەکاتی ڕێ و ڕەسمی گەورەدا سەری حەوشەکەیان بە پەردەی بێ ڕادە بەرین داپۆشیبێ، بۆیە دەکرێ وا دابنرێ کە لەسەر پشتی ئەو ئاژەڵە برۆنزییانەی لە حەوشە درێژەکە دامەزراون، ئەڵقەی گەورەیان هەڵواسیوە تا کندر و زنجیریان پێوەکەن.

ئەم کانەی بە بینای نیشتمانی گەورە دانراون و مێژووی ئیمپراتۆریان لەسەر هەڵکەندوون، بە بەرد ڕووداوە پڕ لە شانازییەکانیان ڕازاندۆتەوە. کەسێ کە دەچووە نێو کۆشک، بەم شێوەیە بەدرێژایی مێژوو میللەتی لەنێو بابەتە نووسراوەکاندا بەزیندوویی دەدیت. پاشانیش بەردەوام کاری گەورەی پیاوچاکانی خۆی و سوپاس و پێزانینی خوداکانی لەبەر چاوبوو.

دەرگا گەورەکەی هاتنە ژووری کۆشک کولانجێک لەلای ڕۆژهەڵاتەوە ڕووبەڕووی زێ هەڵکەوتووە و گایە گەورەکان کە ڕووداوەکانی ڕۆژگاری (سەنحاریب)یان لەسەر هەڵکەنراوە و دروستکردنی ئەم بینایە گەورەیە بە هی ئەو دەزانرێ، لەوێ دانرابوون. سەنحاریب کوڕی ئەو پاشایە بووە کە خورسابادی دروست کردووە. نووسراوەکانی پشت سەری گایەکانی بەشی خوارووی ڕۆژئاوای نەمرود و نووسراوە ناجرییەکان و پاشماوەکانی دیکەی ئەو وێرانانە و کاولگەکانی خورساباد، وایان ناو بردووە.

پاشای خورساباد پێش ئەوەی خزمایەتی لەگەڵ پاشای نەینەوا دروست بێ، سارگۆنی پێ دەگوترا. ڕالینسون بانگاشەی ئەوە دەکات کە ئەم پاشایە ناوی سالمانازار بووە و جووەکان بەم ناوەوە باشتریان ناسیوە. وا دێتە بەرچاو کە نووسراوەکانی خورساباد ناسنامەی سالمانازار و سارگۆن دیار دەکەن. لە کاتی داگیرکردنی عەرەبەکانەوە، کاولگەکانی خورساباد بە ناوی گردی سارگون ناسراون. لە حەوزێکدا بۆ یەکەمین جار لەساڵی ١٦٠٢ خەتی بزماری لەلایەن پیترو دەللا ڤالی و پاشان بەهۆی شاردان ناسرا. تا ساڵی ١٨٠٠ ئەم خەتە نەخوێنرابۆوە. هاگیر لە ساڵی ١٨٠١دا پێی خۆش بوو چەند پیتێک لەم خەتە دیار بکا کە لە بنەڕەتدا لایەنی وێنەیی و ئەندیشەییان هەبوو. باوەڕی خۆی لەسەر ئەم پیتانە بنیات دەنا کە لە پیتی خەتی هیروگلۆفی میسری دەچن. لە ساڵی ١٨٠٢دا گیروتیفند گریمانەی ڕاستەقینەی ئەلف و بێی پەیداکرد، پاشان نووسراوەکانی بێستوون لەلایەن ڕالینسونەوە

دۆزرانەوە و بەسێ زمان نووسرابوون.

دوو جۆرە ئەلف و بێی بزماری بەتەواوی لێک جودا، هەیە. ئەلف و بێی ئاشووری کە تێکەڵەیە لە پیتی دەنگدار و پیتی وێنەیی (ئەمە هەمان ئەو خەتەیە کە لە نەینەوا و خورساباد و نەمرود و بابل هەیە)و ئەلف و بێی ئێرانیی دۆزراوە لە تەختی جەمشید کە پیتەکانی لە رەگەزی وەک خەتی یەکەم پێکهاتوون، بەڵام پەیوەندی پێیانەوە نییە. ئەلف و بێی ئاشووریش دەکرێ بکرێتە دوو بەش: بابلی کۆن و بابلی هەخامەنشی یان ئاشووری.

ئەلف و بێی کۆن لەسەر ئەو ئاجر و لوولە و تابلۆیانەی لە کاولگەکانی بابل و دەوروبەریدا وەدەست کەوتوون، دەبینرێ. بابلی هەخامەنشی لە نووسراوە سێ زمانییەکانی تەختی جەمشید و بیستووندا هەیە.

خەتی بزماریی بابلی لە هەموو جۆرە خەتە بزمارییەکان ئاڵۆزترە. وا دێتە بەرچاو ئەوانەی بەکاریان هێناوە هەوڵیان داوە شێوە سادەکانی پیتی ئاشووری ئاڵۆزتر بکەن. وەختێ پیتەکانی ئەلف و بێی ئاشووری لەگەڵ پیتەکانی بابلی بەراورد بکەین، هەر لەسەرەتاوە دەبینرێ کە جوداییان بەزۆری لە ئەنجامی شێوازی پێکهاتنی رەگەزێکە کە گۆشەی پیتەکە پێکدێنێ.

هینری بیندەر، ئەم جارە لەبارەی بایەخی ئەرکیۆلۆژیی کوردستان و مەڵبەندی (نەمروود) قسە دەکات و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئینگلیزەکان چۆن شوێنەوارە دێرین و نەتەوەییەکانی کوردیان دزیوە و وێران کردووە:

وا پێ دەچێ بەردە نەخشکراوە جۆراوجۆرەکانی نەمروود بە ئەنقەست شکاون. ئەم کارە دڕندانەیە لەلایەن گەلانی نا شارستانی و بێ رۆشنبیری ئەنجام نەدراون، بەڵکو خودی ئینگلیزەکان بوون لەکاتی پشکنیندا ئەم کارەیان کردووە. لەبەر ئەوەی نەیانتوانیوە تەواوی ئەو شتانە لەگەڵ خۆیان ببەن کە دەریان هێناون. وایان پێ باش بووە شتە سەرنجڕاکێشەکان بشکێنن، نەک کەسانی دیکە



ئورفە، سەدەی هەژدەم

سوودیان لێ ببینن.[٣] ئینگلیز سەری لە کاری هونەری دەرناچێ و نرخی نازانێ. ئەگەر مەبەستیەتی مۆزەخانەکانی پێ پڕبکاتەوە، تەنیا لە رووی چاولێکەری و مەغروورییەوەیە.

رێگامان بۆ هەمان لا درێژە پێ دەدەین و دەگەینە قۆرتێکی وەک قۆرتەکەی پێشوو کە دەبێ ئەویش لە کەناری سەکۆ گەورەکە بێ. دیسان پاشماوەیەکی دیکەی پلیکانەکە. ئێستا لە قوژبنێکی خوارووی رۆژئاواین کە کۆشکی (ئیسارهادون)ی لێ دروست کراوە. ئاگر وای وێران کردووە زەحمەتە بتوانرێ بنچینەکەی بدۆزرێتەوە و بەو هۆیەوەش نەخشەکەی دیار بکرێ. کۆشکی ئیسارهادون لە کۆشکی ئەوەکەی کە لە خوارووی رۆژهەڵات دروست کراوە و هێشتاش کاولگەکانی باش دەرنەکەوتوون، نزمتر بووە. ئەم دوو کۆشکە بەهۆی پلیکانێکی گەورەتر کە دەبێ دەرگای سەرەکی سەکۆ گشتییەکە بووبێ، لێک جودابوونەتەوە.

لەلای باکوور، پاشماوەی هیچ دیوار و شوورەیەک نابینرێ. بیناکان لەم رووەوە دەبێ بێ بەرگری بووبن. لەنێو پاشماوەکانی دیوار و شوورەی ئەمروودا هێشتا شوێنی پەنجا بورج لەلای باکوور و ئەوەندەش لەلای رۆژهەڵات هەیە، بەڵام زۆر باش دیارنین. لای خواری شوورەکە نەماوە. بەڵام ئاستی حەوشەکە زۆر بەرزە. دوور نییە پێشان ئەم بەشە کەوتبێتە سەر ئاوی دیجلەوە و جۆگەیەکی گەورەی پڕ لە ئاو وەک خەتێکی بەرگری بەکار هێنرابێ.

دەگەڕێینەوە گردە سەرەکییەکەی گۆڕستانی سارداناپال. کاتێ لەو پەرستگا گچکەیەی کەوتۆتە خوارووی لای رۆژهەڵاتی، خەریکی گەڕان بووین، رشتنی خلۆ بەردێکی ئاشکرا کرد کە لە دیدی منەدا زۆر سەرنجڕاکیشە. حەفتا سانتیمەتر درێژ و پەنجا سانتیمەتر پانە. لەسەر ئەم بەردەدا کوشتارگایەکی (مذبح) سێ پایە هەڵکەنراوە و لە سەرەوەیدا نیشانەی خودایی دیارە. لە هەر دوو لای کوشتارگا، دوو کەس (بێگومان پیاوی ئایینین) ماسییەکیان بەدەستەوەیە و لەژێرەوە چوار یان پێنج دێڕ بە خەتی بزماری هەلکەنراوە. بەردەکە جگە لە نەخشکارییە دیارەکان، نزیکەی هەشت سانتیمەتر ئەستوورە. بەردەکە جوان و نەخشەکان زۆر پاکن. بە وەرگێڕانی ئەم بەردە دەبینین ئەو دیویشی هەڵکەنراوە. دێڕی یەکەم لە چەند هێمایەکی هێلکەیی پێکهاتووە کە لە ناویدا چەند پیتێک روویەکی جادوییان هەبوو قووڵتریش هەڵکەنراون. لەژێرەوەی، چەند کەسایەتییەک دیار دەخا و دە دوازدە دێڕی نووسراوەکە کە لە پیتەکانی ئەو دیوی بەردەکە زۆر باریکترن، لەژێرەوەی هەڵکەنراون. ماوەی سەعاتێک خەریکی پاککردنەوەی ئەم بەردەین. کوێخای گوند هەوەڵ جار دەیویست رێگای بردنی ئەم بەردەمان لێ بگرێ، بەڵام چەند دیارییەک بەزوویی ناراحەتیی ویژدانی نەهێشت و گوتی تا ئەو وەختەی دەست لە وشەی موحەممەد نەدەن، یارمەتیتان دەدەم. هەڵگرتن و گواستنەوەی دژوار بوو. دەبوایە بەزەحمەت دارەبازەیەک دروست بکەین و بیخەینە سەری و دەکەس تا نزیکی کەلەک رایکێشن. ئیستا ئەم بەردە لە موزەخانەیەک دەبینین، لە دەوڵەتی تورکیا و نیاز خراپی و ریاکاریی کاربەدەستانی دەوڵەتی بەغدا بەدوورین.

### سەرچاوەو پەراوێز

١- من لەساڵی ١٩٩١-١٩٩٢دا پوختەیەکی ئەم کتێبەی هینری بیندەرم لە فەرەنسییەوە کردە کوردی و هەناردم بۆ انتشارات صلاح الدین ایوبی بۆ بڵاوکردنەوە بەزنجیرە لە گۆڤاری (سروە)، بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستاش بڵاونەکرایەوە. پوختەی سەفەرنامەکە بە ناونیشانی (هێلانەی هەڵۆیان) وەرگێڕابووە سەر کوردی.

2- Henry BINDER: Au Kurdistan, En Mesopotamie et en perse, ed. Maison Quantim, 7, Rue Saint- Benoit, Paris:1887.

٣- مسیو De Rivoyere لە سەفەرەکەی خۆیدا بۆ بابل هێمای بۆ هەمان ئەو کارە دڕندانەیە کردووە و دەڵێ: کاتێ لە حلە (بابل) لە ئەنجامی پشکنینێدا چەند بەردێکی زۆر گران دۆزرانەوە، لەبەر ئەوەی ئەم نەخشە گەورانە بەزەحمەت بۆ لەندەن دەگوازرانەوە، دەزانی چی رووی‌دا؟ کارێکی زۆر سادە! رەقیبەکانی ئێمە! لەترسی ئەوەی نەبادا کەسێکی تر بێت کە لەوان وەستا ترە، کاری ئەوان جێ بەجێ بکا، بێ هیچ نیگەرانییەک بە چەکوش شکاندنیانن. بەم شێوەیە جان پول (واتە ئینگلیزی) ئەگەر شتێکی نەبێ، نابێ خەڵکی دیکەش هەیبێ.

# کریستیان مۆڕ: جموجۆڵی کورد لە ئاوارەییدا

## بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد

## لە ئەورووپا و ئەمەریکا و ئوسترالیادا

کتێبی (کوردەکان، ئەمڕۆ Les Kurdes Aujourd hui) نووسراوی کریستیان مۆڕ Christiane MORE،کە ژنە ڕۆژنامەنووسێکی فەرەنسییە، بە یەکێک لە چاترین و گرنگترین کتێب دەژمێردرێت کە لە ماوەی ئەم بیست ساڵەی دواییەدا بە زمانی فەرەنسی لە بارەی کێشەی کورد بڵاوکراونەتەوە. کتێبی ناوبراو، لە (310) لاپەڕەدا، لە دەزگای Harmattan، لە ساڵی 1984، لە چاپێکی جواندا، کە (8) نەخشەی جوگرافی و روونکارەشی لەگەڵدایە، وێڕای ئەندێکس و بیبلۆگرافیایەکی تێروتەسەل لە بارەی کوردستان، بڵاوکراوەتەوە. پێشەکی کتێبەکە بە پێنووسی دۆستی کورد، کوردناسی فەرەنسی ناودار، مەکسیم رۆدنسۆن Rodinson Maxime نووسراوە.

کتێبی (کوردەکان، ئەمڕۆ) دابەشکراوەتە سەر سێ دەروازەی بنەڕەتی. دەروازەی یەکەم بریتییە لە سێ بەشی ئاسایی کە لەوانەیە لە هەر کتێبێکی فەرەنسی لە بارەی کورد بڵاوکراوبێتەوە بەدی بکرێت. بەشەکان ئەمانەن: خاک و گەلی کورد، کورتەیەکی مێژوویی لە بارەی مێژووی دێرین و هاوچەرخی کوردستان، بزووتنەوە نەتەوەییەکانی کورد لە سەدەی بیستەمدا لە ئێران و عێراق و تورکیا و سوریا. کریستیان مۆڕ لەم دەروازەیەی یەکەمدا هیچ شتێکی تازە ناخاتە سەر تێگەیشتنی ئەو فەرەنسییانەی کورد دەناسن، بەڵام بێگومان بۆ ئەو خوێنەرانەی هیچ لە بارەی کێشەی کوردەوە نازانن و ئاگاداری وڵاتی کورد نین، ئەم (105) لاپەڕەیەی دەروازەی یەکەمی کتێبەکە، شتێکی بەکەڵک و سوودمەندە. کریستیان مۆڕ لە دەروازەی یەکەمدا، بە دوورودرێژی باسی ئەم بابەتانە دە کات: جوگرافیای کوردستان، دابەشبوونی ئیداری، سامانە سروشتەکانی کوردستان، ژمارەی دانیشتووان، عەشیرەتە کوردەکان، دینی کوردان زمانیان، ئەدەبیات، هونەریان، مێژووی نەتەوەیی و بزووتنەوە سیاسییەکانی کورد... هتد.

ڕەسەنایەتی و تازەیی کتێبەکەی کریستیان مۆڕ MORE لە دەروازەی دووەمییەوە، لە لاپەڕە (110) بەملاوە دەست پێدەکات کە ئەم ناونیشانەی خوارەوەی هەیە: (پارتە سیاسییە کوردەکان و خۆدامەزراندن و بڵاوبوونەوەیان لە وڵاتانی بێگانەدا).

نووسەر ئەم دەروازەیەی لە چوار بەشدا باس کردووە. لە هەر بەشێکدا باسی حزبە ساسیە کوردییەکانی وڵاتیک دەکات: عێراق، ئێران، تورکیا، سووریا. کورتەیەکی مێژوویی و گرنگ لە بارەی هەر یەکێک لەو حزبانە باس دەکات و پاشان دێتە سەر ڕەگ و ریشە و لق و چالاکییەکانی هەر یەکێک لەم حزبانە لە وڵاتانی ئەورووپا و ئەمەریکا و ئوستراليا و وڵاتانی دیکەدا، هەر لە ساڵانی 1940 بەملاوە تا دەگاتە ساڵانی 1980. ئەم لێکۆڵینەوەیەی کریستیان مۆڕ لە بارەی چالاکی و جموجۆڵی حزبە کوردییەکان لە ئاوارەییدا (ئەورووپا و ئەمەریکا) لێکۆڵینەوەیەکی تازە بابەتەو هیچ ڕۆژنامەنووس و کوردناسێکی ئەورووپی پێش کریستیان مۆڕ نەیکردووە. هەر ئەمەشە بایەخی سەرەکیی کتێبەکەی کریستیان مۆڕ. ئەو کارەی ئەم ژنە ڕۆژنامەنووسە فەرەنسییە بۆ کورد کردوویەتی، بریتییە لە ئەرشیفکردنی سەرتاپای چالاکی و جموجۆڵی حزبە کوردییەکان. ئەمەش کارێکە کە

تاکو ئێستا حزبە کوردییەکان خۆیان تەنانەت هەر یەکەو بۆ خۆشیان نەیانکردووە! لەم بارەیەوە، هەموو حزبێکی کوردیی عێراق، ئێران تورکیا، سووریا. قەرزارباری ئەم ژنە رۆژنامەنووسە فەرەنسییە دەبێت و لە کاتی نووسینەوەی مێژووی خۆیشی، ناچار، هەر دەبێت پەنا ببات بۆ ئەم کتێبە.

دەروازەی سێیەمی ئەم کتێبە، کە لاپەڕە (214) تاکو (249)ی داگیرکردووە، چەند لاپەڕەیەکی تازە و دانسقەی ئەوتۆن کە تاکو ئێستاش بێ هاوتا و بێ وێنەن لە بواری نووسینەوەی مێژووی کورددا. (ئەو رێکخراوانەی کە سەر بە هیچ دەوڵەتێک نین) ئەمەیە ناونیشانی دەروازەی سێیەمی ئەم کتێبە، کە لە چوار بەش پێکهاتووە:

١- رێکخراوی قوتابیان




لەم بەشەدا نووسەر، باسی جموجۆڵی رێکخراوی خوێندکارییە کوردییەکانی ئەورووپا و ئەمەریکا و ئوسترالیا دەکات: هەر لە کۆنەوە تاکو ساڵانی 1980، لەوانە:

S.O.K.S.E.), (T5EKOSER), (U.E.K.F)
(A.K.S.A),(K.S.S.E)) ... هتد.

نووسەر، هەرچی شتێکی پەیوەندیی بەم رێکخراوانەوە هەیە، وێڕای ئەرشیف و بڵاوکراوە و سەرجەم چالاکییەکانیان... دەیخاتە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەیەکی ورد و تێر و تەسەلەوە.

٢- رێکخراوی کرێکاران. لەم بەشەدا، نووسەر، جموجۆڵی کۆمەڵە و رێکخراوە کرێکارییە کوردەکانی ئەرووپا و ئەمەریکا و ئوسترالیا لە ماوەی ساڵانی 1970-1980 باس دەکات، لەوانە: (KOMKAR)، (KKWK)، (KKSK)، (KKKS)، (koc-kak)، هەروەها فیدراسیۆنی کۆمەڵەی کوردەکانی سوێد و چەندینی دیکە.

٣- یەکبوون، پارتیا ئازادییا پێشکەوتنا کوردستان

٤- ئەنستیتووی کوردی پاریس.

بەم شێوەیە، دەروازەی سێیەمی ئەم کتێبەی، ڕەسەنترین و تازەترین بەشی ئەم کتێبەیە، تەنانەت لە بواری لێکۆڵینەوەکانی کوردناسیشدا، بابەتێکی تابلێی نوێ و گرنگە. ئەمەش لەبەر ئەوەی هیچ کەسێک (نەبێگانە و نە کوردیش) مێژووی جالیەی کوردی لە ئەورووپا و ئاوارەییدا نەنووسیوەتەوە.

ئەم کتێبەی کریستیان مۆڕ تەنانەت بۆ ئەو نووسەر و مێژوونووسانەیش کە (مێژووی ئەدەبیاتی کوردی لە دوورەوڵاتیدا) دەنووسنەوە، بە سەرچاوەیەکی گرنگ و بنچینەیی دەژمێردرێت. نووسەر، بۆ سەلماندنی هەرچی بۆچوونێکی دەری دەبڕێت، چەندین سەرچاوەی بەکارهێناوە. جگە لەوەش، لە ماوەی کارکردنیدا بۆ نووسینی ئەم کتێبە، سەردانی زۆربەی سەرۆک حزب و سەرۆک کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی کردووە و چەندین هاوپەیڤینی لەگەڵ ئەندامانی باڵای ئەو حزب و ڕێکخراوانە کردووە و بەشێوەیەکی مەیدانی و ڕاستەوخۆ کاری لەسەر کتێبەکەی کردووە. هەروەها چەندین بەڵگەنامە و بەیاننامەشی لە شێوەی (14) پاشبەندەدا بڵاوکردۆتەوە. لە کۆتایی باسەکەشدا، لە لاپەڕە 286-291، پوختەیەکی کرۆنۆلۆژیای کوردستان و کێشەی کوردی، لە ساڵانی حەفتاوە تاکو 1984خستۆتە روو.کریستیان مۆڕ، ئەگەرچی لە سەرتاپای کتێبەکەیدا، لەپشت هەموو دێڕێکی خۆیدایە بەڵام هەوڵی داوە، بێ ئەوەی لایەنگیری هیچ حزب و ڕێکخراوێکی کوردی بکات، بەشێوەیەکی مەوزووعییانە و زانستییانە و تێروتەسەل، باس لە ڕاستی و ڕووداوەکان بکات. کاتێ لە خوێندنەوەی کتێبەکەی دەبیتەوە، هەست دەکەی چەندین شتی تازە فێر بوویتە، بێ ئەوەی زۆرت لێ بکەن هیچ یەکێک لەو حزب و ڕێکخراوانە پەسەند بکەیت. ڕەسەنایەتی و مەوزووعییەتی و تازەیی ئەم کتێبە، لە بارەی مێژووی هاوچەرخی کوردەوە، پێش هەموو کەسێک مەکسیم ڕۆدنسۆن M.RODINSON دەرکی پێ کردووە و لە پێشەکییەکەیدا وردبینانە مۆڕ، نووسەری ئەم کتێبە، دیپلۆمی لە قانوون وەرگرتووە لە زانکۆی نۆیڵ. لە 11ی ئازاری 1974داچاوی بە ژەنەراڵ بارزانی کەوت و ئاشنایەتی لەگەڵ کێشەی کورد پەیدا کرد. پاشان لە پەیمانگای ئینالکۆی پاریس INALCO چوو خۆی فێری زمانی کوردی کرد بۆ ئەوەی بتوانێ چەندین جار سەر لە کوردستان بدات و سەرکردە حزبیەکوردییەکان- لە هەر چوار پارچەکەدا- ببینێت و ئەم کتێبە گرنگە بنووسێت.

# بزووتنەوەی کورد لە تۆماری ئەرمەنییەکاندا

Bulletin Armenien

1919-1921

سەردەمی پاش جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨) بۆ هەمــوو گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە عــەرەب و فارس و ئەرمەن و تورک و کوردیشەوە، بە سەردەمێکی هەتا بڵێی گرنگ و مێژوویی لە قەڵەم دەدرێ. بەتایبەتی بۆ گــەلی کــوردی ژێر دەست، کــە وڵاتــەکەی، لەو ســەردەمــەدا بە قــۆناغــێکی هەژەند و ڕاچەنیــوی هەتا بڵــێی پڕ لە تراژیدیا وکــارەساتی جــۆراوجــۆر تێپــەڕ دەبوو، هەر لەو ســەردەمــەشدا بــوو، واتە لە دوای کــۆتایی هاتنی جــەنگی یەکەمی جیهانی، کوردستان سەرلەنوێ بە شێوەیەکی تازە دابەش کرایەوە، نەخشــەیەکی سیاسی جوگرافیی تازەی بەسەردا سەپێنرا.

گــەلانی تــورک، عــەرەب، ئەرمــەن، فــارس، لەو ســەردەمــەدا هەر یەکــەیان چ لە ناوەوە چ لە دەرەوەی وڵاتەکــەی خــۆیاندا (لە ئامــریکا، لە لەندەن، لە پاریس، لە ژنێڤ...) هەر یەکــەیان چەندین بولتــەن و تــۆمــار و بڵاوکــراوەی تایبــەتی نەتەوەیی خــۆیان هەبووە، هەمــوو دەنگ و باس و دۆکــیــومەنت و راســتــیــیــە مــێــژووییــیــەکــانیــان لەبارەی جموجۆڵی کولتووری و سیاسیی وڵاتەکەی خۆیان لەو تۆمارانەدا پاراستوون، کەچی گەلی کورد، بە پێچەوانەی ئەو میللەتانە، لە چەند ڕۆژنامەیەکی پەرپووت بەملاوە کە لەو سەردەمەدا تاک و تووک لەژێر سانسۆری ئەو دەوڵەتانەدا دەریان کــردوون- کــە ئەوانیش ئەمــڕۆ نوســخــەکانیــان زۆر بەدەگــمــەن دەست دەکــەون- هیچ تۆمــار و بڵاوکــراوەیەکی ســەربەخــۆی ئەوتۆی نەبووە کــە ئەمــڕۆ مــێــژوونووس و تــۆژەرەوەی کــورد بتــوانێ بۆ لێکــۆڵــینەوەی ژیانی کــولتــووری و سیاسیی ئەو سەردەمەی گەلی کورد پشتیان ببەستێ.[١]

یەکــێک لە ســەرچاوە گــرنــگ و بایەخــدارەکــان بۆ لێکــۆڵــینەوە لە بزووتنەوەی ســیــاســیــی کــورد، هەروەها بۆ ساغــکردنەوی ژیانی ڕۆشنبیــری و کــۆمەڵایەتیی گەلی کورد لەو ســەردەمەدا، تۆمــار و بولــتــەن و بڵاوکراوەی گــەلە دراوسێکانی کــوردن، بەتایبــەتی تۆمــار و بڵاوکــراوە ئەرمــەنی و تورکــیــیــەکــان، لەبەر ئەوەی ئەم دوو مــیللەتە لەو ســەردەمــەدا پەیوەندییــەکی سیــاسی و کــۆمــەڵایەتی و ڕۆشنبــیــریی ڕاستــەوخــۆیان بە مــیللەتی کورد هەبووە، لێرەوە، فــێــربوونی زمــانی ئەرمــەنی و وەرگــێــڕان لە زمــانی ئەرمــەنیــیــەوە، خزمــەتێکی گــەورە بە مــێــژووی نەتەوەکــەمــان دەگەیەنێت.[٢]

تۆمــاری ئەرمەنییــەکان Bulletin Armenien کە تۆمارێکی سیاسی- کۆمەڵایەتی ئەرمەنییەکان بووە و بە شێوەی گۆڤار، چەند جارێک لەماوەی ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٤ لە پاریس بە زمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە، بە یەکێک لەو سەرچاوە هەرە گرنگانە دەژمێردرێت، کە تۆژەری کورد بتوانێ زانیاری و بەڵگە و ڕاستــییــە مێژووییــیەکان لەبارەی ژیان و بزووتنەوەی گەلی کورد لەو سەردەمەدا هەڵبهێنجێنێ.

لاپەڕە درەوشاوەکانی ئەم تۆمــارە ئەرمــەنییــە Bulletin Armenien چەند تیــشکێکی تازە لە دیدێکی ئەرمــەنییــەوە، واتە لە گــۆشــەنیگایەکی تایبــەتی ئەرمــەنیــیــەوە دەخــەنە ســەر ژیانی تاریکی بزووتنەوەی سیــاسی و کــۆمــەڵایەتی و کولتووریی گەلی کورد لەو سەردەمەدا.

لێرەدا هەوڵ دەدەین بەشێک لەو دۆکیوومەنتە دانسقەیە لە زمانی فەرەنسییەوە وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی، بە هیوای ئەوەی سوودی خۆی بگەیەنێ.

پێویستە پەنجەنومای ئەوە بکەین، کە ئەرمەنییەکان لە هەمــوو دۆکــیــوومــەنت و ســەرچاوەکــانی ئەو ســەردەمــەیاندا، بە شــێــوەیەکی زۆر فــراوان، زۆر برینداران، ناوەڕۆکی کارەساتی قەتلوعامەکەی خۆیان بە دەستی کوردە بەکرێ گیراوەکانی سوڵتان عەبدولحەمید دووپات دەکەنەوە، بۆیە لێرەدا لەم وەرگێڕانەدا- خۆمان لە وەرگــێڕانی پەرەگــرافــەکانی ئەم مەسەلەیە بە دوور راگرتووە، هەوڵمان داوە زیاتر ئەو بەشە سوود بەخشانە وەربگرین کە لە شوێنی دیکەدا باس نەکراون.



ئەو کوردە جوولەکە عێراقییانەی
ڕەوانە کرانە ئیسرائیل

**تورکەکان لە ئەرمەنستاندا پلان دەنێنەوە**

بە پێی تازەترین هەواڵەکــان، کــە لە ســەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە پێــمــان گــەیشــتــوون، کــوردەکــان لەســەر داخوازیی سەرکردەکانی «تورکە لاوەکان» لەم ماوەیەدا لە ســــەر سنووری وڵاتی فـــارس و قـــەوقـــازدا لە جــــموجــــۆڵێکی زۆر گــەرم و بەتاودان بۆ چوونە ناو ئەرمەنستانەوە[٣]. ئامانجی ئەم کۆچکردنە ئەوەیە کە ژمــارەی کــوردەکــان لەســەر خــاکی ئەرمــەنســتــاندا ئامــانجێکی دیکەش ئەوەیە کــە زەحــمــەتی و ئەســتــەم بخرێتە بەردەم ئەو ئەرمــەنییــانەی کــە ئەمرۆ لە وڵاتی فــارس و قــەوقــازدا پەناهەندەن و دەیانەوێ بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان (...)

ئەم پلانە گڵاوە هەڵبەتا بە مشووری کۆمیتەی تورکە لاوەکانەوە بەڕێوە دەبرێت، کە لە ناوچەکانی باشووردا دەسەڵاتیان یەکجار زۆر دەڕوا (...)

دوو ســەرۆک عــەشــیــرەتی کــورد ســەرتۆپی ئەم جموجۆڵەن: (محەمەد سدقی ئاغا) و (سەید تەها) کە جڵەوی عەشیرەتەکانیان بە دەستەوە گرتووە و زۆریان لێدەکەن کە بچنە ئەرمەنستان، لەوێ بژین. عەشیرەتی جەلالییەکان، کە ژمارەیان (١٠٠٠) خێزانێکە و لە ناوچەکانی وڵاتی فارسەوە هاتوون، هەر لە ئێستاوە هاتوون لە هەندێ گوندە ئەرمەنییە چۆلکراوەکانی قەراغ شاری وان بنکە و بارگەی خۆیان هەڵخستووە.

عەشیرەتی عەرووسانلی، سەر بە ناوچەی ئالان لە وڵاتی فارس، کە لەژێر دەسەڵاتی خانی ماکۆ، بنەوبارگەی خۆیان هێناوەتە گوندەکانی ناوچەی ئارژاک و قەرەکۆنیس لە دەوروبەری شاری (وان) دا.

سمکۆ، سەرۆک عەشیرەتێکی ٣٠ماڵی، کە بەدرێژایی ماوەی (١٩١٤-١٩١٨) قەتلوعامی ئەرمەنی و نەستووریەکانی لە مەڵبەندی (دیلمان)دا بەڕێوە دەبرد، ماوەیەک بوو خۆی لە ناوچەی سەڵماسی وڵاتی فارس کشاندبۆوە، ئەمڕۆش خەریکە بە خۆی و بە (١٠٠) خێزانی عەشیرەتی گەراڵییەوە پێ دەنێتە خاکی ئەرمەنستانەوە و خۆی ڕێک دەخا کە بەرەو (وان) بەڕێ بکەوێ.[٤]

عەشیرەتێکی دیکەی کورد، عوسمان بەگ، کۆنە یاوەری (جەودەت) « ئەو پیاوەی بە هەزاران ئەرمەنی و نەستۆری لە شاری سەرای دا لە خوێن گەوزاند» ئەمڕۆ لەلایەن ڕژێمی تورکەکانەوە دەسەڵاتی دراوەتێ کە عەشیرەتەکەی لە شاری قۆنیاوە ڕاپێچتە ناوچەی (وان).

هەڵبەتا ڕژێمی ئەستەمبۆڵە کە ئەم پلانە بەڕێوە دەبا، هەموو ئامرازێکی جێبەجێ کردنی بۆ سەرۆک عەشیرەتە کوردەکان ناردووە تا پلانەکە لە وڵاتی ئەرمەنستاندا بە ساختە زۆرتر ببێت و لە هەمان کاتدا ڕێگا لەو سەدان هەزار ئەرمەنییە ئاوارانەی وڵاتی قەوقاز بگیرێ و نەتوانن بگەڕێنەوە زێدی خۆیان.

Bulletin Armenien N.1: 15 juillet 1919 P.4. paris

### ڕژێمی تورکیا یاسای بەرەوازانینی

### کۆچکردنی تورک و کوردەکان بەرەو ئەرمەنستان بڵاو دەکاتەوە

جموجۆڵی کۆچکردنی کورد و تورکەکان بەرەو ئەرمەنستان، بە شێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو بەردەوامە.

گەڕانەوەی ئەرمەنییە پەراگەندەکانی وڵاتی فارس و قەوقاز بەرەو زێدی خۆیان، لەلایەن هێزە چەکدارەکانی تورکیا کە وێڕا وێڕای سنووریان گرتووە، قەدەغە کراوە (...) لە لایەکی دیکەشەوە، ڕژێمی تورکیا لە پلان نانەوەی خۆی بەردەوامە بۆ کۆچ پێکردنی بە کۆمەڵی کوردەکانی ئازەربایجانی وڵاتی فارس و قەوقاز بۆ ئەوەی بێن زێدی چۆلکراوی ئەرمەنییەکان داگیر بکەن (...)

Bulletin Armenien N.1: 15 juillet 1919 P.4. paris

### کۆچکردنی کورد و تورکەکان

بە پێی ڕۆژنامەکانی ئەستەمبۆڵ، ڕەوکردنی کورد و تورک بەرەو وڵاتی ئەرمەنییان بە شێوەیەکی زۆر توند و تیژ هەر بەردەوامە، ئەو دووکەسەی کە بە شێوەیەکی سەرەکی ئەم کۆچ پێکردنە بەڕێوە دەبەن، بریتین لە دوو سەرۆک عەشیرەتی کورد: سدقی ئاغا و سەید تەها (...)[٥]

سمکۆ سەرۆک عەشیرەتێکی ٣٠٠ خێزانییە، کە پێشتر چەندین جار قەتڵوعامی ئەرمەنی و ئاسوورییەکانی کردبوو لە مەڵبەندی دیلمانلی Dilmanli دا ئێستا بە خۆی و بە عەشیرەتی گەردانلییەوە هاتوونەتە ئەرمەنستان و بەرەو وان دەچن (...)

هەموو ئەو کاروبارانە بەدەستی (جەودەت بەگ)، نوێنەری والیی شاری وان و حەیدەربەگی هاوڕێیەوە ئەنجام دەدرێن (...)

Bulletin Armenien N.6,30 sept.: 15 juillet 1919 P.3. paris

## کورتە هەواڵ

کۆمیتە کوردییەکە Le Comite Kurde ڕایگەیاندووە کە کوردەکان هیچ پەیوەندییەکیان بە هێزە ناسیوناڵیستەکانەوە نییە[٦]. ئەم ڕێکخراوە کوردییە دان بە مافە نەتەوەییەکانی گەلانی دیکە لە تورکیا ناهێنێ(...)

کوردەکان هیچ ئامانجێکی دیکەیان نییە جگە لەوەی ڕێز لە فەرمانەکانی ڕژێم بگرن تا ئەو ڕۆژەی کە ئیتر کۆنفرانسی ئاشتی بڕیارێک لە بارەی مەسەلەکەیانەوە دەدات(...)

Bulletin Armenien N.9 juillet 1919 P.8. paris



ΣΟΥΛΤΑΝ ΑΒΔΟΥΛ ΧΑΜΙΤ ΧΑΝ Ο Β

NOTRE BIEN AIME SOUVERAIN

SULTAN ABDOUL HAMID HAN II

## کورتە هەواڵ

دەنگوباس لە دەوروبەری شارەکانی کوردستانەوە گەیشتۆتە ڕژێمی تورکیا: ڕژێمیان ئاگادار کردۆتەوە کە کوردەکان ئێستا خەریکن خۆیان پڕ چەک دەکەن و زۆر توند و تیژانە بە جۆش کەوتوون. ئەم هەڵسوکەوتەی کوردەکان دەسەڵاتدارانی تورکی خستۆتە مەترسییەوە.

Bulletin Armenien N.14: 30 Janv 1920 P.8. paris

## کێشەی نێوان ئەرمەن و کورد

ئەو نامەیەی کە ژەنەراڵ شەریف پاشا لە ڕۆژنامەی Le matin لە ڕۆژی ٨ی مارس دا بڵاوی کردۆتەوە، هەروەها ئەو وتارەی کە لە ڕۆژنامەی Temps لە ڕۆژی ١٠ی مارسدا بڵاوی کردۆتەوە[٧]، هەردووکیان بەسەهووچوونێکی لەلایەن نووسەرەوە تێدایە کە ئێمە بە ئەرکی خۆمانی دەزانین لێرەدا نەشتەر قەڵەمێکیان بکەین.

ژەنەراڵ نووسیویەتی کە لە دوای شەڕ ڕاوەستان لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی « وڵاتی کوردان بەتەواوەی بۆتە نێچیرێک. هەم ڕێکخەرە سیاسییە ئەرمەنییەکان و هەم هەندێک لە هێزە هاوپەیمانەکان مرخی خۆیان لێی خۆش کردووە...».

ئەم گـازاندەیە هیچ بنەمـایەکی راسـتی نیـیـە ، ئەو وەفـدە ئەرمـەنیـیـەی لە کـۆنفـرانسـی ئاشـتـیـدا بە ناوی گـەلی ئەرمەنەوە بەشداری کردبوو. لە یاداشتـامـەکەی خۆیدا داوای هیـچ زەوی و زارێکی ئەوتۆی نەکردبوو کـە سەر بە « کوردستان» بێت.(٨)

ئەرمەنییەکان هەرگیز ڕێگەیان بە خۆیان نەداوە بڵێن «کوردستان تەنیا زاراوەیەکی جوگرافیی تازە دروست کراوە» بەڵکو هەمیشە دانیان بەوەدا ناوە کە نیشتمانێکی کورد بە راستی لە تەنیشت ئەرمینیا بوونی هەیە، ئەو نیشتمانە چەندین سـەدەیە نەتەوەیەکی لەسەر دەژی کە وەکو ئێمـەی ئەرمەن لە رەگـەزی ئارین و ئێمـەش هەست دەکـەین ئەو نەتەوەیە زیاتر لە ئێمەوە نزیکن وەک لە تورک، بەڵام هێندە هەیە کە بەشێکی ئەو نیشتمانەیان- خۆ هەر بە دەستی ئەرمەنییەکانی چاخە کۆنەکانیش ئاوەدان کراوەوتەوە- ئەمڕۆ بە زۆری بە ئیسلام کراوە و بە کورد کراوە.

ئەو نیشـتـمانەی کوردەکان، هەر لە سەردەمی ئێگزێنۆفۆنەوە کە بە کوردستـان و ئەرمینیـادا تێپـەڕ ببوو، بەداخەوە نەیتوانیوە پێ بەپێی شارستانیەت بڕوات، هەمیشەش لەسەر داب و نەریتە کێوییە سەرەتاییەکانی خۆی ماوەتەوە. ئەرمـەنییـەکان، بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم، چەندین هەوڵ و کۆششـیـان نواندووە بۆ بڵاوکردنەوەی خـوێندەواری و ڕووناکبیری لە کوردستـاندا، هەوڵـیـان داوە کە هەستی نەتەوایەتیی کوردەکـان بە جۆش بـهـێنن و تامی کولتـوور و ڕۆشنبیری لە سەر زمانیان شیرینتر بکەن. بەڵام هەموو ئەو کۆششانەی ئێمە، بەداخەوە، بە فیڕۆ چووە، چونکە دام و دەزگای ڕژێمی تورک هەمیشە کۆسپ و تەگەرەی خستۆتە نێوانمان و هەمیشە ویستوویەتی کوردەکان سەرچیغ ببات و لەناو زەلکاوی کلتۆلیی ڕۆشنبیری و ئابووریدا بیانـهێلێتەوە، ئەمەش بە تایبەتی لەژێر فەرمانڕەوایەتی سوڵتان عەبدولحەمیددا کە چووە ژێر کلێشەی کوردەکانەوە و دژی ئەرمەنییەکان بە گەڕی خستن (...)

(...) وەفدی ئێمە لە وەڵامدانەوەی یانەی نەتەوەیی کوردەکـاندا Kurde Club Nationalلە ئەستـەمبـۆڵ(٩) رازی بوونی خۆی پیـشـان داوە بۆ ئیمزا کردنی ڕێکەوتننامەیەک لەگەڵ شەریف پاشا لەپێناو بەجێگەیاندنی داخوازییە ڕەواکانی گەلی کورد: بۆ ئەوەی گەلی کورد بتوانێت بە ئازادییەوە لەسەر خاکی نیشتمانەکەی خۆیدا خۆی پێکەوە بنێت. ئەمە شتێکی سەیرە کە شەریف پاشا هاتووە ئەرمەنییەکانی تاوانبار کردووە بەوەی گوایە بوونی گەلی کورد و نیشتمانی کوردیان پێشێل کردووە (...)(١٠)

(...) ئەگـەر ئەنجـوومـەنی کـۆنفـرانس بڕیار بدات، وەک ئەوەی ژەنەراڵ شـەریف پاشـا بیـری لێدەکـاتەوە، کـە کوردستـان دابەش بکرێتە سەر دوو زۆن و هەر زۆنێک لەژێر ئینتدایی هێزی هاوپەیمانێکدا بێت، لەو کاتەدا نابێ ئەم کارە بە زیانی ئەرمەنییەکان بشکێتەوە (...)

(...) هاو ئاینی بوونی کـورد و تورکـەکـان بە هیچ شێـوەیەک ڕەوایی ناداتە ئەوەی کـە شـەریف پاشـا ئۆتۆنـۆمی کـوردەکـان لەژێر سـەرپەرشـتی تورکیـادا بە باشـتـر بزانێ، چونکە ئاشکرایە جـۆرە ئۆتۆنۆمیـیـەکی لەم بابەتە لە «تەڵەیەک» زیاتر هیـچیتر نابێ، عـەرەبەکـان، ئەڵمانییـەکان، خەباتیـان کرد بۆ سەربەخۆیی سیاسییـان، واتە بۆ جیابوونەوەی تەواوی خۆیان لە دەست ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

مـەسەلەی ئاینی پەیوەندییـەکی یەکـجار زۆر کەمی بە سـەربەخـۆیی نـەتەوەیی و ئازادییـەوە هەیە. خـەباتی گـەلی ئەرمەن خەباتێکی ئایینی نییـە. بەڵکو تاقە ئامانجێکی ئەوەیە کە ئێمەی گەلی ئەرمەن بە سەربەخۆیی نەتەوەیی خۆمـان بگەین. لە سۆنگەی هەمـان شتـدا، دوای ئەوەی پیـرۆزبایییـمـان لە سـەربەخـۆیی گـەلی موسلمـانەکـانی وەکو ئەلبـانییـەکان و عەرەبەکان کرد، بە هەمـان شێوە و بە دڵگەرمییەوە بە تەنگ بانگەوازی کوردەکـانیشـەوە چووین بۆ ئەوەی هاوکارییان بکەین ئەوانیش سەربەخۆیی خۆیان وەدەست بێنن (...)

ئێمە وا هەست دەکەین ئەم دوو وتارەی شەریف پاشا ، تەعبیر لە بیروباوەڕی ئەو نیشتمانپەروەرە کوردانە ناکات کە لە ئەستەمبۆڵ « یانەی نەتەوەیی کوردیان» لە پێناو وەدەستهێنانی سەربەخۆیی کوردستان دامەزراندووە. هەر لەبەر هەمان هۆش، ئەم نیشتمان پەروەرە کوردانەی «یانەی نەتەوەیی کورد» ڕێگایەکی دابڕیان گرتۆتە بەر و هەر تەنیا ماوەیەکی کەم لەمەوبەر ڕەفزی ئەوەیان کردبۆوە کە لە هەڵبژاردنەکانی (ئینتخاباتی) پەرلەمانی تورکیدا بەشداری بکەن[١١] ئێمە هیوادارین گەلی کورد لە ڕێگای خەباتی جیابوونەوە و ئازادیخوزانەی خۆیدا هەر جەسوور و بەردەوام بێت.

Bulletin Armenien N.18 - 19-20, 30 Avril 1920 P.4. paris

## درکاندنی چەند نهێنییەک لەلایەن سکرتێرێکی تایبەتییەوە

## لە رۆژنامەی ڤەرجینە لوور Vertchine Lour ئەرمەنییەوە وەرگێردراوە، رۆژی ١٩٢٠/٢/٢٧

لە نامەیەکدا کە لە رۆژنامەی Alemderدا بلاوکراوەتەوە، غالیب بەگ، سکرتێری تایبەتی شەریف پاشا روونی دەکاتەوە کە چۆن شەریف پاشا هاتۆتە سەر ئەوەی بچێت داخوازیی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بکات بۆ ئەوەی بەم داخوازییە تەگەرە بخاتە بەردەم داخوازییەکانی ئەرمەنییەکان، هەروەها چۆن بەمەبەستی ئەوەی کە هەنجەتی نەتوانینی خۆبەرێوەبردنی کوردەکان پووچەڵ بکاتەوە و بتوانێ لە کۆنفرانسی ئاشتیدا لە هەمان ئاستی ئەرمەنییەکاندا خۆی بنوێنێ، توانیویەتی قەناعەت بە بۆگۆس پاشا Boghos pacha بهێنێت و ئیمزای رێککەوتننامەیەکی پێ بکات.

ئەم کارەی شەریف پاشا، بێگومان، بە سەرکەوتنێکی دیپلۆماسی لە قەڵەم دەدرێ (...).

غالیب بەگ، دوای ئەوەی دەڵێ کە ئەم دەسپێشخەرییە نیشتمانپەروەرییەی شەریف پاشا لەبەردەم کۆنفرانسی ئاشتیدا بە ئاشکرا روونی کردەوە کە ئەو زەوی و زارانەی ئەرمەنییەکان داوایان کردبوو، بە هیچ شێوەیەک سەر بە ولاتی ئەرمەن نین، بەڵکو سەر بە کوردستانن؟ هەروەها شەریف پاشا چەندین نامەی ناردووە بۆ جەمعیەتی تەعالیی کورد Union Teali Kurd، بۆ سەرەک عەشیرەتە کوردەکان: پێی راگەیاندوون کە ئەو هەر لە ئێستاوە ئامانجە سیاسییەکانی دەرەوەی ولاتی کە پێی سپێردرابوون جێبەجێ کردوون، ئیدی ئێستاش- بە بیروڕای ئەو- سەرفرازیی گەلی کورد لەوەدایە کە لەگەڵ تورکیا بین بە یەک. کوردستان پێویستە ئۆتۆنۆمییەکی ئیداری وەدەست بهێنێ، بەڵام لە رووی سیاسییەوە هەمیشە سەر بە تورکیا بێت.

غالیب بەگ- خۆی ئەم نامەیەی گەیاندۆتە (جەمعیەتی تەعالیی کورد» لە ئەستەمبووڵ، ئێستاش چاوەڕێی وەڵامیان دەکات. دەڵێن گوایە ئەگەر پێشنیارەکانی شەریف پاشا پەسەند نەکرێن، ئەوا شەریف پاشا ئیستقالە دەدات و چیتر رازی نابێ ببێتە نوێنەری وەفدی کوردان لە کۆنفرانسی ئاشتیدا لە پاریس.

Bulletin Armenien

30 Mors, 15-30 Avril 1920,p.4

## بیروڕای چەند کوردێک

بەڕێز ئەکرەم جەمیل پاشا Djemil Pachazade Ekrem Beg، یەکێک لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی جەمعیەتی تەعالیی کورد Teali Dlemietiکە یەکێکە لە رێکخراوە کوردییە هەرە بە هێزەکان، ئەم راگەیاندنەی خوارەوەی لە رۆژی ١٩٢٠/٢/١٨ داوەتە رۆژنامەی (جاگادامارد- Djagadamard):

- بەشی هەرە زۆری گەلی کورد، بە ورەیەکی زۆر بەرزەوە، داخوازیی جیابوونەوە و سەربەخۆیی دەکەن. تورکەکان پەیتا پەیتا چەندین تەلەگرامی ناو خۆییان بۆ ویلایەتە کوردییەکان شاندووە، بەڵام ئەو تەلەگرامانە هیچ نرخێکیان بۆ دانەنراوە، چونکە تەلەگرامی درۆزنانەن. ئایا تورکەکانی سەر بە حیزبی میللی Milli رایان نەگەیاندبوو کە ئەرمەنییەکانیش هەر، بێ پشت و پەنا لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا، چوونەتە پاڵ کوردەکانەوە؟!

ئەم جۆرە بانگێشەیە، درۆ و دەلەسەی تورکەکانن، جیهانی دەرەوە باش ئاگاداری ئەو زەبروزەنگە وەحشیگەرانەیەی تورکەکانین کە دەرهەق بە گەلی ئەرمەن و یۆنانی دەینوێن. خۆ کوردیش هەر لەم زەبروزەنگ و چەوسانەوەیە بێبەش نەبووە.

ئێمەش وەکو ئەرمەنییەکان ڕاگوێزراوینەتەوە، قەتلوعام کراوین. زیانەکانی ئێمە گەیشتوونەتە سەدان هەزار. بەو زیانانەی لە ماوەی جەنگیشدا لێمان کەوتوون، سەرجەمیان دەگەنە ملیۆنێک. سەبەبکاری ئەم قەسابخانەیەش هەمووی مستەفا کەمالە، سەرۆک بزووتنەوەی ناسیونالیزمی تورک.

تەلعەت پاشا و ئەنوەر پاشا قوڕیان بۆ ئەرمەنییەکان گرتەوە، بۆ یۆنانی و ئاسورییەکان، جەمال پاشا بۆ عەرەبەکان، مستەفا کەمالیش بۆ ئێمەی کورد.

شەریف پاشا لە سەرەتادا نوێنەری «جەمعیەتی تەعالیی کورد» بوو، واتە مەندووبی گرنگترین ڕێکخراوی سیاسی کوردەکان. پاشان ئەم مەندووب بوونەی شەریف پاشا، سەرلەنوێ لەلایەن حیزبی ناسیونالیستی کورد Parti Nationl Kurde کە لەم دواییەدا سازکراوە دووپات کرایەوە. ئێمە دەتوانین بڵێین کە پەیامەکەی شەریف پاشا سەدایەکی بەرزی دایەوە و لە کۆنگرەی نەتەوەیی کورداندا، کە پێش دوو مانگ لە شاری ماردیندا سازکرابوو، بە هەڵوێستێکی جوامێرانە لە قەڵەم درا.

کۆنگرێسی نەتەوەیی کورد Congres Nationl Kurde ئەو کۆنگرەیەی لە شاری ماردیندا بەتەواوی دەنگ هاوڕایی خۆیان بۆ شەریف پاشا دەربڕی و متمانەی خۆیان بە شەریف پاشا دووپات کردەوە.

لێرەدا بۆ ئەوەی بۆتانی بسەلمێنم کە ئێمە مافی ئازادی و سەربەخۆیی خۆمان هەیە، پێتانی رادەگەیەنم کە تورک بە هیچ شێوەیەک کوردیان لە خشتە نەبردووە. کوردستان– خۆی، بە خواستی خۆی، خۆی بە تورکیا گرێ داوەتەوە.

کوردەکان سەبارەت بە سوننی بوونیان بە هانای سوڵتان سەلیمی عوسمانی کەوتن و یارمەتییان دا بۆئەوەی سەرکەوتنی بەغدا وەدەست بهێنێ. ئیدریسی بەتلیس، یەکێک لە کوردە بە توانا و دەسەڵاتدارەکانی ئەو سەردەمە، کاتێ لە بەغدا گەڕایەوە، بە سوڵتان سەلیمی ڕاگەیاند کە کوردەکان دەیانەوێ لەگەڵ تورکیا ببن بە یەک. ئیدی بەسترانەوەی کوردستان بە تورکیاوە هیچ گیروگرفتێکی نەهاتە سەر ڕێ.

ڕۆحی کورد پڕە لە ڕق و کینە دەرهەق بە زەبروزەنگی تورکەکان. ئەم ڕق و کینەیەش زۆر بە ئاشکرا لە گۆرانییە فۆلکلۆری و نەتەوەییەکانماندا ڕەنگیان داوەتەوە و نیشانەی جەنگەکانی نێوان تورک و کوردن. ئەم گۆرانییانە گاڵتە بە ترسنۆکیی تورکەکان دەکەن، ئەوە نیشان دەدەن کە تورک لە ڕاوەڕووت و زەبروزەنگ و تاڵانکردنی ماڵی خەڵک زیاتر حەز لە هیچ شتێکی دیکە ناکەن. گۆرانییە هاوچەرخەکانیشمان، بەدکارییەکانی رژێمی ئەمڕۆی تورکیا پیشان دەدەن، دەسەڵاتخوازیی والییەکان، دزی و حیزی و پۆخلەواتەکانیان، بە زۆر سەپاندنی باج و سەرانەکانیان...

زمانی تورکی بەقەد زمانی چینی عەنتیکە و سەمەرەیە بۆ خەڵکی ڕەشۆکی کورد، جوتیارە کوردەکان بە هیچ شێوەیەک تورکی نازانن، بەتەنیا کوردی ناو شارەکان تورکی دەزانن.

***

دوای ئەو دەمەقاڵێیانەی کە لە پەرلەمانی تورکیدا کراون، سیناتۆری کورد عەبدولقادر ئەفەندی، ئەم ڕاگەیاندنەی خوارەوەی دابووە چەند ڕۆژنامەنووسێک:

«ئەرمەنییەکان لە کۆنفرانسی ئاشتیدا داوای هەر شەش ویلایەتەکەی ڕۆژهەڵاتیان کردبوو. ئێمەی کوردیش بە

هەمان شێوە ڕوومان لە کۆنفرانسی ئاشتی نا بۆ ئەوەی ڕوونی بکەینەوە کە ئێمەی کوردیش، لەبەر ئەوەی بەشی زۆری دانیشتوانی ئەو ویلایەتانە پێکدەهێنین، داوا دەکەین وەفدێکی تایبەت بنێردرێتە ئەو ویلایەتانە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەیەکی سەرجەمگیر لەبارەی ڕێژەی دانیشتوانی کورد و ئەرمەن ساز بدرێت.

(بۆگۆس نووبار پاشا) ڕازی بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو وەفدە بنێردرێتە ئەو ویلایەتانە، هەروەها گفتی ئەوەی دا کە چیتر پڕوپاگاندە دژی نەتەوەی کورد نەکات».

«لە بارەی شەریف پاشاشەوە، بێگومان ئاشکرایە کە ئەو نوێنەری جەمعیەتی تەعالیی کوردانە. ئەم جەمعیەتەش بۆ ئێمە نوێنەری هەستی نیشتمانیمانە. کەواتە، شەریف پاشا بە تەواوەتی مافی ئەوەی هەیە کە لەوێ وەک نوێنەری گەلی کورد ڕەفتار بکات». «ئێمە داوای ئۆتۆنۆمی هەر ئەو پێنج ویلایەتەمان کردووە کە لە ڕۆژهەڵاتی تورکیادا کوردیان تێدا دەژی. ئێمە خۆمان بە دەروەست دەزانین لە ئاست ئەوەی کە وڵاتەکەمان بەرەو پێشەوە ببەین و هەنگاو بەرەو شارستانیەت هەڵبهێنین، ئەمەش بە هێز و توانای شەخسییەتە هەرە کارامە و بەهرەمەندەکانی نەتەوەکەمان. بێگومان تورکەکانیش دەتوانن بەشداری لە کاروبارەکانی دەسەڵاتداریێتی Gouvermentبکەن. بەڵام ئێمە ئەگەر بێین پشت بە لاوازیی خۆمان ببەستین و خۆمان بدەینە پاڵ ئەرمەنییەکان لە دژی تورک، ئەوا ئەم هەڵوێستە دەبێتە شێوە خیانەتکارییەکی بێ مانا و پڕووپووچ».

Bulletin Armenien

30 Mors, 15-30 Avril 1920,p.4-5.

### پەراوێزەکانی وەرگێر:

١- بەشێک لەو تۆمار و بڵاوکراوانە، وەکو (تێگەیشتنی ڕاستی) (١٩١٨) (پێشکەوتن) (١٩٢٠-١٩٢١)... هتد سەر بە دام و دەزگای ئینگلیزەکان بوونە، واتە دیاردە و ڕووداوەکانیان لە گۆشەنیگای ئایدیۆلۆژیەت و بەپێی بەرژەوەندی سیاسی خۆیان هەڵسەنگاندووە. بڵاوکراوە و ڕۆژنامەکانی زمانی حاڵی شۆڕشی شێخ مەحموودیش، وەکو (امید اسقلال) (بانگی کوردستان)، نەیانتوانیوە لە سنووری سلێمانی بچنە دەرەوە و (کوردستانی دەرەوەی سلێمانی) بخەنە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەنووسییانەوە.

٢- ئەرمەنییەکان یەکێکن لەو گەلە دراوسێیانەی، کە سەبارەت بە نزیکایەتییان لە ئێمە، لە عەرەبەکان زیاتر باسی ژیان و مێژووی نەتەوەیی ئێمەیان کردووە. کەچی بەداخەوە، ئەم سەرچاوەیە تاکو ئێستا فەرامۆش کراوە.

٣- لە تێکستەکەدا وشەی ئەرمینیا Armenie بە کار هاتووە، کە ئەرمەنستانی تورکیا دەگرێتەوە.

٤- نەستۆرییەکان Nestoriens. مەبەستی لە ناوچەی سەڵماس لەوانەیە (شەڵماش) بێت لە کوردستانی ئێراندا.

٥- لە ژمارە (٢)ی تۆمارەکەدا هیچ شتێک لەبارەی کورد بڵاو نەکراوەتەوە. لە ژمارە (٣) دا لە لاپەڕە (٢)، وتارێک باسی چاوپێکەوتنی کورد و تەتەرەکان دەکات لە کۆماری ئەرمینیادا، کە بە سەرپەرشتی دام و دەزگای تورکەکان ئەنجام دراوە. لە ژمارە (٤) و (٥)یشدا شتێکی ئەوتۆ لە بارەی کورد بەدی ناکرێ.

٦- گەلی کورد لەساڵی ١٩١٩ دا زیاتر لە سێ کۆمیتەی هەبووە، بەداخەوە لێرەدا پیشان نەدراوە کە باس لە کام لە کۆمیتەی کوردی دەکات! بەڵام لە گەڵ ئەوەش، لەوانەیە ئەم کۆمیتەیە (جەمعیەتی تەعالی) بێت کە سەرۆکەکەی (جەمیل پاشازادەی ئەکرەم بەگ/ Djemil Pachazade Ekrem bey) بووە چونکە بە پێی هەمان سەرچاوە، ژمارە (٢٠/١٩/١٨) ٣٠ مارس - ٣٠ ئەڤریل ١٩٢٠ لاپەڕە (٤).

٧- ڕۆژنامەی Le Matin و Temps دوو ڕۆژنامەی فەرەنسین کە لە سەرەتای ساڵانی بیستەکاندا بە زمانی فەرەنسی بڵاو دەکرانەوە. ژەنەراڵ شەریف پاشای کورد، بەردەوام لەم دوو ڕۆژنامەیدا وتاری لەپێناو بەنێودەوڵەتی کردنی کێشەی کورد هەروەها لەبارەی مافە

نەتەوەییبیەکانی گەلی کورد و پێویستبوونی سەربەخۆیی کوردستان بڵاو کردۆتەوە.

ئەم وتارە جۆراوجۆرانەی ژەنەراڵ شەریف پاشا کە بە زمانی فەرەنسی لەبارەی سەربەخۆیی کوردستان لەنێوان ساڵانی ۱۹۱۹-۱۹۲۵ دا لە گۆڤار و رۆژنامە فەرەنسییەکاندا بڵاو کراونەتەوە، بایەخێکی تا بڵێی گرنگیان بۆ لێکۆڵینەوە مێژوویی و سیاسییەکان لەبارەی بزووتنەوەی ناسیونالیستی کورد لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا هەیە. ئێمە ئەم دوو وتارە ناوبراوە و چەند وتارێکی دیکەشمان کردوونەتە کودی و لە داهاتوودا پێشچاو خوێنەرانی دەدەین. شایانی باسە، ئەم تۆمارە ئەرمەنییەی بەردەست، رەخنە لە بۆچوونە سیاسییەکانی دوو لەم وتارانەی شەریف پاشا دەگرێ.

۸- ئەم پەراوێزەی خوارەوە هی سەرچاوەی ئەسڵییە ئەرمەنییەکەیە. دەڵێ (هەمووماں دەزانین کە سەرۆک وەفدی کوردان، شەریف پاشا، هەروەها وەفدی ئەرمەنییەکانیش، پێکەوە هەر یەکە و یاداشتنامەیەکی خۆیان پێشکەش بە کۆنفرانسی ئاشتی کردبوو لە پاریس. بڵاوبوونەوی ئەم یاداشتنامەیەی شەریف پاشا هەرایەکی بێ ئەندازەی خستە ناو رۆژنامە تورکییەکانەوە. ئەو رۆژنامە تورکییانە شەریف پاشا بەکابرایەکی «هیچ» لە قەڵەم دەدەن و دەڵێن کەئەو بە هیچ شێوەیەک نوێنەری نەتەوەی کورد نییە. هەروەها گوایە شەریف پاشا ئەو یاداشتنامەیەی لەسەر داخوازی ئەرمەنەکان پێشکەش کردووە. بۆ ئەوەی لە هەمان کاتدا بیێتە هاندەر و داخوازییەکانی ئەرمەنییەکانیش دانیان پێدابنرێت. رۆژنامە تورکییەکان دەڵێن کە گوایە نەتەوەی کورد بە شێوەیەکی ئۆفیسپال رایگەیاندووە کە ئاگای لە ئیمزاکردنی ئەو یاداشتنامییە نییە و شەریف پاش تەنیا لەپێناو بەرژەوەندییەکانی خۆی ئەم کارەی کردووە. بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ببێتە سەرۆک دەوڵەتی کوردان). بڕوانە هەمان بوڵتەنی ئەرمەنی ژمارە (۱۸/۱۹ ۲۰) لاپەڕە (۳) رۆژی ۱۹۲۰/٤/۳۰.

۹- Club National Kurde کە وەرگێڕانە کوردییەکەی دەقاودەق دەکاتە (یانەی نەتەوەیی کورد) لەساڵی ۱۹۱۹-۱۹۲۰ دا لە ئەستەمبۆڵ هەبووە. لە کۆتایی ئەم دۆکیوومەنتەدا کەسێکی دیکەش باسی ئەم یانە کوردییەی کردووە، بڕوانە پەراوێزی (۱۱) کامەیە و ناوەڕۆک و ئەندامەکانیان چۆن و کێ بوونە!

۱۰- لێرە بەملاوە لە سێ پەرەگرافی درێژدا رەخنە لە بیروباوەڕەکانی شەریف پاشا دەگرێ کە لە رۆژنامەی Le Temos, Matin دا بڵاوی کردوونەتەوە لەبارەی مەسەلەی دیاری کردنی سنووری جوگرافی- سیاسی بۆ ئەو دوو دەوڵەتەی لە داهاتوودا بۆ گەلی ئەرمەن و کورد دروست دەکرێ. دەڵێ: هیچ مەڵبەندێک لە جیهاندا بەقەد مەڵبەندەکانی وان و بەتلیس ئەرمەنی نین».

۱۱- دیاری نەکراوە سەرۆک و ئەندامەکانی ئەم یانەیە کێ بوونە. بێگومان دەستەی نووسەرانی ئەم بۆڵتەنە ئەرمەنییە ویستوویانە کە وا نیشانی رای گشتی فەرەنسی بدەن کە گوایە ناکۆکی و ناتەبایی لەنێوان رای گشتی خەڵکی کورد و شەریف پاشا دا هەبووە. هەروەها گوایە رووناکبیرە کوردەکانی ئەندامەکانی (یانەی نەتەوەیی کورد) دژی بیروباوەڕ و هەڵوێستەکانی شەریف پاشا بوونە لە پاریس

۱۲-سەرچاوەی تێکڕای بەشەکانی ئەم دۆکیوومەنتە، ئەمەیە:

Bulletin Armenien, N.1(Juill, 1919 M25( Juillet 1920) paris.

# خاتوو جۆیس بلۆ و ئەدەبیاتی کوردی

# بە زمانی فەرەنسی

یەکێک لە گرنگترین ئەو کتێبانەی تاکو ئێستا بە زمانی فەرەنسی لەبارەی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی نووسرابێت، بریتییە لە کێتبەکەی خاتوو جۆیس بلۆ Joyce Blau بەناونیشانی یادی کوردستان Memoire du Kurdistin، کە لە دەزگای Findakly لە شاری پاریس لە ساڵی ١٩٨٤دا، لە ٢٢٤ لاپەڕەدا چاپ کراوە.

خاتوو جۆیس بلۆ، کە لە ساڵانی پەنجاکاندا لەسەر دەستی دکتۆر کامەران بەدرخان فێری زمانی کوردی بووە، ئەمڕۆ ئوستادی زمان و ئەدەبیاتی کوردییە لە (پەیمانگەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان)، کە سەر بە زانکۆی سۆربۆنە، لە پاریس. خاوەن چەندین وتار و کتێب و نووسراوی دیکەیە لەبارەی کوردستان و ئەدەبی کوردی.

ئەم کتێبە، بە پێشەکییەکی بەهاداری کوردناسی گەورەی فەرەنسی، مەکسیم ڕۆدنسۆن M.Rodinson دەست پێدەکات و دەڵێت کە کورد بەختی ئەوەی نەبووە، ئەدەبەکەیان بناسرێت.

بەشی یەکەمی ئەم کتێبە، لاپەڕە ١٩ تا ١٠٤، تەرخان کراوە بۆ ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی: پەندی پێشینان، حەکایەت، شیعر، شیوەن، گۆرانی، لاوک، بەیت و بالۆرە، هەروەها ئەدەبیاتی میللیی حەکایەتبێژە ناودارەکان. جۆیس بلۆ، لەم بەشەدا، یەکە یەکەی ئەم ڕەگەزە ئەدەبییە فۆلکلۆرییانەی شی کردۆتەوە و خاسیەتە کوردییەکانی دەستنیشان کردوون، لە هەمان کاتدا بۆ هەر ڕەگەزێک چەند نموونەیەکی تەرجەمەکراوی بۆ فەرەنسی هێناوەتەوە. بەشی هەرە زۆری نموونەکان لە مەڵبەندەکانی کوردستانی تورکیاوە وەرگیراون.

بەشی دووەمی کتێبەکە، لاپەڕە ١٠٥ تاکو ٢٢٤، دابەش کراوەتە سەر دوو قۆناغ، قۆناغی یەکەم: ئەدەبیاتی کلاسیک، قۆناخی دووەم: ئەدەبیاتی هاوچەرخ.

لە قۆناخە کلاسیکەکەدا تەنیا باسی شیعری کردووە، هیچ قسەیەک لەسەر مەولودنامە و تێکستە دینییەکان و چیرۆکەکان نەکراوە کە لەماوەی سەدەی نۆزدەهەم دا نووسراون. ئەمە عەیبی هەرە دیاری کتێبەکەی جۆیس بلۆیە. ناوبراو بەکورتی باسی ژیانی ئەم شاعیرانەی خوارەوەی کردووە: مەلای جەزیری، «عەلی تەرمووکی»، ئەحمەدی خانی، ئەحمەد بەگی کۆماسی، حاجی قادری کۆیی، شێخ رەزای تاڵەبانی. لەگەڵ باسکردنی هەریەکێکیش لەم شاعیرانە و چەند نموونەیەک لە شیعرەکانی پێشکەش کردوون.

نووسەر لەم قۆناخەدا کەوتۆتە دوو هەڵەوە، یەکەم: پشتی بە هەڵەیەکی د. کامەران بەدرخان بەستووە و لە خۆیەوە شاعیرێکی بەناوی «عەلی تەرمووکی» بۆ کورد دروست کردووە! ئەم «عەلی تەرمووکییە» بوونی راستەقینەی نیە، بەڵکو بریتییە لە (عەلی تەرەماخی) کە خاوەن کتێبی ڕێزمانی عەرەبییە بە زمانی کوردی، کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا بە دەسخەتی مەلا مەحموودی بایەزیدی نووسراوەتەوە. هەڵەی دووەمیشی ئەوەیە کە خاتوو جۆیس «قوتابخانەیەکی» گرنگی لە مێژووی شیعری کوردیدا فەرامۆش کردووە بە فەرەنسییەکانی بناسێنێت کە بریتیە لە قوتابخانەی شیعری بابان (نالی و سالم و کوردی).

لە قۆناخی دووەمدا، زیرەکانە، چەند چیرۆکنووس و شاعیرێکی لە هەموو ئەم وڵاتانەوە هەڵبژاردووە کە کوردیان تێدا دەژی: تورکیا، سووریا، لبنان، یەریڤانی یەکێتی سۆڤیەت، ئێران، عێراق. ئەو نووسەرانەی کە جۆیس بلۆ لەم قۆناخەدا لەسەری نووسیوون و نموونەی بەرهەمی پێشان داون: جگەرخوێن و عوسمان سەبری، ڕەشید کورد، عەرەب

شەمۆ، جاسمی جەلیل، پیرەمێرد، دڵدار، گۆران، حوسێن عارف، ئیبراهیم ئەحمەد، هەژار، حەسەن قزڵجی، هێمن.

کەم و کورتیی ئەم بەشە لەوەدایە کە باسی ئەم بابەتانەی ئەدەبی نوێی کوردی نەکردووە: شانۆنامە، ڕۆمان، ڕۆژنامەنووسی. خەڵکی فەرەنسای وا تێگەیاندووە کە کورد تەنیا شیعرو چیرۆکی هەیە، هەروەها قۆناخەکانی سەرەتا و سەرهەڵدان و نەشونمای ئەدەبی کوردیی بەهیچ شێوەیەک ڕوون نەکردۆتەوە، یەکسەر کەوتۆتە سەر پیشاندان و لێکۆڵینەوەی نووسەر و تێکستەکانیان.

شایانی باسە، گەلێک لە نووسەرانی غەیری دانەری کتێبەکە هاوکارییان کردووە، لە تەرجەمەکردنی تێکستەکان لە کوردییەوە بۆ فەرەنسی، لەوانە: جەلادەت و کامەران بەدرخان، ڕۆژە لسکۆ، تۆمابوا، کەندالْ نەزان، هەروەها قوتابییەکانی خۆیشی.

کتێبی ناوبراو، ئەگەرچی بەسەرچاوەیەکی ڕەسەن و گرنگ دەژمێردرێت لە بواری ناساندنی ئەدەبی کوردی بە خەڵکی فەرەنسا؛ لەهەمان کاتدا پێویستی بە پێداچوونەوە و ڕاست کردنەوەیەکی زۆر هەیە لە کاتی بڵاوکردنەوەی چاپی دووهەمیدا؛ بەهیوای سەرکەوتنی بەردەوام بۆ خاتوو جۆیس بلۆ و هاوکارەکانی.

# کریس کۆچێرا

## پاشەکشێ، یان جەسارەت؟

رۆژنامـەنووسی ناوداری فـەڕەنسی، کـریس کـۆچێـرا Chris Kutschera، کـە هەمـیـشـە بەچاوێکی بێ لایەن و بەشێوەیەکی مەوزووعییانە دەڕوانێتە کێشەی کورد. بەم دواییە لە شاری پاریس، لە دەزگەی Bayard، کتێبێکی تازەی لەبارەی کێشەی کورد بە ناونیشانی (بەرەنگاریی کورد یان خەونی شێتانەی سەربەخۆیی) بڵاوکردۆتەوە[1].

کـریس کـۆچێـرا، کـە لەنزیکەوە ئاشنایەتی لەگـەڵ سـەرکردەکـانی کـورد، بەتایبـەتیش لەگـەڵ ژەنەڕاڵ بارزانی، عەبدولڕەحمان قاسملوو، مەسعوود بارزانی، جەلال تاڵەبانی، عەبدوڵڵا ئۆجەلان هەبووەو هەیە، لەم کتێبە تازەیەیدا سوودی لە هەموو چاوپێکەوتنەکانی خۆی بینیوە لەگەڵ ئەو شەخسیاتانەدا. ئەم چاوپێکەوتنانەی لەگەڵ ئەواندا، کردۆتە بناغە و کەرەستەیەک بۆ نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخی کورد و تۆمارکردنی چەند لاپەڕەیەکی گرنگی ئەم قۆناغەی دوایی بزووتنەوەی نەتەوەیی لە کوردستاندا.

کۆچێرا، لەم کتێبە تازەیەیدا، لەوانەیە ویستبێتی پێچەوانەی بۆچوونە کۆنەکانی خۆی - لەساڵانی ١٩٧٠ و ١٩٨٠دا - بسـەلمێنێ. بە نیگایەکی وردبین دەیەوێ ئەوەمـان بۆ شی بکاتەوە کـە بزووتنەوەی نەتەوەیی کـورد لەم ساڵانەی دواییدا سیـمایەکی عەشایەرگەرییانەی هەیە و نەگەیشتـووەتە ئاسـتی نەتەوەخوازی Nationalisme. لەم بارەیەوە، دەڵێ:

«لە کـوردستـانی عـێراقـدا، بۆ نموونە، حزبە سـیاسـییە کـوردییەکـان تەنیـا ناویـان هەیە، حزب نین، بەڵـکو چەند گرووپێکی چەکدارن، زۆر خراپتـر لە تاقمە جـەردەکـان Bandes». پاشـان درێژە بە قسـەکـانی دەدات و دەڵێ: «ئەم حزبانە، لە ماوەی دوای ڕاپەڕیندا، بەداخەوە، سەلماندییان کە توانای ئەوەیان نییە سیاسەت بکەن».



بەقەڵەمی کوردناسێکی فەرەنسی سەدەی نۆزدەم

بە ڕای کۆچێرا، ئەم حزبە کوردییانە، بەتەنیا - هەر خۆیان بەرپرسیار نین لەو زەلکاوەی تێی کەوتوون، بەڵکو «هەر خۆشیان بوونەتە قوربانیی زلهێزەکان و وەکو داشی دامەی ئەوانیان لێ هاتووە، بەتایبەتیش بەدەست ئەمەریکاوە».

لە کۆتایی کتێبەکەیدا، کۆچێرا هەوڵی داوە بیسەلمێنێ کە پرۆژەی دروستکردنی حکوومەتێکی فیدراڵیی کورد لە نێوان ئێران- عێراق- تورکیا دا لە رۆژی ئەمرۆدا شتێکی واقیعی نییە و مەیسەر نابێت.

ئەم کتێبەی کۆچێرا، کە لە ٣٥٢ لاپەڕەی قەشەنگدایە و نرخەکەی ١٦٠ فەرەنکی فەرەنسییە، یەکێکە لە گرنگترین ئەو کتێبانەی کە لە ساڵی ١٩٩٧دا لەبارەی کورد بە زمانی فەرەنسی چاپ کراون. خوێندنەوەیەکی فەرەنسییانەی «مەوزووعییە» بۆ کێشەی کورد لە کوردستانی عێراقدا.

شایانی باسە، کریس کۆچێرا، لە کۆتایی ساڵانی شەستەوە لەسەر کورد و کێشەی سیاسیی کوردستان دەنووسێت، خاوەن کتێبێکی بەهادارە لەم بارەیەوە، بەناونیشانی (بزووتنەوەی نەتەوە خوازیی کورد)، کە تەرجەمەی فارسی و کوردیش کراوە.

بەپێی گۆڤاری Le Monde Diplomatique کە پاشکۆی رۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسییە و لەپاریس دەردەچێت، ئەم کتێبە تازەیەی کۆچێرا بە «مەیلە و پاشگەز بوونەوەیەک» لە قەڵەم دەدرێت لە پشتگیری و بینینی ئەو نووسەرە ناودارە فەرەنسییە بۆ کێشەی کورد لە کوردستانی عێراقدا[٢].

1: Chris Kutschera: La Defi Kurde, Ou le reve fuo de l indepen dance Bayard Ed., Coll. politique, Paris: 1997.

2: Olivier Da Lage; Livres, in Le Monde Diplomatique, Maniere de Voir 34, Mai 1997.

# خوێندنەوەیەکی ناتەواوی کتێبە ناودارەکەی
# مارتن ڤان برۆنسۆن

کتێبێ (ئاغا و شێخ و دەوڵەت) نووسراوی کوردناسی هۆڵەندی، مارتن ڤان برۆنسۆن (M.V. Bruinessen) لەوانەیە تاقە کتێبێکی کوردناسی هاوچەرخ بێت کە هێندە گفتوگۆ و مشتومڕی زۆری لە ناوەندە سیاسی و رۆشنبیرییەکانی رۆژئاوا دروست کردبێت؛ هەر بۆیەش دەمودەست، دوای بڵاوبوونەوەی، تەرجەمە کرایە سەر چەندین زمانی وڵاتانی ئەورووپی.

مارتن ڤان برۆنسۆن، نووسەری کتێبەکە، پیاوێکی هۆڵەندییە، زمانی ئینگلیزی و ئەڵمانی، جگە لە هۆڵەندی، هەروەها فەرەنسی و فارسی و تورکیش، تا ڕادەیەک کوردیش دەزانێ. زۆربەی ئەم زمانانەشی، لە بەکارهێنانی کتێب و سەرچاوەکاندا سوود لێ وەرگرتوون.

ناوبراو، لە ریزی کوردناسە ئەوروپییەکانی ئەمڕۆدا بریتییە لە گەنجترین و وردبینترینیان. جگە لەم کتێبەی لێرەدا دەیخەینە روو، چەندین کتێب و لێکۆڵینەوە و وتاری دیکەشی بە زمانی هۆڵەندی و ئەڵمانی و ئینگلیزی لەبارەی کوردستان نووسیوە و تەرجەمەی عەرەبی و فارسی و فەرەنسی کراون.

برۆنسۆن، لە پێشەکیی چاپە ئینگلیزیەکەیدا، لە لاپەڕە (١)دا دەڵێ: (یەکەم جار لە ساڵی ١٩٦٧دا بوو کە من کوردم ناسی. ئەم میللەتە سەرسامی کردم، ئەمەش هەر لە یەکەم رووبەڕوو بوونەوەمدا لەگەڵیان دەستی پێکرد).

کەواتە، کتێبی (ئاغا و شێخ و دەوڵەت) کە لێرەدا باسی دەکەین و بریتییە لە ٤٦٧ لاپەڕەی قەوارە گەورە، بەری داری نزیکەی چارەگە سەدەیەک وردبوونەوە و تۆژینەوەی نووسەرە لە بارەی کورد و وڵاتەکەی.

کتێبی (ئاغا و شێخ و دەوڵەت) لە شەش بەش پێکهاتووە. پازدە نەخشەی جوگرافی و روونکاریی تێدایە، لەگەڵ پتر لە هەژدە وێنەی جۆراوجۆری ئەتنۆگرافی لەبارەی کورد.



مووسڵ، بادگەری ئەڵمانی، سەدەی نۆزەم

بەشی یەکەمی کتێبەکە، بە ناونیشانی (چەند زانیارییەکی گشتی لەبارەی کوردستان) لە لاپەڕە ١٦ دەست پێدەکات تاکو ٣٨. لەم بەشەدا بە کورتی باسی جوگرافیای کوردستان دەکات، هەروەها ژمارەی دانیشتوان و زمان و دینی کورد دەخاتە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوە. لەهەمان کاتدا حاڵەتی ژیۆپۆلەتیکی کوردستان باس دەکات و گرێی دەداتەوە بە ئابووری وڵاتەکە و دیاردەکانی ژیانی ڕەوەندی و کۆچەرایەتی کورد، ئینجا لە کۆتاییدا دێتە سەر سەرەتای جەنگی نەتەوەییمان لە عێراقدا.

نووسەر هەر لە بەشی دووەمی کتێبەکەیەوە، لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی باوەڕپێکراوی فرەوانەوە دەمانباتە ناو ژیانی عەشایەری و گوندەکانی کوردستانەوە و سەرجەم خاسیەتەکانی سیستەمی ئاغایەتی و شێخایەتی کوردستانمان پێ دەناسێنێ- بەتایبەتیش کوردستانی عێراق.

نووسەر لەم بەشەدا، هۆی دواکەوتنی کورد و زۆرانبازی ناوخۆی کورد و دووبەرەکایەتیی کورد دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو سیستەمە عەشایەرییەی کە باڵی بەسەر گوندەکانی کوردستاندا کێشاوە.

بۆ سەلماندنی ئەم گریمانەیەشی، زۆرانبازییەکە بچووک دەکاتەوە و عەشیرەتەکانی مەنگوڕ و پژدەر و هەمەوەند و دزەیی بە نموونە دهێنێتەوە.

نووسەر، پاش لێکۆڵینەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و دینی عەشیرەتەکانی وەک باڵەک و گۆران، هەروەها ئەو زۆرانبازییەی کە لە نێوان ئاغا و جوتیاراندا، لە نێوان ڕەوەندی خێڵێک و ڕەوەندی خێڵێکی دیکەدا هەیە، دەمانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی کە ئەم دووبەرەکایەتییە عەشایەرییەی ناو گەلی کورد وات لێدەکات هەست بکەی کە هەر یەکێک لەم گرووپانە سەر بە نەژادێکی (Ethnic) جیاواز و دژ بە یەکدین.

(عەشیرەتەکان و دەوڵەت) ناونیشانی بەشی سێیەمی کتێبەکەیە، کە لە پازدە بڕگە پێکهاتووە. لە بڕگەی یەکەمدا چەند خاسیەتێکی گشتیی عەشیرەتە کوردەکانمان بۆ دەژمێرێ. لە بڕگەی دووەمدا ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە ئەم هەموو عەشیرەتە کوردە، لە هەمبەر دەوڵەتی مەرکەزیدا، هەریەکەیان لە ئاشێک دەکەن و هیچیان ئاگای لە ئەوەکەی دیکە نییە؛ یەکێتییەکی سەربەخۆیان نییە، ناشتوانن هەیانبێت و ببنە هێزێکی یەکگرتوو بەرانبەر (دەوڵەت) ڕابوەستن.

نووسەر لە بڕگەکانی دیکەدا، باسی هەمان حاڵەتەکانی سەرەوە دەکات (مێژووی ئەم جۆرە ژیانەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا، هەروەها لە سەردەمی ئاق قۆینلوو و قەرەقۆینلوو و سەفەوییەکاندا). پاشان لە بڕگەی (٥) تاکو (٩)دا ئەوە دەسەلمێنێت کە چۆن ئەم پرژ و بڵاوییەی کورد بووەتە هۆی ئەوەی چەند دەسەڵاتێکی پرژ و بڵاویشیان هەبێت؛ میرنشینی بەتلیس لەلایەک، بۆتان لەلایەک، بەدرخانییەکان لەلایەک... وە چۆن نەتەوەی کورد، بەدرێژایی مێژووی ئیمپراتۆریەتی فارسی و عوسمانییەکان، بووەتە قوربانی ئەم پرژ و بڵاوییە عەشایەرییەی خۆی.

بە کورتی، نووسەر دەیەوێ گریمانەیەکی بنەڕەتی بسەلمێنێ: تراژیدیای کورد لە دووبەرەکایەتی عەشایەرگەری و سیستەمی ئاغایەتی و میرایەتی و شێخایەتییەوە و سەرچاوە دەگرێ. ئەم ڕاستییە، یان ئەم دیاردەیە، تەنانەت تا سەرەتای ئەم سەدەیەش بەردەوام هەبووە و بەرای نووسەر، داگیرکەرە بێگانەکان سوودیان لێ وەرگرتووە بۆ درێژە پێدانی پتر و پتری دەسەڵاتی خۆیان لە کوردستاندا.

بەشی چوارەمی کتێبەکە، لە لاپەرە ٢٤٩ دەست پێدەکات تاکو ٣٣٨. برۆنسۆن لەم بەشەدا تیشک دەخاتە سەر دەوری شێخ و مشایەخ و پیاوانی دینی و مەزهەبەکان لە پێکهاتنی عەشایەرگەری و دواخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی

کــــورد، چونکە بە رای برۆنســـۆن، ئەمـــانیش هەر تەرەفێکی دیکەی دروستکردنی جیاوازییەکانن لەناو دڵی نەتەوەی کـــــورددا، دووبەرەکــــایەتی و پرژ و بڵاوییەکەی کورد قووڵتر و فرەوانتر دەکەن. تەنانەت گەلێک جاران ئەم شێخ و خاوەن مەزهەب و تەریقەتە دینییانە- خۆشیان جڵەوی سەرجەم راپەرینێکی چەکـــداری دەگـــرنە دەست- با لە روخـــــساردا شۆرشگێرانەش بن!

نووسەر بۆ سەلماندنی ئەم گریمانەیە، دەوری شێخ مەحموود و شێخ قادر و شێخ عوسمان و تەریقەی نەقشبەندی و شێخە تاڵەبانییەکان بە نموونە دەهێنێتەوە.

نووسەر بە فراوانی ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەم شێخ و مشایەخە کوردانە چ هێزێکی سیحراوی و قووڵیان لەناو دڵی «میللەت» و عەشیرەتەکانی خۆیاندا هەیە؛ بەڵام چەندێک سست و بێ هێزیشن بەرانبەر دەسەڵاتی دەوڵەتی مەرکەزی! ئەمەیە تراژیدیای کورد.

لە بەشی پێنجەمی کتێبەکەدا، لاپەڕە ٣٤١-٣٥٣، نووسەر لە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیدا، ئەم بنەماڵە و عەشیرەتانە بەسەر دەکاتەوە: بەرزنجییەکان، سەعادەتی نەهری، بارزانییەکان، شێخەکانی بیارە، پالۆو، نەقشبەندییەکان.

راپەرینی شێخ سەعیدی پیران لە کوردستانی تورکیادا، فرەوانترین نموونەی هەوڵدانی نووسەرە بۆ سەلماندنی گریمانەکەی خۆی، کە لە لاپەڕە ٣٥٣ دەست پێدەکات تاکو لاپەڕە ٤٠٦.

نووسەر لەم بەشەدا، گرنگترین سەرچاوە و بەڵگەنامەی جۆراوجۆری بە زمانەکانی ئینگلیزی و تورکی و ئەڵمانی بەکارهێناوە، خۆی لە خۆیدا بە درەوشاوەترین لێکۆڵینەوە دەژمێردرێت کە لەبارەی راپەرینی شێخ سەعیدی پیران نوسرابێت. هۆکارەکانی ئەم راپەرینە، بارودۆخە سیاسی و مێژوویەکەی ئەو سەردەمە، هۆیەکانی دامرکانەوەی، ئەنجام و



ژەنەراڵ شەریف پاشا

ئامـانجـەکـانی.... دەیان کـێشـە و پرسـیـاری دی!. بەشـی شـەشـەم، لاپەڕە ٤٠٧-٤٢٢، بریتـیـیـە لەو دەرەنجـامـە گرنگانەی کە نووسەر لە تێزەکەیدا پێی گەیشتووە.

ئەم کتێبە خوێندنەوەیەکی قووڵ و وردبینانەی کۆمەڵی کوردەوارییە بەچاوی کوردناسێکی رۆژئاوایی. بیروبۆچوون و روانینەکانی، توند و تیـژن، رەخنەگرانەن. ئەگەر لەگەڵی بین یان دژی بین، فەرق ناکا. ئەوەی پێـویسـتە، ئەمـەیە: ئەم کتێبە پێویستە هەموو کوردێک بیخوێنێتەوە، بەتایبەتیش سیاسییەکانمان....[١].

**سەرچاوە:**

(1) M.M.Van Bruinssen: Agha, Shaik, And State on the Social and political roganization of Kurdistan, Rijiswijk.

# ڕۆژنامەگەریی کوردی
# بە زمانی ئینگلیزی

Kurdistan Missionary

لە مانگی نیسان، بەبۆنەی ٩٩ ساڵەی دامەزراندنی یەکەم ڕۆژنامەی کوردییەوە، پێشنیارم کرد کە (وەزارەتی ڕۆشنبیری) یان (یەکێتی نووسەرانی کورد) دەستەیەک لە پسپۆڕ و شارەزاو «ڕۆژنامە نووسان» تەکلیف بکات بۆ ئەوەی مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی بێگانە بنووسنەوە: ڕۆژنامەگەریی کوردی بەزمانی عەرەبی، تورکی، فارسی، ئینگلیزی، فەرەنسی... هتد. ئەو پێشنیارەم، دیارە، تا ڕۆژی ئەمڕۆش، وەک بەردی بن گۆم، فەرامۆش کرا، لێرەدا، بۆ یارمەتیدانی ئەو توێژەر و پسپۆڕانەی کە لە دڵسۆزیی خۆیانەوە، بێ تەکلیف و تەکلیفکاری، لەم مێژووە دەکۆڵنەوە، یەکێک لەو گۆڤارانەی بە زمانی ئینگلیزی بڵاوکراونەتەوە، پێش چاو دەخەین، هێندەی ئاگاشم لێ بێت، هیچ سەرچاوەیەک (نەکوردی، نە بێگانە) ئاماژەی بۆ ئەم گۆڤارە نەکردووەو باسی نەکردووە: تەنیا عەبدولجەبار محەمەد جەباری نەبێت لە کتێبەکەی خۆی بە ناونیشانی (مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی)، سلێمانی چاپخانەی ژین: ١٩٧٠، لاپەڕە ١٣٧ و ١٣٩. ئەویش چەند دێڕێکی کەمەو هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆی بەدەستەوە نییە.



مێجەرسۆن

ئەو گۆڤارەی لێرەدا بۆ یەکەمین جار پێش چاو دەخرێت، بریتییە لە گۆڤاری Kurdistan Missionary، کە بە قەبارەی A4، بەزمانی ئینگلیزی، بەچاپێکی جوان و پڕ لە وێنە، موژدەگارە ئەمریکاییەکان Missionnaires لەشاری ورمێ (ڕەزاییە)ی ماوەی ساڵانی (١٩١٢ - ١٩٢٦)دا بڵاویان دەکردەوە.

موژدەگارەکان، هەر لەسەدەی سێزدەهەمەوە، بۆ بڵاو کردنەوەی دینی مەسیح هاتوونەتە ئێرە. دیارە لە کۆتایی

سەدەی نۆزدەهەم بەملاوەش، بەتایبەتیش لە سەرەتای ئەم سەدەیە گۆڤار بلاوبکەنەوە. عەبدولجەبار جەباری لەم بارەیەوە، لە کتێبەکەیدا دەڵێ:

«لەساڵی ١٩١٢ جموجۆڵی دیانەکانی ئەمریکا لە رۆژئاوای کوردستانی ئێران لە پەرەسەندنا بوو، و بۆ پروپاگەندە کردن بۆ ئایینی مەسیح و بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەیان، کەشیشەکانی ورمێ چەند چاپخانەیەکیان هێناو لەوێ دایانمەزراند، لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجی نەخشەکێشراویان دەستیان کردە چاپکردنی بەیان و نامیلکە بەزمانی ناوچەکە، هەروەها گۆڤارێکی مانگانەیان بەکوردیش دەرکرد».

ئەم گۆڤارە مانگانەیە، وەک عبدولجەبار جەباری دەڵێ: «لەلایەن دەستەی موبەشیرە دیانەکانەوە، لە شاری ورمێ دەردەچوو لەساڵی ١٩١٢، زۆر نەژیا و بە زوویی سەری نایەوە».

ئێمە چاومان تەنیا بە یەک ژمارەی ئەو گۆڤارە کەوتووە، ژمارە (١٠)، کە لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٣دا بلاوکراوەتەوە، لەسەربشی نووسراوە بەرگی پازدەهەم ئەم گۆڤارە، ئەگەر تاکو ساڵی ١٩٢٣، پێشتر 15 بەرگی لێ بلاوکرابێتەوە.

مانای وایە ژمارەی یەکەمی کەی دەرچووە؟ ساڵی ١٩٠٨؟ ساڵی ١٩١٢ (وەک عەبدولجەبار جەباری دەڵێ؟)، یان ساڵی ١٩١٥؟

کەواتە ناتوانین کاتی دەرچوونی ژمارەی یەکەمی دەسنیشان بکەین، بەڵام لەوە مسۆگەرین کە کاتی بلاوبوونەوەی یەکەم ژمارەی، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش جەنگی یەکەمی جیهان و بەشێوەیەکی پچڕ پچڕیش بلاو کراوەتەوە، لەوانەشە ژمارەکانی سەرەتا، بەزمانی کوردی بووبن و پاشان کرابێتە ئینگلیزی.

لەوانەشە ئەو گۆڤارە بەو زمانی کوردییەی ساڵی ١٩١٢ (کە عەبدولجەبار جەباری باسی دەکات) هیچ پەیوەندییەکی بەم گۆڤارە ئینگلیزییەی ئێمەوە نەبێت.

گۆڤاری Kurdistan Missionary، کە ژمارەی دەهەمی لە شاری ورمێ لەساڵی ١٩٢٣ دا بلاو بۆتەوە، بەلای کەمەوە تاکو مانگی نیسانی ١٩٢٦ ژیاوەو بەردەوام ژمارەکانی بلاو کراونەتەوە، بەڵگەی ئەم ڕاستییەش ئەوەیە کە چەند قسە و گوفتارێکی هەڵبژاردەی یەکێک لە دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤارە، خاتوو مارتا داهل Martha Dahl لە ژمارەکانی مانگی مەی ساڵی ١٩٢٥ و ئۆگەستی ١٩٢٥ ئەپریلی ساڵی ١٩٢٦ وەرگیراون و سەرلەنوێ لەکتێبێکی ئینگلیزی بلاوکراونەتەوە، لەوێدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ئەم قسانەی خاتوو مارتا داهل M.Dahl لە ژمارەکانی ساڵی ١٩٢٦ وەرگیراون[1] خاتوو مارتا داهل M.Dahl لەوە دەچێ ئەندامێکی کارای دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤارە ئینگلیزییە بووبێت لە شاری ورمێ، ڕەسمێکی ئەم خانمە ئەمریکاییە لەژمارە ١٠ی گۆڤارەکەدا بلاو کراوەتەوە، هەروەها جار بەجار وتاریشی بۆ نووسیون.

جگە لەمانە، ناوبراو، لەنزیکەوە لەگەڵ کوردەکانی شاری ورمێ و مهاباد ژیاوە، دواین فۆتۆگرافی بەدەست ئێمە گەیشتبێت بریتییە لەو ڕەسمەی کە لەگەڵ ژنێکی کوردی مهابادی لەساڵی ١٩٥٥ گرتوویەتی. لەوانەیە خاتوو مارتا کوردیشی بە باشی زانیبێت.

خاتوونێکی تر کە لەوانەیە دەستی لە بلاوکردنەوەی ئەم گۆڤارەدا هەبووبێت.

بریتییە لە خاتوو گوودهارت Miss Gudhart کە ڕەسمەکەی، لەسەر بەرگی ژمارە (١٠)ی گۆڤارەکەدا بلاو کراوەتەوە، هەروەها نووسەرێکی تریش بەناوی ئۆگەستا گوودهارت Augusta Gudhart کە لەوانەیە مێردی خاتوو

گوودهارت بێت، ئەم نووسەرە لەگۆڤارێکی ئینگلیزی، بیرەوەرییەکانی خۆی نووسیوەتەوە باس لەو ساڵانەی خۆی دەکات (ساڵانی ١٩٢١ - ١٩٢٢) کە لەورمێ لەناو کوردەکاندا ماوەتەوە، هەروەها لەوێدا ئاماژە بۆ مـوژدەگارە ئەمریکاییەکانی هاوڕێی خۆی و گۆڤارەکەیان دەکات لە شاری ورمێ.[٢]

کەواتە گرووپێکی ئەندامانی موژدەگارە ئەمریکاییەکان American Missionary هەبوونە کە بەدەورو خولی ئەم گۆڤارەدا سووڕاونەتەوەو دەریان کردووە.

ئەم گۆڤارە، کە لەوە دەچێ چەند لاپەڕەیەکی بەزمانی کوردیش بووبێت، یان پاشکۆیەکی بەزمانی کوردی هەبێت، هەڵبەت ئامانجی سەرەکییان ئەوە بووە، کە دینی مەسیح بەناو کورداندا بڵاوبکەنەوەو ڕاڤەی ئینجیل بۆ کوردەکان بکەن، لەهەمان کاتدا دەنگوباسی پارچەکانی دیکەی کوردستان بەئەوێ بگەیەنن، هەرچۆنێک بێ، توانیویانە بەشێک لەژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کوردستانی ئەو ساڵانە لەتوێی ئەم گۆڤارەدا تۆمار بکەن.

کەواتە، گۆڤاری ناوبراو، بایەخێکی بەڵگەنامەیی گرنگی هەیەو پێویستە ڕۆژێک لەڕۆژان هەموو ژمارەکانی کۆبکرێنەوەو چاپ بکرێنەوە.

لەم بارەیەوە، ئومێدی ئەوە دەخوازین: ئەو «پسپۆڕ» و «دکتۆر» و نووسەرو ڕۆژنامەنووسە کوردە دڵسۆزانەی لە ئەمریکا دەژین، یان ئەوانی دیکەی ئەوروپا، لە ئەرشیفخانەی مسیۆنێرە ئەمریکاییەکاندا بەدوای ژمارەکانی ئەم گۆڤارە گرنگەدا بگەڕێن و بیاندۆزنەوە.

**سەرچاوە:**

(1): Susan Meiselas: Kurdistan in the Shadow of history, Random
:House, Newyork: 1997.P. 112 - 117.

(2): Augusta gudhart: The Blood of thr Martyrs, in The Atlantic Monthiy, Vol. 130, July 1992.

# لەیلا بەدرخان

## ئەستێرەیەکی سەماو مۆسیقای کوردی

## لە ئەورووپای ساڵانی سییەکاندا

لەیلا بەدرخان لە ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستەمبوڵ لە دایک بووە. قوتابخانەی باڵای هونەری بالیەی لە ئەڵمانیا تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٢٥ بەملاوە دەستی بە چالاکیی سەر شانۆ کردووە.

لەیلا بەدرخان لە ساڵانی ١٩٣٠ شووی بە هونەرمەندێکی پۆڵۆنی کرد، تا ساڵی ١٩٨٦ لە پاریس پێکەوە دەژیان. لە ساڵی ١٩٨٦ کۆچی دوایی کرد و کچێکی لەدوا بەجێ ما بە ناوی Nevin (نیڤین) کە ئێستە لە فەرەنسا دەژی و لە ڕۆژنامەیەکی میسریدا کار دەکات.

لەیلا بەدرخان دەستە خوشکێکی نزیکی کچی محەمەد عەلی عەونی بوو، خاتوو دوڕەیە، کە ئێستەش هەر لە پاریس دەژی. مامۆستا شاکر فەتاح، تاقە نووسەرێکی کوردە، کە دێڕێکی لە بارەی ئەم کچە سەماکەرە کوردە نووسیبێت لە ژمارە (٣)ی گۆڤاری نزار، ساڵی ١٩٤٨.

**لەیلا بەدرخان**

کچە هونەرمەندی کورد، لەیلا بەدرخان، بێ ئەوەی تا ئێستە پێ بزانین، بە پێی ئارشیف و سەرچاوە فەرەنسییەکان، دەردەکەوێ کە لە ساڵانی سییەکاندا، یەکێک بووە لە ئەستێرە هونەرییە هەرە پرشنگدارەکانی ژیانی شەوبێری و شەو ئاهەنگە مۆسقاییەکانی ئەورووپا، هەروەها ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە ناساندنی سەماو مۆسیقای نەتەوەیی کورد بە خەڵکی ئەورووپا.

لە ئەرشیفێکدا کە لە شێوەی دۆسیەیەکی دوازدە لاپەڕەییدا لە **کتێبخانەی (لانگزۆ) لە پاریس دۆزیمانەوە**[1]، باسی ئەوە کراوە کە کچە هونەرمەندی کورد (لەیلا بەدرخان) لە ساڵانی سییەکاندا چەندین ئاهەنگی مۆسیقاو سەمای کوردی جۆراو جۆری لە وڵاتەکانی ئەمریکا، لە بەلژیکا، لە هۆڵەندا، لە سویسرا، لە ئیسپانیا، لە فەرەنسا، لە ئیتاڵیا... پێشکەش بە خەڵکی ئەورووپی کردووە، بەم سەماو ئاهەنگە مۆسیقایە کوردییانەشی، سەرکەوتن و ناوبانگێکی فراوانی لەسەرتاپای وڵاتە ئەورووپییەکاندا وەدەست هێناوە.

ئەم ئەرشیفە، بێ ئەوەی بەرواری ساڵی نواندنی هەموو ئەو چالاکییە هونەرییانەی ئەم کچە هونەرمەندەمان بە تەواوەتی بۆ دەستنیشان بکات، باسی ئەوە دەکات کە (لەیلا بەدرخان) لە ڤیزدیڤاڵێکی هونەریی جیهانیشیدا، لە ڤیزدیڤاڵی **سالز بۆرگ** Salz boug **(نازانین لە چ بەرواری ساڵێکدا، بەڵام ئاشکرایە پێش ١٩٣٥/٥/٢٠)** بەشدارییەکی چالاکانەو کارامانەی کردووە، هەروەها لە بەڕێوەبەرایەتی دەزگای (Lascala de Milan) **ئەندام بووەو شەرەفی ئەوەی دراوەتێ کە لە بالیەیەکی بەناوبانگی ڕۆژهەڵاتییانەدا ڕۆڵی بنچینەیی ببینێت: لە بالیەی (**Respighi**) بە ناونیشانی (بەلقیس شاژنی سەبا** Balkis Reine desaba **)**.[2]

**بەداخەوە ئێمە نەمانتوانی هیچ شتێک لە بارەی ژیاننامەی (لەیلا بەدرخان) ساغ بکەینەوە، تەنیا ئەوە نەبێ کە دەزانین، وەک لەسەرچاوە فەرەنسییەکانیشدا پەنجەنوما کراوە: لەیلا بەدرخان کچی عەبدولڕەزاق بەدرخانی شۆڕشگێڕی کوردە، کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا، وێڕای چەندین ڕووناکبیرانی دیکەی کوردستانی تورکیا**

**پەرِاگەندەی دیوی ئێران ببوون و لە دەوروبەری ساڵی ١٩١٢ لەشاری (خۆئی)** گیرسابوونەوە.[٣]

دیارە لەیلا بەدرخان لەو سەروبەندەی ساڵانی دەیەکاندا جارێ منداڵ بووەو ژیانی هونەریی دەستی پێ نەکردووە، هێشتا پەرِاگەندەو ئاوارەی ئەوروپا نەببوو.[٤]

ئاشکراشە کە دیدی ناسیۆلیستانە و بیری پێشکەوتنخوازانەی باوکی، رووناکبیرێکی دنیا دیدەی وەک عەبدولرِەزاق بەدرخان، کاریگەرییەکی زۆری نواندووە بەسەر پەروەردە بوونی روحی و هونەریی ئەم کچە هونەرمەندە. ئەگەر کاریگەری ئەم بیرە ناسیونالیستە پێشکەوتنخوازەی باوکی نەبوایە، ئەوا هیچ کچە کوردێک لە ساڵانی سییەکاندا جورئەتی ئەوەی نەدەکرد کە ببێتە (سەماکەر) و بێت لە ئەوروپا بەدوای شۆرەتی خۆیدا بگەرِێ.

وەک لە هەندێ نووسراوەکانی ناو گۆڤار و رۆژنامە فەرەنسییەکانی ئەو سەردەمەدا بۆمان ساغ کرایەوە: لەیلا بەدرخان، نەک هەر شارەزاییەکی قووڵ و فراوانی لەبارەی هونەری سەماو مۆسیقای فۆلکلۆری کوردیدا هەبووە، بەڵکو ئەم هونەرمەندە (سەماو مۆسیقا)ی بە شێوەیەکی ئەکادیمیانە و زانستییانەش خوێندووە، وەک هەر هونەرمەندێکی کارامەو هاوچەرخی سەردەمەکەی خۆی، بە تەواوەتی لەم هونەرە شارستانییە دانسقەیەدا قاڵ بۆتەوە، بەرهەمەکانیشی: بەری داری کۆشش و تێخوێندنەوەیەکی قووڵی ئەکادیمییانەی ئەون.

جگە لەمانەش شارەزاییەکی فراوانی لەبارەی هونەری مۆسیقاو سەما جۆراو جۆرە رۆژهەڵاتییەکان هەبووە. لە هەمان کاتدا مۆسیقای ئەوروپی و هەندێ لە سەما ئەوروپییەکانیشی باش ناسیوە، تەنانەت لەباری پراتیکیشیدا، بۆ نموونە لە سەمای (بالیە)دا، سەماکەرێکی خاوەن ئەزموون و کارامە بووە.[٥]

دەردەکەوێ کە لەیلا بەدرخان، دوا بەدوای هەر ئاهەنگێکی سەماو هەر ئاهەنگێکی مۆسیقایی کە لە وڵاتێکی ئەوروپیدا گیرابێتی- ئیتر رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو وڵاتە، بە لێشاو راپۆرت و وتاریان لە بارەیەوە بڵاو کردۆتەوە، چاوپێکەوتنی رۆژنامە نووسییان لەگەڵ ساز کردووە. بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەشمان، ئێمە لێرەدا تەنیا ئەو سێ شەو ئاهەنگەی شاری پاریسی بەنموونە دەهێنینەوە، کە لە خوارەوەدا بەدرێژی باسی دەکەین.

دوا بەدوای ئەم سێ شەو ئاهەنگە، ژمارەیەکی زۆر لە رۆژنامەو گۆڤارە پاریسییەکانی ئەو سەردەمە، وەک **فیگارۆ (Le figaro)، لیبێرتی (Le liberte)، دێب Les Sem aine)، تەنانەت گۆڤارێکی ناودارو گرنگی وەک جیهانی مۆسیقا** Le monde Musicl **و (رێبەری مۆسیقا** Guid Musical)ش وتارو راپۆرتی تەرخانکراویان لەبارەیەوە بڵاو کردۆتەوە، وێرای چەندین وێنەو پرۆپاگاندە و بیرو بۆ چوونی جۆراو جۆر.

کەواتە دیارە، لە وڵاتانی دیکەشدا (لە ئەمریکاو لە هۆڵەنداو ئیتالیاو بەلجیکاو ئیسپانیا و سویسرا) بەهەمان شێوە، لە ماوەی گێرِانی ئاهەنگەکانیدا، رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو وڵاتانە راپۆرت و وتاریان لەسەر بڵاو کردبێتەوەو ئێمە جارێ نەماندیوە.

**ئەو ئاهەنگانەی کە لەیلا بەدرخان لە شاری پاریسدا گێرِاونی ئەمانەن:**

١- ئاهەنگێکی فراوانی سەماو مۆسیقای کوردی لە رۆژی ٥/٢٠ Mai ١٩٣٥ دا. ئەم ئاهەنگەی لە شاری پاریسی، لە هۆڵی (مارسێلان بێر تێلوت Centre Marcelin BertheLot)دا ساز کردووە. زیاتر لە پێنج دیمەنە سەمای پێشکەش بە جەماوەر کردووە، تیپێکی ئۆرکستراتی فراوانی لە ژێر سەرپەرشتیی مۆسیقاژەنێک بە ناوی **(مۆریس ناگژیار-** Naggiar Maurice**)**هاوکاریی کردووە لە پیادە کردنی مۆسیقاو هاونەغمە کردنی سەماکانیدا.

ئەم ئاهەنگە سەربژاردەیەکی فراوان لە رووناکبیر و هونەرمەندانی گەورەی فەرەنسی بینیویانە، هەروەها چەند شەخسیەتێکی ناوداری عەرەبیش بۆ بینینی ئەم ئاهەنگە هاتوون. دوابەدوای ئاهەنگەکەش، حەوت رۆژنامەو گۆڤاری جیاجیای پاریسی، وتارو راپۆرتیان بەوێنەی جۆراو جۆرەوە لە بارەی ئەم ئاهەنگە بلاو کردۆتەوە کە لە خوارەوە، لە هەریەکێک لەو وتارانە، چەند دێرێکی هەڵبژاردە، بەنموونە پێش چاو دەخەین.

٢- ئاهەنگێکی مۆسیقاو سەمای کوردی لە کاتژمێر (٩)ی ئێوارەی رۆژی دوو شەممەی ٦/٢٤ ساڵی ١٩٣٥.

ئەم ئاهەنگە، پێش ساز کران، پرۆپاگەندەیەکی رەسمی فراوانی بۆ کراوە، ئەفیشی گەورەو جۆراو جۆری بۆ ساز کراوەو لەگەڵ وێنەیەکی کچە هونەرمەندی کورد، لەیلا بەدرخان، بەشاری پاریسدا بلاوکراوەتەوە. لە ئەفیشەکەدا بە فەرەنسی نووسراوە **(لەیلا بەدرخان، کچە سەماکەری کورد لە سەما رۆژهەلاتییە فۆلکلۆری و هاوچەرخەکانیدا). ئۆرکستراکە لەژێر بەرێوەبردنی خۆیدا بووە، مۆسیقاژەن: مۆریسی ناگژیار (**Naggiar Maurice**)، پیانۆژەن ئێرین ئایە تۆفا** Iren Aitoff. ئەم ئاهەنگە لە هۆڵێکی گەورەو بەناوبانگی شاری پاریسیدا بە ناوی (رامز) Grande salle ra-meau / ساز کراوە. بلیتی ئەم ئاهەنگە: (٣٠) و (٢٥) و (٢٠) و (١٥) و(١٠) فرەنک بوو، لە چوار مەڵبەندی هونەری و مۆسیقایی شاری پاریسدا فرۆشراوە، وێنەی سەر ئەفیشەکە بە کامێرای ستۆدیۆی (Iris) گیراوە.

٣- ئاهەنگێکی فراوانی مۆسیقای رۆژهەلاتی.

بەداخەوە بۆمان ساغ نەکرایەوە داخوا ئەم ئاهەنگەی لە چ کات و رۆژێکدا ساز کردووە. بەلام بەپێی ئەرشیفێک کە لە بەردەستمانە، دەردەکەوێ، کە ئەم ئاهەنگەشی هەر لە هەمان شوێندا و لەگەڵ هەمان گرووپی مۆسیقاییەکەی پێشوودا ساز کردووە.

ئەفیشی ئەم ئاهەنگە، لە ئەفیشی ئاهەنگەکەی پێشوو زۆر گەورەترە. بەفەرەنسی لەسەری نووسراوە **(میهرەجانی سەما رۆژهەلاتییەکان. لە لایەن لەیلا بەدرخانەوە).**

پرۆگرامی ئاهەنگەکە دوو بەش بووە، کە بە هەمووی لە یازدە دیمەنە سەمای جۆراو جۆر پێکهاتووە:



لەیلا بەدرخان

خـۆڕازاندنەوەی ڕەزا **(مـیناتۆری فـارس)، خـالکوبیی فـارس، دیلان (سـەمـای کـوردی)، نیگای هیندی، هیـرۆگلیف، سـەمـای درووزی، مـار، گـۆرانیی بووک گواسـتنەوە، ئاوازی دینداری، بەلقیـسی شاژنی سـەبا، بالاد، ئۆرکسترای ئەم ئاهەنگەش هەر لەژێر بەڕێوەبردنی خۆیدا بووە.**

بۆ هەمـوو لایەکمـان ئاشکرایە، لەیلا بەدرخان وەختێ کـە ئەم ئاهەنگە کـوردییـانەی لە پایتـەخـتـی ولاتە ئەوروپییـەکـاندا ئامـادەو پێـشـکەش کـردووە، واتە لە سـاڵی ١٩٣٥دا: مۆسـیقـاو سەمـای کوردی لە ناوەوەی ولاتدا (لە کوردسـتـان)دا هێشـتـا بە هیچ شێـوەیەک بەو شێوە تازەو فراوان و هاوچەرخەی خۆی لە دایک نەببوو، بۆیە لەیلا بەدرخان بە یەکێـک لە یەکـەمین ئەو ئافـرەتە هونەرمەندە کوردانە لـە قـەڵەم دەدرێت کە هەوڵیـان داوە بۆ بنیـاتنان و بووژاندنەوەو بلاو کـردنەوەی هونـەری سـەمـاو مـۆسـیـقـای کـوردی. بەداخـەوە، ئەو هەمـوو «یەکـیـەتی»و مـەڵبـەندە کـولتـووریـیـانەی کـورد لە ئەوروپان، کـەچی هەرگـیز غەم لە کۆکردنەوەی ئەم جۆرە ئەرشیف و تێکست و دۆکیۆمەنتە مێژووییـیانە ناخۆن. ئەگـینا شـەیتـان دەزانێ داخـوا چەند نەوارو فـیـلم و کـاسێـتی ڤـیـدیـۆیی ئەم کـچـە هونەرمـەندە کوردەو هی دەیانی دیکەش ئێسـتە لە ئەرشیـفخانـەکانی ئەوروپادا کەوتوون!؟


لەیلا بەدرخان

هەر بۆیە بە شـتـێکی سـەیر نـازانرێ کـە گـەلێـک لە شـارەزایانی مۆسـیقـاو هەروەها ئامـێری مـۆسـیـقـاناسـە ئەوروپییـــەکــان، بۆ نموونە لەوانە **(فـرانسـوا رێنێ ترانشیڤۆر)** بنەچەی گەلێک لە ئامێرە مۆسیقاییەکانی ڕۆژهەلات، وەک (تـەنبـــوور)و بـوزک/بزخ Bazuq) دەگـێـڕێتـەوە بۆ کـورد، دەڵێ کـە لە سـەرەتـادا کـورد ئەو ئامێرە مۆسیقاییانەی داهێناوە.(٧)

ئیـتر بابزانین ڕۆژنامـەو گۆڤـارە فەرەنسییەکانی سـاڵی ١٩٣٥، چ شـتـێکیـان لەبارەی ئەم کـچـە هونەرمـەندە کوردە نووسیوە:

## چەند نموونەیەکی ئەو نووسراوانەی کە لە رۆژنامە و گۆڤارە فەرەنسییەکاندا بلاوکراونەتەوە(٨) لەبارەی ئاهەنگەکەی (لەیلا بەدرخان): لەرۆژی ٢٠/٥/١٩٣٥ دا.

لەیلا بەدرخان کچە بەگزادەی کورد، بەسیحرو بەهای بەرزی سەماکانی، ئەمڕۆ لەلایەن جەماوەرێکی فراوانی ئەورووپییەوە ناسراوە.

ئەم کچە سەماکەرە کچی میر عەبدولڕەزاق بەدرخانە، هەر لە منداڵییەوە بەخت یاریدەی داوە کە خولیای لێکۆڵینەوە لە داب و نەریتە دێرینەکانی خۆیانی بکەوێتە سەر، بەهەمان شێوەش رووبکاتە هونەری سەماکردن و خۆی تێدا قاڵ بکاتەوە.

هونەری سەماکردن لەرۆژگاری دێریندا لەلای ئەواندا رەگ و ریشەیەکی پیرۆز و کۆنی هەبووە، بەڵام ئەمڕۆ تێکەڵ بە داب و نەریت و ژیانی رۆژانەی هەموو خەڵکەکە بووە، بەشێکە لە بەشەکانی کەلەپووری نەتەوایەتییان.

..... لەیلا بەدرخان بە سەما دڵڕفێنەکانی خۆیەوە، سەرکەوتنێکی دانسقەی وەدەست هێنا:

لە پاریس لە بەلژیکا، لە هۆڵەندا، لە ئیسپانیا، لە سویسرا، لە ئەمەریکا...تاد وەرزی رابردوو، لە ڤیزدیڤالی سالزبوورک پێمان کرا بەدیمانەی شادبین، هەروەها بەم دواییەش، لەگەڵ بەرێوەبەرایتی **(سکالا دی میلان – Mi-lan la. Scala)** رێکەوتبوو بۆ ئەوەی رۆڵی بنچینەیی ببینێت لەبالیەی رۆژهەڵاتییانەی Respihi **بەناونیشانی (بەلقیس، شاژنی سەبا** BALKIS REINE DE SABA

ئێمە باسی هەموو سیحرو دڵڕفێنییەکمان کرد کە لە پێکهاتنی هونەریی ئەم کچە هونەرمەندە چەکەرە دەکات، ئەو کچە هونەرمەندەی، کە جوانی تام و بۆی سەماکانی ئۆبهەت و سیحری رۆژهەڵاتی دێرینت لەلا زیندوو دەکاتەوە، لەیلا بەدرخان، کە لە لێهاتووییدا خاوەن دەستاوەردێکی یەکجار فراوانە، بەهرەی خۆی لەچەند سەرچاوەیەکی جۆراو جۆرەوە هەڵێنجاندووە.. کەلەپووری میسری، میناتۆری فارسی سەمای دینداری Rituelle یا سەما فۆلکلۆرییە رۆژهەڵاتییەکان.

ئەو کچە لە لێهاتوویی خۆی، شەخسیەتێکی ئەفسانەییت لەبەرچاو زیندوو دەکاتەوە، وێرای شکۆمەندییەکی پڕ لە ویقار کە ئەمە لەلای ئەودا، دەتوانێ بڵێی کە شتێکی زگماکە.

Geroges Mussy

**رۆژنامە** Le Figaro / 1 juin 1935

... بەژن و باڵا جوان، لەش هەنگاوی، کە بەهیچ شێوەیەکیشی لە ئاریستوکراتییەت بەدەرنییە کچە سەماکەری کورد، لەیلا بەدرخان لەهۆڵی بنکەی مارسیلان بێر تولۆن Berthelot Marcelin ئێمەی بەرەو هیندستان، بەرەو ولاتی فارس، بەرەو میسر گەڕاندەوە، قەدو باڵای لەهەر چاو trووکانێکدا پێکهاتنێکی ئارسیتیکوریانەی تابلێی مەبەستاویی Expessive بە دەستەوە دەدا، بازووەکانی لە نەرمیدا وەک مار وا بوون لە خزیندا، ئادگاریشی بە تەواوەتی وەک شیعر، بە ئاخێزێک دڵیان دەرفاند جلوبەرگێکی قەشەنگ قەدو باڵای داپۆشیبوو.

[carol]Berardo

[Echo de paris: Mai **«گۆڤار»**]

.... کچە سەماکەری بەگزادەی کورد لەیلا بەدرخان، پرۆگرامێکی رەنگاوڕەنگ و تا بڵێی زیندووی پێشکەش بە ئێمە کرد. شەپۆلە نەرم و نیانەکانیم زۆر بەدڵ بوو. هەموو ئەندامێکی لەشی، لەگەڵ هەر ترپەیەکی ئاوازی

مۆسیقاکە دەلەرایەوە، ئەم هونەرە لە لایەن ئەوەوە لە ئەنجامی تێخوێندنەوەی چەند سەرچاوەیەکی قوولەوە ئامادە کرابوو کە فۆلکلۆر تێیدا ببووە شێوازێکی هاوچاخ، بێ ئەوەی شێلوو بکرێت.

[Pierre Wolf]

[La Liberte: Mai 1935 **گۆڤار**]

.. سالۆنێکی رازاوەی پڕ لە جەماوەرێکی بەباق و بریق پێشوازی لە لەیلا بەدرخان دەکا.

... هونەری ئەم کچە، کە سەرچاوەکانی لە رۆژهەلاتەوە هەلدەقولێ، لە پێوەندی کردنی بە ژیانی رۆژئاواییەوە بەرهەمێکی پالێوراوی تازەی بەدەستەوە دا؛ بێ ئەوەی بەهیچ شێوەیەک بەرامەی تەلزماویی داب و نەریتە پیرۆزەکانی رۆژهەلات بدۆڕێنێ.

... مۆسیقاکەی (م. ناگژیارM. NAGGIAR) واتەیەکی شکۆمەندانەی بە رەنگە هارمۆنییە رۆژهەلاتییەکان بەخشیبوو. هەروەها بەجلوبەرگی کەشخەی ئەو کچە هونەرمەندە جوانە. هاوکارییەتی دیکۆرسازانەی رۆح لەنێوان مۆسیقاو دیدە هونەرییە سازگارو تایبەتییەکەی هونەرمەندا هەبوو.

[La Sem aine a Paris: jun **«رۆژنامە»**]

کچە بەگزادەی کورد- خاتوو بەدرخان- کچی میر عەبدولڕەزاق بەدرخان، لەسەر شانۆی M-B بەدرێژایی شەو، چەند سەمایەکی دلڕفێنی پێشکەش کردین: بەرامبەر جەماوەرێکی سەربژاردە، کە چەند شەخسیەتێکی عەرەبی ناوداریشیان تێدابوو. ئەم کچە هونەرمەندە، کە ماوەیەک لەمەوبەر، لەبنکەی (scata de Mil am La) رۆلی یەکەمی لە بالیەی M.R وا بەناونیشانی (بەلقیس شاژنی سەبا) داگیرابوو، جوانییەکی پەیکەر نومای هەیە.

جوانی هەیئەت و ئادگاری، مەگەر تەنیا لەجوولانەوە هاو ئاهەنگەگانیدا هاوتای هەبێ. شێوازی سەماکردنی سەرچاوەی خۆی لەسەما میمۆلۆژیکە Mimologique دێرینەکانەوە وەرگرتووە، ئەو جۆرە سەمایەی کە بەدرێژایی چەندین سەدە لەولاتەکەیاندا باو بووە. ئاسەواری چەندین کاریگەرییەتی جۆراوجۆر و یەکانگیر بەسەماکانیەوە دیار بوون: کاریگەرێتیی سەمای هیندی، لەلایەکی ترەوە فارس، هەروەها جگە لەمانەش تورکی. خاتوو بەدرخان هەموو ئەمانەی لەبەر یەکتر دانابوون؛ نواندنە رۆژهەلاتیەکانی پێشکەش کردین، بریتی بوون لە چەند ئیماژێکی پڕ لە بزاوتی ئەوتۆ کە سەما فۆلکلۆرییەکە لەرێگای ئەو نواندنانەوە گەیشتبووە ئاستی دەربڕینێکی رۆحی.. وهونەری ئەم کچە تام و بۆیەکی تایبەت و ناوچەییانەی زۆر دیاری هەیە.

[Maurice Imberto]

[Les Debats: 27, Mai 1935 **«رۆژنامە»**]

کچە بەگزادەی کورد، لەیلا بەدرخان، لەو ئاهەنگەدا، چەند سەمایەکی تا بلێیی لە بەردل و قەشەنگی نەتەوەییانەی سەر بە رۆژهەلاتی ناوەڕاست پێشکەش کردین.

سیحرە شەخسی نەتەوەییەکەی ئەم کچە هونەرەکەی، لە داب و نەرێتێکی پڕ لە بزاوتەوە، لە کانگەی ژیان- خۆیەوە هەلقولابوون، هاوکات لەگەل مۆسیقایەکی رەسەن وهاوشانی خۆی، کە M-N ئامادەی کردبوو بە شێوەیەکی زۆر ئۆرکستراکەدا دەگێڕا.

[J. Baudry]

[Guide Musical: Juin, 1935 **«گۆڤار»**]

... ئەمە بینینێکی هونەریی دانسقەیە، بەڕاستی کە ئەم کچە سەماکەرە کوردە، لەیلا بەدرخان، پێشکەشمانی دەکا... وێڕای هەموو ئەمانە، شتێکی دیکەش لەلای لەیلا بەدرخاندا هەیە، کە نرخێکی تایبەتی بۆ دادەنرێ:

خەسڵەتی سروشتییانەی قەدو باڵای جوان و ڕەسەنی، کە جووڵانەوە نەرم و وێنانەکانی، پێکهاتنی چەماوەییيانەی ئەوتۆ سازدەکەن کە تا بڵێی نەشئاوی و لەززەت بەخش؛ هەمیشەش لەگەڵ ئەو ڕیتم و ئاوازە جۆراو جۆرانەی کە لە مۆسیقای فۆلکلۆریی سەر زەمینی ئیسلامەوە هەڵدەقوڵێن، هاو ئاهەنگ دەبنەوە.

بۆ نموونە، ئێمە دەزانین کە یەکە یەکەی جووڵانەوەکانی ئەو سەمایەی کەناوی Hyeroglyphe بوو، لە ئەنجامی تێخوێندنەوەیەکی قووڵی پشت بەستراو بە کۆمەڵێک دۆکیومێنت داهێندرا بوون.

لەیلا بەدرخان و هاوکارەکەی دوو ساڵی ڕەبەقیان پێ چووە تا توانیویانە ئەم دیمەنە مۆسیقاییيە دابهێنن، ئەمەش بۆ ئەوان کارێکی زۆر سروشتی و ئاساییيە.

L. Humbert

Le Mon de Musical: Mai, 1835 **«گۆڤار»**

**ژێدەر**

١- کۆد و ژمارەی ئەم ئارشیفە ئەمەیە: (-22-917-8-Mel) لە کتێبخانەی

Bibhotheque Interuniversitaire des

.«Langues Orientales

٢- هەمان ئارشیف. ژمارە بۆ لاپەڕەکانی دانەنراوە. بڕوانە لاپەڕەی «پێشەکییەکە» بە خەتی درشت نووسراوە.

٣- بۆ ژیاننامەو خەباتی ڕووناکبیرانەی (عەبدولڕەزاق بەدرخان) بڕوانە (جليلي جليل: نهضة الاكراد الثقافية والقومية. ترجمة باقی نازێ،. ولاتو، كلدر، الطبعة الاولي: ١٩٨٤، ص٦٥-٨٨).

٤- بەپێی قسەی کاک (محەممەد ئۆزوون): تا ١٩٨٦ لە پاریس دا ژیاوە لە ژیان دابووە.

٥- هەمان ئارشیف پێشەکییەکە، هەروەها ئەو گۆڤارو ڕۆژنامە فەڕەنسییانەی لەم وتارەدا ناومان بردوون و پشتمان پێی بەستوون.

٦- بۆ هەر زانیاری و قسەیەکی لێرە نووسیبێتمان، پشتمان بە ئەرشیفەکە خۆی بەستووە.

7- francois- ReneTranchefort

Les ins truments de Muiquedans Lemond

«ئامێرە مۆسیقاییيەکان لە جیهان دا»

.seuil, paris:1980 P. 159, 160, 100. Volume (1), Edition du

بڕوانە لاپەڕە ١٦٠-١٥٩-١٠٠

٨- ئەم گۆڤارو ڕۆژنامە کۆنانەم، هەندێکیان لە ئارشیفخانەی (ژۆرژ پۆمپیدۆ)، هەندێکی تریشم لە ئەرشیفخانەی (ڤێغسای- کە تایبەتە بۆ تەنیا ڕۆژنامەو گۆڤارە کۆنەکان) پەیدا کردن.

ئەم ژمارە دیاریکراوانەی ئەو بلاو کراوانە، پڕن لە وێنەی جۆراوجۆری خاتوو بەدرخان بەڵام بەداخەوە فۆتۆکۆپی کردنیان ئەستەم بوو.

# چاپە فەرەنسییەکەی کتێبەکەی ئیگلتۆن
# لەبارەی کۆماری مهاباد

La Republique Kurde

ناوی نووسەر: ولیەم ئیگلتۆن William EAGLETON

ناوی کتێب: کۆماری کورد La Republique Kurde

دەزگای چاپ: کۆمپلێکس Edition complexe

شوێن و ساڵی چاپ: پاریس، ١٩٩١

کتێبی (کۆماری کورد لەساڵی ١٩٤٦دا) نووسراوی کوردناسی ناودار، ولیەم ئیگلتۆن، تاکو ئێستا بە باشترین سەرچاوە دەژمێردرێت کە بە زمانێکی ئەوروپی (بە زمانی ئینگلیزی) لەبارەی (کۆماری کوردستان لە مهاباد ١٩٤٦) نووسرابێت.

ئەم کتێبە گرنگە، لەساڵی ١٩٩١دا، واتە نزیکەی ٣٠ ساڵێک دوای بڵاوبوونەوەی چاپە ئینگلیزییەکە، لەلایەن نووسەرێکی فەرەنسی، بە بنەچە ئەرمەن، بەناوی کاترین تێر- سەرکیسیان Catherine Ter SARKISSIAN تەرجەمەی زمانی فەرەنسی کراوە، لەرێگای دەزگای کۆمپلێکسەوە لە پاریس کەوتۆتە بەر دیدی خوێندەوارانی فەرەنسا و فەرەنسی زمان.

ڕەسەنایەتیی ئەم کتێبە، واتە ئەو خاسیەتەی وا لە تۆژەران دەکات ئەم سەرچاوەیە بە ڕاستگۆ بزانن و پشتی پێ ببەستن، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک:

١- لە نووسینی کتێبەکەدا، نووسەر پشتی تەنیا بە ڕاستییە زانستییە سەلماوەکان بەستووە، واتە بەڵگەنامە



ڕەسمی و سیاسی و دائیرەییەکان. نووسەر- خۆی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ (دەزگای کاروباری بێگانەی ئەمەریکا SAEA) هەبووە، وەک خۆی لە پێشەکییەکەدا ئاماژەی بۆ کردووە. ئەم خاسیەتە یارمەتیی نووسەری داوە بتوانێ زۆرترین و باشترین بەڵگەنامە و سەنەدەکان لەبارەی بابەتەکەی، کۆ بکاتەوە.

٢- نووسەر پشتی بە چەند سەرچاوەیەکی زانستی دیکە بەستووە کە ئەوانیش هەر جێگەی باوەڕن، لەوانە، یەکەم: کۆمەڵێک نامە و بەڵگەنامە و ڕەسم کە دۆستە کوردەکانی ئەو (کە لە کۆماری مەهابادا بەشدار بوون) بەنهێنییەوە بۆیان ڕەوانە کردووە؛ دووەم: سەرچاوەیەکی کلاسیکی ئینگلیزی، کە نووسەر لە پێشەکییەکەدا ئاماژەی بۆ دەکات، ئەویش بریتییە لەو وتارەی کە ئارشی ڕۆزڤیلت A.Rosevelt لە گۆڤاری میدڵ ئێست ژورناڵ Middle East Journal لە مانگی ٧ی ساڵی ١٩٤٧ لە بارەی ئەم کۆمارە کوردییە بڵاوی کردۆتەوە.

٣- ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵ و شوێنی دیاریکراوی یەکە یەکەی ڕووداوەکان، تەنانەت هەندێکیان بە دەقیقە و سەعاتیشەوە زۆر بەدیقەت و باریکبینییەوە دەستنیشان کراون. نووسەر لەم بارەیەوە، لە پێشەکییەکەی دا دەڵێ: «ئەمە ئەرکێکی گرنگی من بووە». بێگومان ئەم خاسیەتەش هەر، زیاتر وامان لێدەکات باوەڕ بە قسەکانی نووسەر بکەین و بە مەرجەعێکی ڕاستگۆ لە قەڵەمی بدەین. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، پێویستە پەنجەنومانی ئەوە بکەین کە تەئویلات و لێکدانەوەکان Interpretions کە نووسەر بۆ ڕووداوەکانی کردووە، بەری داری بیرکردنەوەی خودی نووسەرەکەن و تەنیا نووسەر خۆی لێیان بەرپرسیارە، ئەمە دوایین تێبینییەکە نووسەر لە پێشەکییە ئینگلیزییەکەدا دەری بڕیوە.

ئیگلتۆن کتێبەکەی خۆی دابەش کردۆتە سەر چەند فەسڵێک کە لە شێوەی ناونیشانی لاوەکیدا ڕیزی کردوون. لە سەرەتای کتێبەکەشی دا، کورتەیەکی مێژووی کوردی لە ساڵی ١٨٠٠ بەملاوە تاکو جەنگی یەکەمی جیهانی پیشان داوە. لە بەشی دووەمدا، لاپەڕە ٣٥-٤٧، پانۆرامایەکی (پەیوەندیی ڕووسیای لەگەڵ کوردەکان) پێشچاو خستووە؛ بەتایبەتیش لەگەڵ عەشیرەتە کوردەکانی ئێران و وەفدی باکۆ.

لە لاپەڕە ٥١ بەملاوەیە کە نووسەر دەچێتە نێو کرۆکی لێکۆڵینەوە- یاداشتەکانی خۆی. لەم بەشەدا باسی ناو



شـاری مـهـاباد و ژمـارەی دانیـشـتـووانی شـارەکـە، دابونەریت و مەزهەبەکانی خەڵک دەکات، ئینجا باسی شەخسیەتی خودی قازی محەمەد. لە بەشی چوارەمدا، لاپەڕە ٦٥-٧٥، باسی دامـەزراندنی کـۆمـەڵە و خاسیەتەکانی ئەم ڕێکخراوە سیاسییە کوردییە دەکات، پاشان کات و شوێن و چۆنیەتی ئینتیماکردنی قازی محـەمـەد بۆ ئەم ڕێکخـراوە. هەر لەم بەشـەدا باسی شانۆگەرییەکی کوردی دەکات کە تیپێکی کوردی لە مهاباد پێشکەشیان کردووە.

ئیگلتۆن ناو لەم شانۆگەرییە دەنێت ئۆپێرا Opera کە تەعـبـیـری لە ناوەڕۆک و بیـرێکی سـیـاسـیی کـوردی دەکـات. ئەم ڕاسـتـیـیـە، بێگومـان بەڵگەنامـە و سەرچاوەیەکی گـرنگە بۆ ئەو توێژەرانەی کـە مـێـژووی شانۆی کوردی دەنووسنەوە. ئینجا لەلاپەڕە ٧٥-٨٥دا باس لە پەیوەندی نێوان ئازەربایجان و کوردستان دەکات و پاشان دووەم وەفدی کوردی لە باکۆ.

لە بەشی پێنجەمدا باسی بارزانییەکان، ڕابردوویان، دابونەریتیـان دەکات، ئینجـا باسی گەڕانەوەی ژەنەراڵ بـارزانـی و ڕاپـەڕینـی سـالـی ١٩٤٥. لە بـەشـی شەشەمیشدا ئەم بابەتانە دەخوێنیتەوە: بارزانییەکان و هاوپەیمانەکانیان، پارتی دیموکراتی کوردستان، ئۆتۆنۆمی ئازەربایجان، ئۆتۆنۆمی کوردستان.

گـرنگـتـرین بەشی کـتـێـبـەکـە، لێـرە بەدواوە دەست پێدەکات، واتە لە لاپەڕە ٩٧ بەملاوە، کاتێ دێتە سەر ڕۆژی ١٩٤٦/١/٢٢ کـە لە مـهـاباد ئیـعـلانی «کـۆمـارێک» دەکرێت بەناوی کۆماری کوردسـتـان لە مـهـاباد. هەر لەم بەشـەدا باسی دەوری سـیـاسی و عەسکەری یەکێتی سۆڤیەت لە مهاباد دەکات. ئینجا یەکە یەکە وەزارەتەکانی ئەم کۆمارە. لە بەشی هەشتەم بەملاوە، واتە لەلاپەڕە ١٢٣ تاکو ٢١٣ بەشێوەیەکی کرۆنۆلۆژی، ڕۆژ بە ڕۆژ ڕووداوەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە: لە یەکەم ڕۆژی ڕاگەیاندنی کۆماری مهابادەوە تاکو ڕۆژی لەناوچوون و لەسێدارەدانی قـازی محـەمـەد. ئەمـەش



کوردێکی جاف ١٨٢٠
بەپەڕەمووچی مستەر ریچ

بەشێوەیەکی پوختەی ئەوتۆ کە وەک لە چاوی کامێرایەکی سینەماییەوە بڕوانیتە کارەسات و ڕووداوەکان: لە مانگی مارسی ١٩٤٦ بەملاوە تا کۆتایی.

نووسەر لە کۆتایی کتێبەکەیدا، لە لاپەڕە ٢١٣ بەملاوە چەند بەڵگەنامەیەکی گرنگیشی پێشچاو خستووین لەگەڵ چەند نەخشە و وێنەیەک، گرنگترینیان:

١- ناوی هەموو ئەو کەسانەی کە لە وەفدە کوردییەکەی باکۆدا بەشدار بوون.

٢- ناوی دامەزرێنەرانی کۆمەڵە.

٣- ناوی بەشداربووەکانی وەفدی دووەم کە لە باکۆ دەوری خۆیان بەجێ گەیاندووە.

٤- ئەندامەکانی کۆمیتەی ناوەندی + ئەندامەکانی کۆمیتەی ناوەندیی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٤٦ و پێکهێنانی کابینەی حکومەتەکە.

٥- ئەندامەکانی ئەنجومەنی باڵای پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە مانگی مەی Mai ساڵی ١٩٤٦ پێکهاتووە.

٦- ناوی بەڕێوەبەرە گشتییەکان و شەخسیاتەکانی دیکەی کۆماری کورد لە ساڵی ١٩٤٦دا.

٧- لیستێکی فراوانی ناوی ئەو ئەفسەرانەی کە لە جەیش و لەشکری کۆماردا بەشدار بوون.

ئەم کتێبە، کە لە ٢٤٥ لاپەڕەی قەبارەی باخەڵ چاپ کراوە، چاوەڕێی دەستی وەرگێڕێکی هونەرمەند دەکات کە دیدی خوێنەرانی کوردی پێ ڕووناک بکاتەوە.



# کوردستان لە سێبەری مێژوودا

ناوی نووسەر: سۆزان میەسێلاس.

شوێن وساڵی چاپ: نیۆیۆرک، دەزگای ڕاندۆم هاوس

Random House، ۱۱/۹۹۷

کتێبی (کوردستان لە سێبەری مێژوودا)، بەرهەمی کچە ڕۆژنامەنووسی ئەمریکایی (سۆزان میەسێلاس)، کتێبێکی بێ وێنەی ئەوتۆیە کە تاهەتایە وەک گەنجینەیەکی ئەرشیفیی بێ هاوتا بۆ کورد دەمێنێتەوە. ڕاستییەکەی، بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە لەلایەن ئەم کچە ئەمریکایی ۳۵ ساڵەیە، بۆ ئێمەی کورد ڕووداوێکە!

سەرەتا، پەنجەنومانی ئەو ڕاستییە دەکەم کە بەدرێژایی مێژووی سەدەکانی ڕابردوومان، هەمیشە، کوردناسە ڕۆژئاواییەکان، زیاتر و زانستییانەتر- لەچاو خۆمان- توانیویانە دانە مرواریەکانی ئەرشیفی نەتەوەییمان لە دووتویی کتێبەکانیاندا بپارێزن. بەکورتی، ئەوان لەئەنجامدا بۆ خۆمان بوونەتە «مەرجەع» و سەرچاوەیەک. ئەو بەرهەمەی لێرەدا دەیخەینە ڕوو، یەکێکە لەو مەرجەعانە.

کتێبی ناوبراو، کە ڕاستتر وایە ناوی بنێین (ئەلبووم)، کوردستان لە ڕێگای پیشاندانی ڕەسم و فۆتۆگرافەوە- تەنیا فۆتۆ PHOTO- جوانتر دەکات. ئەمەش هەر لە دوا ساڵانی سەدەی نۆزدەهەمەوە تاکو ئەمڕۆ. کتێبەکە فۆتۆگرافە و مێژووی کوردمان بۆ دەگێڕێتەوە، لە هەمان کاتدا مێژووی کوردە و جوانییە سیحراوییەکانی فۆتۆگرافمان پێ پیشان دەدات: فۆتۆگراف و ڕەسمە دانسقە فەرامۆش کراوەکانی کوردستان!

ئەم بەرهەمە بریتییە لە ۳۹۳ لاپەڕەی گەورەی قەوارە A3، زیاتر لە ۱۲۰۰ هەزار و دووسەد ڕەسمی کۆنی مێژوویی کوردستانی تێدایە، زیاتر لە چل و پێنج نووسەر و ڕووناکبیر کە بەشی زۆریان غەیرە کوردن هاوکارییان لەگەڵ دانەری کتێبەکە کردووە بۆ ئامادەکردنی ئەم ئەلبومە، لەوانە: ستیوارت ئەلکزەندەر (لە پاریس)، بێرجێت

نامان (له بەرلین)، کابریێل لیۆن (له شیکاگۆ)، سێرج ژیتــمــان (له مــۆسکۆ)، نیکیکوول (له لەندەن)، ئەلێکسی برۆبێن (له نیۆیۆرک).

نووســەر بۆ دانانی ئەم ئەلبــۆمــە، سێ ڕاوێژکــاری هەبووە: ئەمیری حەسەن پوور، مارتن ڤان برۆنسۆن، شارلس مەڕوێدەر.

جێگای سەرنجە زۆربەی هەرە زۆری تێکستەکان و ڕوونکردنەوەی ئەم ڕەسمە کۆنانە، نووسەری ناوداری هۆڵەندی، دۆستی کورد، مارتن ڤان برۆنسۆن Martin Van Bruinssen نووسیویەتی.

خاتوو سۆزان، دانەری ئەلبومەکە، بۆ ئامادەکردنی ئەم گەنجینەیە، زیاتر له ٧٥ ئەرشیفخانەی دەوڵەمەندی دنیا گەڕاوە، لەوانە:



کانۆن ئەوروپا، کۆڵۆمبیا یونیڤێرستی، لیبرەری ئۆف کۆنگریس، سەنترەڵ زایۆنیست ئەرشیف، ناشناڵ ئەنترۆپۆلۆجیکەڵ ئەرشیف، ذه نیۆیۆرک تایمز، ذه ناشناڵ سەکیوریتی ئەرشیف... ئەمە جگە لەو هەموو ماڵه کوردو ڕووناکبیرانەی کە له کوردستاندا - لەماوەی ساڵانی ١٩٩١-١٩٩٢دا ڕەسمی جۆراوجۆری کۆنیان بەدیاری بەخشیوەتە ئەم خانمە سەرازایە. بەکورتی: دانەری ئەم ئەلبوومە، بۆ ماوەی چوار ساڵ، ئەم سەر تا ئەوسەری دنیا گەڕاوە، تا توانیویەتی ئەو هەزار و دووسەد ڕەسمە له ئەلبوومێکی ٣٩٣ لاپەڕەییدا کۆ بکاتەوە.

ئەمە یەکەمین جارە له مێژوودا، نووسەرێک بتوانێ له کتێبێکدا سەرنجمان بۆ بایەخی ڕەسم (فۆتۆ) له کوردستاندا ڕابکێشێ؛ یەکەمین جارە تێمان بگەیەنێ کە فۆتۆگراف توانای ئەوەی هەیە مێژوومان بپارێزێت و له هەمان کاتدا ڕوونی بکاتەوە، ئێمەی کورد لەوەتەی فۆتۆگراف هەیە، لەم ڕاستییە گرنگە، «لەم نهێنییە» بێ خەبەرین.

(کوردستان له سێبەری مێژوودا) ئەم قۆناغە مێژووییانەی خوارەوەمان، بە وێنە، بۆ دەگێڕێتەوە:

١- پێش جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤)، گەڕاڵە ئەوروپاییەکان و موژدە گارەکان، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە.
٢- لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە بۆ دروستبوونی نەتەوە- دەوڵەت، داگیرکرانی میزۆپۆتامیا لەلایەن ئینگلیزەکانەوە و دروستبوونی عێراق، شۆڕشەکانی کورد لە تورکیا لە ساڵانی ١٩٠٠دا - ١٩٢٠دا.
٣- کۆماری مهاباد لە کوردستانی ئێران و پەیوەندیی بە پارچەکانی ترەوە.
٤- کێشە و خەباتی کورد لە ساڵانی مەلەکی لە عێراق و ئێراندا و بێ ناسنامەیی کورد لە تورکیا لە ماوەی ساڵانی ١٩٣٠-١٩٥٨.
٥- بزووتنەوەی خەباتی چەکدارانە لەپێناو ئۆتۆنۆمی لەعێراق و تورکیا و ئێراندا تا شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران.
٦- دوای شەڕی سارد- قۆناغی ئەمڕۆ و دوای «جەنگی کەنداویش.

دەزگای Random House کە بڵاوکەرەوەی ئەلبوومەکەیە، لەلاپەڕەی یەکەمدا نووسیویەتی:

«کوردەکان، لەئەنجامی ئەوەی هیچ دەوڵەتێکیان نییە، تا ئێستا نەیانتوانیوە ئەرشیفخانەیەکی نیشتمانی بۆ خۆیان دروست بکەن. فۆتۆگراف و بەڵگەنامە کۆن و مێژووییەکانیان خەریکە وردە وردە لەناو دەچن، یانیش پەڕاگەندە و پەرش و بڵاو، هەر یەکەی، لە سووچێکی دنیادا کەوتوون. لەم کتێبەدا، سۆزان میەسێلاس توانیویەتی بەشێکی گرنگی ئەم کەرەستە مێژووییانەی کورد کۆبکاتەوە و لەشێوەی بیرەوەرییەکی گەلەکۆدا Collective memory زیندوویان بکاتەوە».

دانەر لەم دیو و لەودیوی کتێبەکەدا، نەخشەیەکی کوردستانی گەورەی داناوە، کە کۆمەڵەی خۆیبوون -Xoy bun دروستیان کردووە و پێشکەش بە کۆنفرانسی سان فرانسیسکۆیان کردبوو لەساڵی ١٩٤٥دا.



کوردێکی باکوور، سەدەی نۆزدەم

بڵاوکردنەوەی ئەم نەخشەیە، کە لە هوشیارییەکی سیاسی و مێژووییەوە هاتووە لەهەمبەر کورد، لەهەمان کاتدا دڵسۆزیی نووسەر ڕوون دەکاتەوە بەرامبەر گەلەکەمان و ئەرشیفە جوگرافییە «بەستەزمانەکەی».

کۆنترین فۆتۆگرافێک کە دانەر لە کتێبەکەیدا بڵاوی کردۆتەوە بریتییە لە چەند وێنەیەک کە لە ساڵانی ١٨٩٠-١٨٩٤دا گیراون، فیزیک و هەیئەتی (بەدەنی) و ئیتنۆگرافیی کورد ڕوون دەکەنەوە و ئەمڕۆ لە مۆزەخانەی مێژووی سروشتی Museum d Histoire Naturelle لە شاری لیۆن لەفەڕەنسا پارێزراون. پاشان چەند پۆستکارتێکی دیکە کە لە ساڵی ١٨٩٥ دا گیراون. جێی سەرنجە دانەر بۆ پەیداکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم پۆستکارت و ڕەسمە کۆنانەی سەدەی نۆزدەهەم پشتی بە کتێبی ڕۆژهەڵاتناس و موژدەگارە ڕۆژئاواییەکان بەستووە.

کوردناسی ناوداری هۆڵەندی، ئەنتۆگرافیست، مارتن ڤان برۆنسۆن، بە ڕوونکردنەوە و لەسەر نووسینی هەر یەکێک لەم پۆستکارت و ڕەسمانە، ئەلبوومەکەی، بەهادارتر و بەنرختر کردووە. بەشێوەیەکی وردو زانستییانە لە بنج و بناوانی هەر یەکێک لەم پۆستکارت و ڕەسمانەی کۆڵیوەتەوە و بە بەڵگە قسەکانی خۆی سەلماندووە.

هەر یەکێک لەم فۆتۆ و پۆستکارتانە، لایەنێکی گرنگ و درەوشاوەی ئەو ڕاستییە مێژووییانەمان بۆ دەسەلمێنن کە ئێمە تاکو ئێستا تەنیا بە نووسین لە کتێبی مێژوونووسەکانماندا خوێندوومانەتەوە.

هەر بۆیەش، ئەم ئەلبوومە، چەند خزمەتی مێژوونووس و ئەتنۆگرافیست و سیاسییەکانمان دەکات، دوو ئەوەندەش پێویستییەکانی ڕۆژنامەنووسی و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی کوردی پڕ دەکاتەوە. لەسەر هەمان ئەم بنچینەیەوە، دەڵێم: هەموو ڕۆژنامەیەکی کوردی و هەموو بنکە و دەزگایەکی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریی کوردی پێویستە نوسخەیەک لەم کتێبەی لەلا بێت. خۆ، بۆ سیاسی و مێژوونووسەکانیش، هەر یەکجار زۆر گرنگە.

نووسەر لە کۆتایی کتێبەکەیدا، لاپەڕە ٣٧٦-٣٨١ دا، کورتەیەکی ژیان و بەرهەم و چالاکییەکانی هەموو ئەو کەسانەی نووسیوە کە لەناو کتێبەکەیدا ناویان هاتووە، ئینجا پاشان «قامووسێکی سیاسیی روونکاری» و ئەندێکسێکی پێنج لاپەڕەیی. لە کۆتاییشدا چەندین سەرچاوەی گرنگی بۆ خوێنەرە ئینگلیزی زمانەکان لەبارەی کورد دەستنیشان کردووە. هەموو ئەمانە بەرهەمەکەی دانەریان گەیاندۆتە ئاستێکی ئەکادیمی و زانستییانەی بێ وێنە.

بەڕاستی، من کە ئەم کتێبەی ئەم کچە ئەمریکاییەم خوێندەوە، بەزەییم بە ئەقڵیەتی خۆمان دا هاتەوە و دیسانەوە بەخۆمم گوت: «ئای، ئەرشیف... ئەرشیفی بەستەزمانی کورد!». خۆزگە ئێمەش کارێکی ئەوها مەزنمان لە بواری بەڵگەنامەکانی خۆماندا ئەنجام دەدا.

# خوێندنی باڵای کوردی له زانکۆی سۆربۆن

# و

# زەمالاتی خوێندنی ئەنستیتووی کوردی پاریس

لەم وتارەدا هەوڵ دەدەین بەکورتی سێ باسی گرنگ روون بکەینەوە: مێژوولکەیەکی خوێندنی کوردی و کوردناسی لە پەیمانگەی ئینالکۆی شاری پاریس؛ دووەم: دۆخی ئەمڕۆی خوێندنی باڵای کوردی و کوردناسی لە زانکۆی سۆربۆن لە پاریس – کە یەکێکە لە مەڵبەندە گرنگەکانی خوێندنی کوردی لە جیهاندا؛ سێیەم: سیستەمی زەمالە وەرگرتن و بە زەمالە خوێندنی قوتابییانی کورد لەرێگەی ئەنستیتووی کوردەوە لە پاریس.

## دێڕێکی مێژوویی لەبارەی خوێندنی زمانە رۆژهەڵاتییەکان لە فەرەنسا

فەرەنسا هەر لە سەدەی سێزدەهەمەوە بایەخی دابووە دەرس گوتنەوەی زمانە رۆژهەڵاتییەکان لە زانکۆ و پەیمانگاکانی خۆیدا. بابەتی رۆژهەڵاتناسیش Orientalisme، لە فەرەنسا، بەشێوەیەکی رەسمی، لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمەوە نەشونمای کرد. ئەوە بوو لە ساڵی ١٥٣٠دا کۆلێژی شاهانە College Royal لە سەردەمی فرانسوای یەکەمدا کرایەوە و لەو کۆلێژەدا دەرسی زمانی یۆنانی و عیبری دەگوترایەوە. یەکەم مامۆستا و رۆژهەڵاتناسی فەرەنسی، گووم پۆستێل G. POSTEL بوو کە دەرسی دەگوتەوە[١].

هەر لە هەمان سەردەمدا، لە ئەنجامی پێشکەوتنی بازرگانیی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا، پەیوەندیی دیپلۆماسی و سیاسیی نێوان فەرەنسا و وڵاتانی رۆژئاوا پەرەی سەند. لە سەدەی ١٦م بەملاوە، فەرەنسا باڵوێزخانەی خۆی لە پایتەختەکانی دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویی ئێراندا کردەوە[٢]. ئەمە کارێکی باشی کردە سەر پێشکەوتن و زیاتر بوونی بایەخدانی فەرەنسا بە زمانی نەتەوەکانی رۆژهەڵات.

پاشان، فەرەنسا، لەسەر داوای ئەو فەرەنسییانەی دەچوونە وڵاتانی رۆژهەڵات، قوتابخانەیەکی لە ئەستەمبوڵ دامەزراند بۆ پێگەیاندنی بەشی تەرجەمە و وەرگێڕان. ئەو قوتابخانەیە هەر سێ ساڵ جارێک ١٨ قوتابیی فەرەنسیی وەردەگرت بۆئەوەی زمانی تورکی فێربن و بخوێنن.

لە سەدەی ١٧مدا لێکۆڵینەوەی رۆژهەڵاتناسی لە پاریسدا فراوانتر بوو، ژمارەی مامۆستا رۆژهەڵاتناسەکان و زمانزانەکان زیاتری کرد. قونسوڵی فەرەنسی لە ئەسکەندەریە، A. DU RYER یەکەم کتێبی رێزمانیی لەبارەی زمانی تورکی لە ١٦٣٩دا بڵاوکردەوە، پاشان لە ١٦٤٧دا تەرجەمەی قورئانی بۆ سەر زمانی فەرەنسی کرد.

لە ١٧٧٤دا، کۆلێژی شاهانە College Royal بەشێکی تایبەتی بۆ فێربوونی زمانی تورکی و فارسی کردەوە. کاردۆن و پاشان پیێر رووفین ئەرکی دەرس گوتنەوەیان کەوتبووە ئەستۆ. لە ساڵی ١٧٧٠شدا، لویسی چواردەهەم قوتابخانەیەکی دیکەی کردەوە – کە ئابی یەسوعییەکان سەرپەرشتییان دەکرد. ئەو قوتابخانەیە ئەرکی ئەوە بوو کە هەر ساڵێک ١٢ گەنجی رۆژهەڵاتی پێبگەیەنی و ببنە وەرگێڕ یان پەیامنێری فەرەنسا لە وڵاتێکی رۆژهەڵاتدا.

لە ساڵی ١٨٢٨دا پاشای فەرەنسا، شارڵی دەیەم، ئارشیفخانەیەکی تایبەت و تەرخانکراوی لە کتێبخانەی نیشتیمانیی فەرەنسا دامەزراند و ناوی لێنا بەشی نەخشە جوگرافییەکان. لەو رۆژە بەملاوە ئەم ئارشیفخانەیە دەستی کردە کۆکردنەوە و دروستکردنی سەدان نەخشەی جوگرافیی جۆراوجۆر کە یارمەتیی گەڕاڵ و جوگرافیاناس و

مـێـژوونووس و ڕۆژهەڵاتناسـەکـان بدات بـۆ باشـتـر پـەی بردن بە دنیـای ڕۆژهەڵات و ناسـینی زمـان و ئەدەبـیـات و مـێـژووی نەتەوەکـانـی ڕۆژهەڵات[٣]. هەروەها لە سـەرەتای سـەدەی هەژدەهەمـدا، کـتـێـبـخـانەی پاشـایەتیی فەرەنساBibliotheque Royale لە پاریس دەسـتی کرد بە کـۆکردنەوەی دەسنووسـە کۆنەکان. بەم شێوەیە، تا سـاڵی ١٩٠٠، ٣٥٠ دەسنووسیان بۆ ئەو کتێبخانەیە کۆکردەوە[٤].

ساڵی ١٧٩٥ قوتابخانەیەکی تایبەت بە زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان بە ناوی قوتابخانەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان Ecole des Langues Orientales لە پاریس دامـەزرا؛ فـارسی و تورکی و عـەرەبیی تێدا دەخوێنرا. مـامۆسـتـایەک بە ناوی لویس فـارسـیی تێدا دەگـوتەوە، پاشـان شـێـزی و پاشـان ل. ت. لانگێلێز، ئنجـا ژۆل مـۆهل J. MOHL، ئەوەی شانامەی فیردەوسی تەرجەمەی فەرەنسی کرد لە ساڵی ١٨٤٨دا[٥].

کرانەوەی ئەم قوتابخانەیە، قوتابخانەی زمانە ڕۆژهەڵاتییـەکان Ecole des Langues Orientales لە پاریس، لە ساڵی ١٧٩٥دا، یەکەم هەنگاو بوو بەرەو ڕێگای بیرکردنەوە لە دامەزراندنی بەشێک بۆ ناساندنی زمان و ئەدەبیات و مـێژووی کـورد لەناو ئەو قـوتابخـانەیەدا لە داهاتوودا. (پیـێـر - ئامێـدی ژووبێـرت Pierre-Amedee JAUBERT (١٧٧٩- ١٨٤٧)، کە گەڕاڵێکی ناوداری فەرەنسییـە و کـتـێبێکی بایەخداری لەبارەی کوردسـتـانەوە نووسـیوە، دەرچووی ئەم قوتابخانە ناوبراوەیە)[٦].

قـوتابخـانەی نـاوبراو لە سـاڵانی ١٩٦٠دا ناوەکـەی بووە (ناوەندی نەتەوەیی) پاشـان بـووە پەیمانگەی نـەتەوەیی زمان و شارسـتـانیەتە زندووەکانی ڕۆژهەڵاتInstitut Nationale dea Langues et Civilisations Orientales Vivantes. ئێستاش هەر هەمان ناوی هەیە و پێی دەڵێن ئینالکۆ INALCO.

### خوێندنی کوردی لەم پەیمانگەیەدا

تا دوای جەنگی جیهانیی دووەم بیر لەوە نەکرابۆوە کە لەم پەیمانگەیەدا بەشی زمانی کوردی بخوێنرێت و خوێندنی لێکۆڵینەوە کوردییەکان بکرێتەوە.

لە ساڵی ١٩٣١دا هەوڵدانێکی باش بۆ ئەم مەبەستە درا، ئەمەش لەلایەن بەڕێوەبەری ئەو کاتەی پەیمانگە، مسیۆ پۆنسۆPonsot، کە بە نامەیەکی ڕەسمی داخوازیی لە باڵوێزی سووریا و لبنان کردبوو بۆئەوەی کورسییـەکی بەردەوام Chaire بۆ دەرسدانەوەی زمان و ئەدەبی کوردی لەو پەیمانگەیەدا تەرخان بکرێت. لەو نامە ڕەسمییەدا کە لە ٧/ ٨ / ١٩٣١دا نووسـراوە، دەڵێ: " زمـانی کـوردی، سـەرەڕای ڕەتدانـەوە سـیـاسـیـیـەکـانی، پێویسـتـە لە پەیمانگەکەمـاندا بکرێتەوە و بگوترێتەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی، دەرسدانەوەی زمانی کوردی دوو سوودی هەیە: سوودێکی زمانەوانیی هەیە، سەبارەت بەوەی لە خێزانی زمانە ئێرانییەکانە. ئنجا دوای ئەمەش، بەپێی ئێنسکلۆپێدیای بریتانی، هەڵەیە ئەگەر ئێـمـە وا تێبگەیـن کـورد ئەدەبیـاتی نەتەوەیی خۆی نییـە. سـوودێکی مرۆڤایەتیـشی هەیە: زیاتر لە ملیـۆن و نیـوێک کورد بەم زمانە قسە دەکەن ". ناوبراو پێشنیـاری ئەوەیشی کردووە کە کوردناسی ڕووس، مینۆرسکی، ئەو دەرسە بڵێتەوە و سەرپەرشتیی ئەو بەشە بکات " مینۆرسکی باشترین کەسە بتوانی زمان و ئەدەب و مێژووی کورد بڵێتەوە ". لە هەمان کاتدا ڕۆژهەڵاتناسی ناوداری فەرەنسـیش، لویس مـاسـینیـۆن Massiginon لە نامەیەکی ڕۆژی ١٦ /١١/ ١٩٣١دا داخـوازیی لە دیوانی سـەربازیی فـەرەنسی لە بەیرووت کـردبوو بۆ هەمـان مـەبەست. ئەویش بە هەمان شێوە پێشنیاری مینۆرسکیی کردبوو.

هەروەها سوورەییا بەدرخان، برای جەلادەت و کامەران بەدرخان، هاوکات لەگەڵ ئەماندا هەمان هەوڵ و تەقەلای

بۆ جێبەجێکرنی ئەم کارە دابوو. پێکرا لەگەڵ ماسینیۆن پێشنیاری دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی زانستیی کوردیشیان کردبوو.

ئەم هەوڵدانە تا ساڵی ١٩٤٨ جێبەجێ نەکرا: ئەمەش لەبەرئەوەی مینۆرسکی رووس بوو، هێشتا رەگەزنامەی فەرەنسیی وەرنەگرتبوو. لە ساڵی ١٩٤٨ بەملاوە، بە پێی ئاگاداریی کوردناسی ناوداری فەرەنسی، خاتوو جۆیس بلۆ، دەرسی زمان و ئەدەبیات و مێژووی کورد لەم پەیمانگەیەدا دەستی پێکرد. کوردناسی فەرەنسی، رۆژە لسکۆ Roger LESCOT ئەم ئەرکەی پێ سپێردرابوو کە تا ١٩٥٠ درێژەی کێشا[٧].

لەو ساڵە بەولاشەوە، لسکۆ رووی لە کامەران بەدرخان نا بۆ ئەوەی ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ. کامەران بەدرخانیش، کە ئەو کاتە پارێزەر بوو لە بەیرووت، لە ساڵی ١٩٥٠ بەملاوە، بە خۆرایی و بێ پاداشت واتە بێ مووچەوەرگرتن، تا ساڵی ١٩٦٢ دەرسی زمان و ئەدەب و مێژووی کوردی لەو پەیمانگەیەدا گوتۆتەوە. مووچە وەرنەگرتنەکەی، پەیوەندیی بەمەوە هەبوو کە کامەران بەدرخان رەگەزنامەی فەرەنسیی نەبوو. لە ساڵی ١٩٦٢ بەملاوە حکوومەتی فەرەنسی دەستی پێکرد مووچەیەکی بۆ ببڕێتەوە، پاشان لە هەمان پەیمانگەدا کردیانە مامۆستای رەسمیی هەمان ماددە بە پلەی Repetiteur. زۆزک رواندزی و محەمەد عەلی سەلا (خەڵکی فارس بووە) هاوکار و یارمەتیدەری ناوبراو بوون.


کامەران بەدرخان

کامەران بەدرخان، کە دکتۆرای لە قانوون هەبوو لە زانکۆی لایپزگ لە ئەڵمانیا، تا ساڵی ١٩٧٠، واتە تا تەمەنی ٧٥ ساڵی، لەو پەیمانگەیەدا دەرسی گوتەوە. کوردناسی فەرەنسیی ناودار، خاتوو جۆیس بلاو لە سالانی شەستەکاندا لەو پەیمانگەیەدا قوتابیی ئەو بووە و لای ئەو خوێندوویەتی.

بە پێی ئاگاداریی جۆیس بلاو، لە ماوەی سالانی ١٩٦٩ – ١٩٧٤ ژان پییێر ڤیەنۆت -Jean Pierre VIEN

NOT دەرسی شارستانیەتی کوردی لەو پەیمانگەیەدا گوتۆتەوە. دوای ئەویش، تۆما بوا.

هەروەها شەهید عەبدولرەحمان قاسملوو، مامۆستایەکی دیکەی ئەو بەشە کوردییە بووە لەو پەیمانگەیەدا لە ماوەی سالآنی ١٩٦٩ ـ ١٩٧٥دا. شایانی باسە، لە سالآنی ١٩٧٦ – ١٩٧٨دا عەبدولرەحمان قاسملوو مامۆستای رەسمیی ئەو بەشە کوردییە بووە[٨].

## خوێندنی کوردی لەم پەیمانگەیەدا ئەمڕۆ

ئەم پەیمانگەیە، کە دەکەوێتە شەقامی لیل Rue de Lille لە گەڕەکی سانت میشێل لە پاریس، ئەمڕۆ، ئەم بەشانەی خوارەوەی لێ دەخوێنرێت (کە هەر یەکەشیان بینایە و نووسینگە و بەڕێوەبەرایەتیی سەربەخۆ و جیاوازی خۆی هەیە):

١- خوێندنی لێکۆڵینەوەی زمان و شارستانیەتی عەرەب (لە عیراقەوە تا مەغریب). پرۆفیسۆر محەمەد ئەرگوون سەرۆکی ئەم بەشەیە.

٢- خوێندنی لێکۆڵینەوەی زمانە ئێرانییەکان. پرۆفیسۆر شارل هنری دی فوشیکوور De Fouchecour سەرۆکی ئەم بەشەیە.

ئەم بەشانەی لێ دەخوێنرێ: فارسی، کوردی، پشتوو (ئەفغانی).

٣- خوێندنی لێکۆڵینەوە تورکییەکان (عوسمانی و تورکیی هاوچەرخ). پرۆفیسۆر بازان Bazan سەرۆکی ئەم بەشەیە.

٤- خوێندنی لێکۆڵینەوە عیبرییەکان.

– هەروەها زمان و شارستانیەتەکانی ئەرمەنی و چینی و ئەفریقیاشی لێ دەخوێنرێت.

بەشی کوردی لەم پەیمانگەیەدا، وەک هەموو بەشەکانی دیکە، دەرچووی قوتابیانی ئامادەیی وەردەگرێت. زۆر جارانیش هەر کەسێکی حەزبکا، لە هەر تەمەنێکدا دەتوانی بخوێنێ. ماوەی خوێندن لەو پەیمانگەیەدا تەنیا سێ ساڵە، دوای ئەوەش دیپلۆمێکی بەرامبەر دیپلۆمی پەیمانگەی ئێمەی پێ دەدرێتLycence.

سالآنە، هەشت تا پازدە قوتابی لە بەشە کوردییەکەی ئەم پەیمانگەیەدا دەخوێنن. بەشی زۆری قوتابییەکان خەڵکی فەرەنسین.

دەرسە گرنگەکان ئەمانەن: زمانی کوردی، شارستانیەتی ئیسلامیIslamologie، جوگرافیا و مێژووی کۆنی ئێران و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. هەموو دەرسەکان (بە ڕێزمانی کوردیشەوە) بە زمانی فەرەنسی دەگوترێنەوە، واتە قوتابی پێویستە زمانی فەرەنسی بەباشی بزانێت. لەبارەی مامۆستاکانیشەوە، ئەمڕۆ، سێ مامۆستای کورد سەرپەرشتیی ئەو بەشە کوردییە دەکەن، ئەوانیش بریتین لە: جویس بلۆ، هەڵکەوت حەکیم، عەبدوڵڵا مەردۆخ، خەسرۆ عەبدوڵلاهی.

خوێندنی بالآ، واتە خوێندنی مەتریز و ماجستێر DEA و دکتۆرا لەم پەیمانگەیەدا ناخوێنرێت. قوتابیی خوێندنی بالآ پێویستە بۆ ئەم مەبەستە بچێت ناوی خۆی لە زانکۆی تایبەت بەم بوارە تۆمار بکات: زانکۆی سۆربۆن، لە پاریسی سێیەم، بەشی ئێراننناسی – کە لە دواییدا باسی دەکەین.

ئەم پەیمانگەیە لە بینایەکی سێ چینیی فراواندایە. ئەرشیفخانە و کتێبخانەیەکی ڕێک و پێک و گەورەی تێدایە،

که زیاتر له سی و پێنج هەزار دەسنووس، بە هەموو زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان، لەوێدا پارێزراون؛ جگە لە نزیکەی پێنج ملیۆن کتێب و نەخشەی جوگرافی و وێنە و ڕۆژنامە و گۆڤار و میکرۆ فیلم و بەڵگەنامەی کۆنی سەدەکانی ڕابردوو بە زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان، یان پەیوەندیدار بە وڵاتانی ڕۆژهەڵات. بە کورتی: من هەر چی شتێکی کە لە کوردستاندا فەوتابوون یانیش دەست نەدەکەوتن، لەوێدا دەمدۆزینەوە.

خوێندنی کوردی لەم پەیمانگەیەدا، سەبارەت بە ناکۆکی و دژایەتی و بەرژەوەندخوازیی مامۆستا کوردەکانی ئەوێ دابەش کراوەتە سەر دوو بەش: کرمانجی، بە ئەلفابێی لاتینی؛ لەگەڵ سۆرانی، بە ئەلفابێی عەرەبی. خەڵکی فەرەنسی و بێگانە نازانن بچن " کام کوردی" بخوێنن: کرمانجییەکە یان سۆرانییەکە؟! فەرەنسییەکانیش هانی ئەم دابەشبوونە دەدەن و پێیان خۆشە کە بەشی کوردی ئاوها دووبەرەکایەتی و ناکۆکیی تێدا بێت و "دوو زمان" بێت ".

بەشە کوردییەکەی ئەم پەیمانگەیە، لە چوارچێوەی ئێراناسیدا دەخوێندرێت، هیچ بەرنامەیەکی تایبەت و سەربەخۆی "نەتەوەیی" نییە. تەنانەت لە ئارشیفخانەکەشیدا دەسنووس و کتێب و میکرۆفیلم و گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان تێکەڵ کراونەتە بەشی فارسی و تورکی. قوتابیی کورد پێویستە بچێ لەناو تورکی و فارسییەکاندا بەدوای بابەتە کوردییەکاندا بگەڕێت. هۆی ئەم نەبوونی سەربەخۆییەش، هۆیەکی سیاسییە. ئەمەش کارێکی خراپی کردۆتە سەر پێشکەوتنی خوێندنی کوردی و لێکۆڵینەوەکانی کوردناسی لە فەرەنسا.

## خوێندنی باڵای کوردی لە زانکۆکانی پاریس

گرنگترین زانکۆ کە خوێندنی باڵای کوردی و لێکۆڵینەوەی کوردناسیی تێدا دەخوێنرێت لە پاریس، بریتییە لە زانکۆی سۆربۆنی پاریسی سێیەم Sorbonne لە گەڕەکی لاتینی، نزیک سانت میشێڵ.

زۆر کەم ڕێک دەکەوێ، کە قوتابی بچێت سەرپەرشتکاری ماجستێر یان دکتۆرا لە دەرەوەی ئەم زانکۆیەدا بدۆزێتەوە.

زانکۆی سۆربۆنی پاریسی سێیەم، ئەمڕۆ، ئەم بەشانەی خوارەوەی لی دەخوێنرێت (کە هەر یەکەشیان بینایە و نووسینگە و بەڕێوەبەرایەتیی سەربەخۆ و جیاوازی خۆی هەیە):

١- خوێندنی باڵای لێکۆڵینەوەی شارستانیەتی عەرەب (لە عیراقەوە تا مەغریب). پرۆفیسۆر محەمەد ئەرگوون سەرۆکی ئەم بەشەیە.

٢- خوێندنی باڵای ئێراناسی. ئەم بەشانەی لێ دەخوێنرێ: فارسی، کوردی، پشتوو (ئەفغانی). پرۆفیسۆر شارل هنری دی فوشیکوور De Fouchecour سەرۆکی ئەم بەشەیە.

٣- خوێندنی باڵای لێکۆڵینەوە تورکییەکان (عوسمانی و تورکیی هاوچەرخ). پرۆفیسۆر بازانBazan سەرۆکی ئەم بەشەیە.

٤- خوێندنی باڵای لێکۆڵینەوە عیبرییەکان.

- هەروەهاخوێندنی باڵای شارستانیەتەکانی ئەرمەنی و چینی و ئەفریقیاشی لێ دەخوێنرێت.

ساڵانە، دوو تا چوار قوتابی لە خوێندنی باڵای ئاستە جیاجیاکانی بەشە کوردییەکەی ئەم زانکۆیەدا دەخوێنن. بەشی زۆری قوتابییەکان: کوردی کوردستانی عێراق و تورکیا، ئنجا قوتابیانی کوردستانی سووریا و ئێرانن. تاک و تەرا قوتابیی غەیرە کورد، فەرەنسی، خوێندنی باڵای کوردی دەخوێنن.

خوێندنی باڵای کوردی Hautes Etudes لەم زانکۆیەدا سێ قۆناغە:

١- مەتریز Maitrise، کە ماوەی خوێندنەکەی ساڵێکە. دەرچووی قوتابیانی ئینالکۆی پاریس INALCO یان قوتابیانی کوردی دەرچووی زانکۆکانی عیراق و ئێران و تورکیا و سووریا وەردەگرێت: بەتایبەتی ئەوانەی بەشی کوردی و ئینگلیزی و عەرەبی و تورکی و فارسی و جوگرافیا و کۆمەڵناسی و ئابووری و ئەدەبیات و زمان و مێژوویان تەواوکردووە. هەر چۆنێک بێت پێویستە بابەتی بروانامەکە لەسەر شتێک بێت پەیوەندیی بە کوردەوە هەبێت. چەند نموونەیەکی باسی مەتریز:

- دەسنووسەکانی مەلا مەحموودی بایەزیدی (١٨٥٦ - ١٨٧٨).
- جلوبەرگی کوردیی کوردستانی ئێران، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و ئەتنۆگرافی.
- مێژووی سەرهەڵدان و پێشکەوتنی چاپخانە لە کوردستاندا و کاریگەرێتی بەسەر پێشکەوتنی ئەدەبیاتی کوردیدا (١٨٩٨ - ١٩٧٠).



قوتابی، بە لای کەمەوە سێ دەرسی سەرەکیی دەبێت، گرنگترینیان: مەنهەجی لێکۆڵینەوە؛ ئەوانی دیکەش مامۆستا سەرپەرشتکارەکەی بۆی دەسنیشان دەکات: بێگومان بەشێوەیەک کە ئەو دەرسانە پەیوەندییان بە بابەتەکەیەوە هەبێت. قوتابی خۆی مامۆستای سەرپەرشتکاری خۆی هەڵدەبژێری، هەر خۆیشی بابەتی مەتریزەکەی خۆی هەڵدەبژێری بەڵام بە راوێژکردن لەگەڵ سەرپەرشتکارەکەی، کە بەدرێژایی ساڵەکە تێبینیی دەداتێ و سەرچاوەی دەخاتە بەردەست. هەر بابەتێکی مەتریز نابێ لە ١٠٠ لاپەڕەی مەنهەجی کەمتر بێت. هەموو دەرسەکان بە زمانی فەرەنسی دەگوترێنەوە، واتە قوتابی پێویستە زمانی فەرەنسی بەباشی بزانێت.

٢- ماجستێر DEA کە کورتکراوەی ئەمەیە Diplome d

Etudes Approfondies، واته دیپلۆمی لێکۆڵینەوە قووڵەکان. ماوەی تەواوکردنی: دوو ساڵە. قوتابیانی دەرچووی مەتریز و دەرچووانی زانکۆ وەردەگرێت: بەتایبەتی ئەوانەی بەشی کوردی و ئینگلیزی و عەرەبی و تورکی و فارسی و جوگرافیا و کۆمەڵناسی و ئابووری و ئەدەبیات و زمان و مێژوویان تەواوکردووە. دیسانەوە پێویستە بابەتی بڕوانامەکە لەسەر شتێک بێت پەیوەندیی بە کوردەوە هەبێت. چەند نموونەیەکی باسی ماجستێرDEA:

- دەستاوەردە تەکنیکییە نوێیەکان لە چیرۆکەکانی کامەران بەدرخان دا.
- مۆنیمۆنتە مێژووییەکانی کوردستانی تورکیا.
- گەشەسەندنی بیری سیاسیی شەریف پاشا: لە رادیکاڵییەتەوە بۆ ناسیۆنالیزم (١٩٠٠ – ١٩٢٣).
- مێژووی رۆژنامەگەریی کوردی (١٨٩٨ – ١٩٥٨).

قوتابی، بە لای کەمەوە سێ دەرسی سەرەکیی دەبێت، گرنگترینیان: مەنهەجی لێکۆڵینەوە؛ ئەوانی دیکەش مامۆستا سەرپەرشتکارەکەی بۆی دەسنیشان دەکات: بێگومان بەشێوەیەک کە ئەو دەرسانە پەیوەندییان بە بابەتەکەیەوە هەبێت. قوتابی خۆی مامۆستای سەرپەرشتکاری خۆی هەڵدەبژێری، هەر خۆیشی بابەتی ماجستێرەکەی خۆی هەڵدەبژێری، بەڵام بە راوێژکردن لەگەڵ سەرپەرشتکارەکەی، کە بەدرێژایی ساڵەکە تێبینیی دەداتێ و سەرچاوەی دەخاتە بەردەست. هەر بابەتێکی ماجستێر نابی لە ٧٠ لاپەڕەی مەنهەجی کەمتر بێت. هەموو دەرسەکان بە زمانی فەرەنسی دەگوترێنەوە، واتە قوتابی پێویستە زمانی فەرەنسی بەباشی بزانێت.

٣- دکتۆرا Doctorat قۆناغی کۆتایی خوێندنی باڵایە، ماوەکەی سێ ساڵە. ئەو قوتابیانە وەردەگری کە ماجستێریان تەواوکردووە، بەتایبەتی ئەوانەی کە لە بواری کوردناسی و لێکۆڵینەوە بەراوردکارییەکاندا (کوردی – بێگانە) ماجستێریان هەیە. چەند نموونەیەکی باسی دکتۆرا:

- سەرهەڵدانی بیری نەتەوەیی کورد (کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم تا ١٩٢٥).
- دینی مەسیحییەت لە کوردستاندا، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی.
- سەرهەڵدان رەگەزی شانۆنامە و پێشکەوتنی شانۆگەری لە کوردستاندا (١٩١٩ – ١٩٥٨).
- کورد لە نووسراوەکانی زانا عەرەبە موسڵمانەکاندا (سەدەی نۆیەم تا سەدەی چواردەهەم).

قوتابی، بە لای کەمەوە سێ دەرسی سەرەکیی دەبێت، گرنگترینیان: مەنهەجی لێکۆڵینەوە؛ ئەوانی دیکەش مامۆستا سەرپەرشتکارەکەی بۆی دەسنیشان دەکات: بێگومان بەشێوەیەک کە ئەو دەرسانە پەیوەندییان بە بابەتەکەیەوە هەبێت. قوتابی خۆی مامۆستای سەرپەرشتکاری خۆی هەڵدەبژێری، هەر خۆیشی بابەتی دکتۆراکەی خۆی هەڵدەبژێری بەڵام بە راوێژکردن لەگەڵ سەرپەرشتکارەکەی، کە بەدرێژایی ساڵەکە تێبینیی دەداتێ و سەرچاوەی دەخاتە بەردەست. هەر بابەتێکی دکتۆرا نابی لە ٣٠٠ لاپەڕەی مەنهەجی کەمتر بێت. دەرسەکان بە زمانی فەرەنسی دەگوترێنەوە و قوتابی پێویستە زمانی فەرەنسی بەباشی بزانێت.

خوێندنی باڵای ئەم بەشە کوردییەی زانکۆی سۆربۆن، لە هەموو ئاستەکاندا، لە چوارچێوەی ئێرانناسیدا دەخوێندرێت؛ هیچ بەرنامەیەکی تایبەت و سەربەخۆی " نەتەوەیی" نییە. لە هەر سی ئاستەکەدا هیچ ئوستاد و پرۆفیسۆرێکی تایبەتمەندی کوردناسی لی نیە، کە بتوانی بەتەواوەتی سەرپەرشتی مەتریز و ماجستێر و دکتۆرای بابەتە کوردییەکان بکات و دەرسیان لەبارە بڵێتەوە. هیچ محازەرە و سیمینار و دەرسێک نییە کە تەرخانکراو بە جوگرافیا و زمان و ئەدەب و ئەرشیتێکتوور و مێژووی کورد بێت. پێویستە قوتابی بچێت لە دەرسی بەشە تورکی و

فـارسی و عـەرەبییـەکـاندا دابنیـشـێت و خـۆی بتـوانێت شـتـێک لەبارەی " ئەوەی پەیوەندیی بە کـوردەوە هەیە" هەڵکرێنێت. مامۆستا سەرپەرشتکارەکەی، لەم بوارەدا ڕێنمایی دەکات.

تەنانەت لە ئارشیفخانەکانیشدا دەسنووس و کتێب و میکرۆفیلم و گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان تێکەڵ کراونەتە بەشی فارسی و تورکی. قوتابیی کورد پێویستە بچی لەناو تورکی و فارسییەکاندا بەدوای بابەتە کوردییەکاندا بگەڕێت.

موحازەرە و دەرسەکانی خوێندنی باڵای کوردی، شێوەیەکی ئازادیان هەیە: قوتابی خۆی هەڵیاندەبژێری، بە پێی بابەتی بڕوانامەکەی و بەپێی تایبەتمەندێتیی بواری خوێندنەکەی؛ بە مەرجێک لە ساڵی یەکەمی ماجستێردا، هەروەها لە ساڵی یەکەم و دووەمی دکتۆرادا هەفتەی لە پێنج دەرس و محازەرە کەمتر نەبێت. لە کۆتایی هەر ساڵێکیشدا ڕاپۆرتێک یان لێکۆڵینەوەیەک بە زمانی فەرەنسی، پێویستە پێشکەش بە لیژنەی سەرپەرشتیکار بکرێت.

قوتابیی مەتریز و ماجستێر و دکتۆرا، پێش ناونووسین، پێویستە لە تاقیکردنەوەی زمان سەربکەوێت، ئنجا دەست بە خوێندن بکات. بەگوێرەی قوتابیانی کوردیشەوە، کە بێگانەن لە فەرەنسا، پێویستە لە کاتی ئامادەکردنی نامەی ماجستێر DEAدا ساڵێک خوێندنی خۆئامادەکردن Preparation بخوێنن. شایانی باسە، هەندێ قوتابیان کە لەم تاقیکردنەوەیەی زمانی فەرەنسی دەردەچن، هێشتا هەر بەباشی فێری نووسینی فەرەنسی نەبوونە، بۆیە دەچن نامەی مەتریز و ماجستێر یان دکتۆراکەیان بە عەرەبی دەنووسن و دەیبەنە لای وەرگێرە عەرەبە مەغریبی و جەزائیرییەکان بۆیان تەرجەمە بکەن!

زانکۆی سۆربۆنی پاریس، ئەرشیفخانە و کتێبخانەیەکی ڕێک و پێک و گەورەی هەیە، کە زیاتر لە ملیۆنێک دەسنووس، بە هەموو زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان، لەوێدا پارێزراون؛ جگە لە نزیکەی بیست ملیۆن کتێب و نەخشەی جوگرافی و وێنە و ڕۆژنامە و گۆڤار و میکرۆ فیلم و بەڵگەنامەی کۆنی سەدەکانی ڕابردوو بە زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان، یان پەیوەندیدار بە وڵاتانی ڕۆژهەڵات. ئەم ئارشیفخانەیە، بە سەر پێنج مەڵبەندی گەورەدا دابەش کراون:

١- ئارشیفخانەی ڤێرسای Versail، کە تایبەتە بە گۆڤار و ڕۆژنامەکان.

٢- کتێبخانەی نیشتیمانیی فەرەنسا Bibliotheque Nationale، کە دەکەوێتە شەقامی ڕوشێلیۆ لە نزیک گەڕەکی شاتلێ.

٣- کتێبخانەی سۆربۆنی سەنتراڵ Sorbonne، لە گەڕەکی لاتینی، شەقامی سوربۆن.

٤- کتێبخانەی ئینالکۆ INALCO، لە شەقامی لیل.

٥- کتێبخانەی سانسیی Censier لە گەڕەکی پاریسی پێنجەم.

ئەو مامۆستایانەی سەرپەرشتیی نامەی مەتریز و ماجستێر و دکتۆرای بەشە کوردییە دەکەن، پێویستە ڕەگەزنامەی فەرەنسییان هەبێت و پلەی پرۆفیسۆرییان هەبێت، یان بەلای کەمییەوە پلەی ئوستادییان هەبێت. هەندی لەو پرۆفیسۆر و ئوستادانەی تا ئێستا سەرپەرشتیی هەندێ لە نامەکانیان کردووە بریتین لە: شارل هنری دی فوشیکوور (تایبەتمەندیی لە شیعری کلاسیکی فارسیدا هەیە)، کریستۆف بەلایی (تایبەتمەندیی لە ڕۆمان و چیرۆکی فارسیدا هەیە)، ڕۆژە لسکۆ (تایبەتمەندیی لە ئەدەبی فارسیدا هەیە)، لۆکۆک (تایبەتمەندیی لە زمانە کۆنە

ئێرانییەکاندا هەیە)، بازان (تایبەتمەندی ئەدەبیاتی تورکی)، جوێس بلۆ (تایبەتمەندی زمان و ئەدەبیاتی کوردی)، هوما ناتق (تایبەتمەندی مێژووی ئێران).

خوێندنی باڵای کوردی و کۆڵینەوە لە زمان و ئەدەب و مێژووی کورد، یان بابەتی کوردناسی -Kur dologie بەشێوەیەکی گشتی، لە فەرەنسا (لە زانکۆی سۆربۆن) وەک بەشێکی تایبەت و سەربەخۆ ناخوێنرێت؛ تووڕ هەڵدراوەتە نێو بەشی ئێرانناسی و لێکۆڵینەوەکانی فارسی و تورکناسی و عەرەبناسییەوە. هۆی ئەمەش، لە بنەڕەتدا، هۆیەکی سیاسییە: کورد تا ئێستا هیچ قەوارەیەکی سیاسی و سەربەخۆی نییە تا بتوانی کادیرانی خۆی و پرۆگرامێکی تایبەتی خۆی، لە چوارچێوەی شارستانیەتێکی سەربەخۆدا، بسەپێنێ.


دزینی کەلەپووری رۆژهەڵات

قوتابیی ماجستێر و دکتۆرای کورد پرۆفیسۆری سەرپەرشتکاری پسپۆڕی نییە، دەبێ بچێتە لای پرۆفیسۆرێکی عەرەبناس و فارسناس یان تورکناس بۆئەوەی سەرپەرشتیی تێزەکەی بکات. تەنانەت بۆ دەسنووس و سەرچاوەکانیش هەر دەبێ بچێت سەرچاوە عەرەبی و تورکی و فارسییەکان بپشکنی یان ئەوانەی پەیوەندییان بە عەرەب و فارس و تورکەوە هەیە. ئارشیفی کورد و بەڵگەنامەکانی کوردستان جیانەکراونەتەوە: یەکانگیر و ئاوێتەی، یان راستتر بلێین تۆواوەی ئەوانی تورک و عەرەب و فارسن.

بەم شێوەیە، ئەم هۆکارە سیاسییە کارێکی خراپی کردۆتە سەر رەوتی پێشکەوتنی زانست و لێکۆڵینەوەکانی کوردناسی لە زانکۆکانی فەرەنسا و ناوەندە رۆشنبیرییەکانی ئەم بوارە.

## زەماڵەی حکوومەتی فەرەنسی بۆ قوتابیانی کورد

حکوومەتی فەرەنسی، لەپێناو بڵاوکردنەوەی زمان و کولتووری فەرەنسی بە دنیادا و هاندانی نەتەوەکانی سەرزەمین بۆئەوەی زمانی فەرەنسی فێر بن و نزیک بکەونەوە لە سیاسەت و کولتووری فەرەنسی، هەموو ساڵێک ژمارەیەک زەماڵەی خوێندن دەبەخشێتە قوتابیانی وڵاتانی جیهانی سێیەم. زەماڵە، یان بوورس Bourse، واتای ئەوە دەگەیەنی کە قوتابی بەدرێژایی ماوەی خوێندنەکەی، لەسەر حسابی حکوومەتی فەرەنسی دەژیت و دەخوێنێ.

حکوومەتی فەرەنسا، لەبەرئەوەی کورد دەوڵەتی نییە، ئەنستیتووی کوردی پاریسی، هەڵبژاردووە بۆئەوەی ئەو زەماڵانە بەسەر قوتابیانی کورددا دابەش بکات. کەواتە ئەنستیتووی کوردی پاریس، کە تەنیا مەڵبەندێکی رۆشنبیری و ئارشیفی و بڵاوکردنەوەی چاپەمەنییە، هیچ جۆرە خوێندنێکی لێ ناکرێ. لەم رووەوە ئەرکی تەنیا ئەوەیە کە قوتابیانی داواکاری زەماڵە هەڵبژێرێت بۆئەوەی بچن لە زانکۆکاندا بخوێنن.

بەم شێوەیە، ئەنستیتووی کوردی پاریس، ساڵانە، بیست زەماڵە بەشێوەیەکی یەکسان بەسەر قوتابیانی کوردی هەر چوارپارچەکەی کوردستاندا دابەش دەکات. بەپێی ئەو زەماڵانە، قوتابیی کورد دەتوانێ بچێ لەسەر حسابی حکوومەتی فەرەنسی لەم وڵاتانەدا بخوێنێ: فەرەنسا، ئیسپانیا، هەنگاریا، یۆنان، ئەمریکا.

سەرەتای دەسپێکردنی داخوازییەکانی قوتابیان، هەمیشە لە مانگی شەشەوە دەست پێدەکات. قوتابی پێویستە ئەم بەڵگەنامانە بۆ ئەنستیتوو بنێرێت:

١- فۆتۆکۆپیی رەگەزنامە (جنسیە) یان هەویەی ئەحواڵی مەدەنی.

٢- فۆتۆکۆپیی بڕوانامەی زانکۆ (بە نمرەکانییەوە بێت باشترە).

٣- فۆتۆکۆپیی پەساپۆرت.

٤- فۆرمی پڕکردنەوەی زانیاری، کە بریتییە لە دۆسیەیەکی چوار لاپەڕەیی. پێویستە لە ئەنستیتووی کوردی پاریس داوا بکرێت و پڕبکرێتەوە.

- هەر یەکێک لەم بەڵگەنامانە لە دۆسیەکەی نوقسان بێت، داواکارییەکەی، بێ سەیرکردن و دەمودەست، رەت دەکرێتەوە. تەزویریش زۆر زوو کەشف دەبێت.

لە مانگی نۆدا، لیژنەیەک، کە لە کۆمەڵێک مامۆستای زانکۆ و پرۆفیسۆر و شارەزا پێکهاتووە، دادەنیشن لە دۆسیەی قوتابییە داواکارەکان دەکۆڵنەوە. ئەم خاڵانەی خوارەوە رەچاو دەکرێن لە هەڵبژاردنی هەر قوتابییەکدا:

١- نمرە و کۆی نمرەکان. قوتابی نمرەی دەرسەکانی کەم بێت وەرناگیرێ.

٢- ئەو قوتابیانەی دەیانەوەی خوێندنی باڵا بخوێنن لەپێشتر دادەنرێن لەچاو ئەوانەی دەیانەوێ لە زانکۆ بخوێنن.

٣- ئەو قوتابیانەی دەیانەوێ لە بەشی زانستە مرۆڤایەتییەکاندا بخوێنن (دەرچووانی کۆلێژی ئاداب و قانوون و سیاسەت و ئابووری) بە لەپێشتر دەزانرێن لەچاو ئەوانەی دەیانەوێ لە زانستە تەجریدییەکان بخوێنن (پزیشک و ئەندازیاری و زانستەکان).

٤- کچ بە لەپێشتر دەزانرێت.

- هەموو تەزویرێک زوو کەشف دەبێت.

لە کۆتایی مانگی نۆ و سەرەتای مانگی دە دا ئەنجامەکان رادەگەیەنرێن. بە نامە یان بە فاکس قوتابییەکان ئاگادار دەکەنەوە. بۆیە قوتابی پێویستە ناونیشانێکی بەردەوام و چاک بداتە ئەو ئەنستیتووە.

له کاتێکدا وەڵامی پۆزەتیفی پێدەگات، یەکسەر دەبێ خۆی بگەیەنێتە سەفارەتی فەرەنسی لە وڵاتێکدا بۆئەوەی ڤیزەی فەرەنسا وەربگرێت و سەفەر بکات. کە دەشگاتە پاریس، یەکسەر پەیوەندی بەو ئەنستیتووە کوردییەوە بکات لە گەڕەکی پاریسی دەیەم، شەقامی لافایەت، ژمارە ١٠٦.

Institut Kurde de Paris,106 Rue La Fayayette, Paris 10me.

### ئیمتیازاتی زەماڵە

١- بەدرێژایی ساڵانی مەتریز، ماجستێر و دکتۆرا، قوتابی لەسەر حسابی حکوومەتی فەرەنسی دەخوێنێت.

٢- هەر ساڵەی جارێک دەتوانی سەفەرێکی زانستی بۆ وڵاتێک بکات، لەسەر حسابی حکوومەتی فەرەنسی، بە نیازی پشکنین و تۆژینەوە لە کەرەستەکانی بابەتی لێکۆڵینەوەکەی. خواردن و هوتێل و هەموو مەسرەفێک (تەنانەت پارەی فۆتۆکۆپی هەر لاپەڕە و کتێبێکیش) دەکەوێتە ئەستۆی حکوومەتی فەرەنسی.

٣- لە دووەم ساڵدا دەتوانێ سەفەرێک بۆ وڵاتی خۆی بکاتەوە، لەسەر حسابی حکوومەتی فەرەنسی.

٤- لە کاتی چاپکردنی بڕوانامەکەیدا کۆمپیوتەرێکی پێشکەش دەکەن بۆ خۆی، بۆ چاپکردنی نامەی ماجستێر و دکتۆراکەی.

٥- هەر نەخۆشییەکی تووش ببێت (تەنانەت عەینەگ دروستکردنیش) لە ماوەی ئەو ساڵانەدا لەسەر ئەرکی حکوومەتی فەرەنسی دەبێت.

٦- دوای تەواوکردنی خوێندنی دکتۆرا، بۆ ماوەی دوو ساڵ ئابوونەت دەبێت لە پێگەیشتنی گۆڤارێکی بواری خوێندنەکەی خۆت.

٧- زۆر جاران ڕێگەش دەدرێت کە قوتابیی کورد داخوازیی پەساپۆرتێکی فەرەنسی بکات، واتە مافی پەناهەندەیی پێ بدرێت.

### سەرچاوەکان:


١: فؤاد افرام البستاني: دائرة المعارف الاسلامية، مجلد ١٢، بيروت: ١٩٧٧.ل ١٩.

٢: فؤاد افرام البستاني: هـ. س. ل ١٩.

3- La decouvert dec la terre, Bibliopthеque Nationale, Paris: Mai 1979, P. V-1.Guerog ABGARIAN: L armenologie en France, in CRDA, No 80, PariS :4 Janvier1984. P. 23-33.

٥: فؤاد افرام البستاني: هـ. س. ل ٢٠.

6- Pierre-Amedee JAUBERT: Voyage en Armenie et em Perse fait dans les annees 1805 et 1806, Paris: 1821. Ed. 1860.

7- Joyce BLAU: Le probleme Kurde, Bruxelle: 1963.

٨: د. عبدالله حداد: تدريس اللغة الكردية في المعهد الوطني في باريس، كاروان، ژ ٤٩، س ١٩٨٦، ل ١٢٠ - ١٢٨.

# کچی کا فرۆش

تابلۆی (کچی کـافـرۆش) بە کـەرەسـتـەیەکی دانسـقـە دەژمـێـردرێت بۆ
دەستنیشـان کردنی سەرچاوە کوردەوارییـەکانی چێژی خەڵک بۆ جوانی
و جوانیی ئافـرەت، هەروەها بۆ لێکـۆڵـینەوە لە مـێژووی ئێسـتـاتیکا و
هونەری نیگارکێشان لە کوردستاندا.

لەم چەند دێڕەی خـوارەوەدا چەند پرسـیـارێک لەم تابلۆ (تەڵزمـاوی) و فـەرامـۆش کـراوەوە هەڵدەهێنجـێنین و رووبەڕووی مەیدانی هونەری و رەخنەی هونەریی شێوەکارییان دەکەینەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێ زەمینەی ئەفسـانەیی و بوعدی نەتەوەیی و کەلتووریی ئەم تابلۆ دانسـقەیە رووناک ببێـتـەوە، لە کۆتاییـشدا بتـوانین شـوێن و پایەی راستەقینەی ئەم تابلۆیە لەریزی کارە هونەرییەکانی مێژووی رەسمی کوردەواریدا دەستنیشان بکەین.

### ئەفسانەیەک

(کـچی کـافـرۆش) بەلای کـەمـیـیـەوە لـە کـوردەواریدا پێش ئەوەی تابـلـۆیەک یان بەرهەمـێـکی هونەریی رەسم بێت، ئەفسانەیێکە، چیرۆکێکە، تەنانەت چیرۆکێکی – هەندێ کەس دەڵێن: واقیعیش! ئەم چیرۆکە ئەفسانەیییەی کچی



کافرۆش، وەک گەلێ چیرۆکی میللی دیکە، چەندین گێڕانەوەی جۆراوجۆر لەیەکتر جیاوازی هەیە.

گرنگترین ئەو گێڕانەوە جۆراو جۆرانەش لەسەریەک هێڵی بەیانی دیاریکراودا یەک دەگرنەوە: گوایە ئەم کچی کافرۆشە، کچێکی کورد بووە، زۆر جوان و دڵگیر و سەرنجڕاکێش. کاتێ ئینگلیزەکان هاتوونەتە کوردستان (لە ساڵی ١٩١٨ بەو لاوە) حەزیان لێی کردووەو لەگەڵ خۆیان راپێچیان کردووە، واتە رفاندوویانە، هەندێ لەو چیرۆکانە باسی ئەوەش دەکەن گوایە کچی کافرۆش، لەکاتی ئەوەی لەناو تەیارەدا بووەو رفێنراوە، خۆی لەتەیارەکەوە فرێ داوە بۆ ئەوەی نەبێتە ئەسیری دەستی (چەپەڵی) ئینگلیز. ئیتر ئەم رووداوە بۆتە چیرۆکێکی ئەفسووناوی و دەماو دەم گوتراوەتەوە.

### سەرچاوەیەکی ئیلهام

ئەم کارەساتە دڵتەزێنەی بەسەر کچی کافرۆشدا هاتووە، لە ئاکامدا بۆتە ئیلهامی نیگارکێشەکانی رۆژهەڵات، تەنانەت هەندێک لە نیگارکێشەکانی رۆژئاواییەکانیش - کاتێ بە کارەساتەکەیان زانیوە، بەهرەیان لێ وەرگرتووەو رەسمی ئەو کچە کافرۆشەیان (لە تابلۆی نیگار کێشە کوردو رۆژهەڵاتییەکان) وەرگرتووەو سەرلەنوێ بەشێوازی خۆیان رەسمیان کردووە. ئەم لێکدانەوەیەی سەرەوەمان، دەشێ رێی تێ بچێ کە راست بێ، چونکە: عادەتێکی باوی نیگارکێشە کۆن و کلاسیکەکان بووە کە رووداوێکی مێژوویی یان بەسەرهاتێکی کۆن وەربگرن و لە تابلۆیەکدا دایبڕێژن، بۆ بەڵگەی ئەم قسەیەش گەلێک نموونەی لەم جۆرە بابەت و تابلۆیانە دەبینین، وەک: (حەزرەتی ئیمامی عەلی، بەخۆی و شێرو شیرە زولفوقارەکەی، کە تا ئێستاش بە دیواری گەلێک لە ماڵەکاندا هەڵواسراوە)، (خورشیدو خاوەر)، (شیرین و فەرهاد)، یان رووداوە ئەفسووناوییەکەی سەربڕانی حەزرەتی ئیسماعیل بە دەستی حەزرەتی ئیبراهیم.

ئەم عادەتە، تەنانەت لای نیگارکێشە کلاسیکییەکانی ئەوروپاش دیاردەیەکی باو و بڵاوبووە. بۆ نموونە هونەرمەندێکی فەڕەنسی بەناوی لۆبران lebrin لە سەدەی (١٧)مدا، هونەرمەندێکی ئەڵمانی بەناوی ئەلبرێشت ئەلتدۆرفێر A.Altdorfer، هەروەها نیگارکێشی ئیتاڵی بەدیوار بەندێکی گەورەی سیرامیک وێنەی شەڕەکەی ئەسکەندەری مەقەدۆنی و داریووش پاشای ئێرانیان کێشاوە، کە بەشەڕی ئەربێللا بەناوبانگە. لەوانەیە ئەم کچی کافرۆشەش، بەهەمان شێوە، بە پەڕە مووچی نیگارکێشێکی رۆژئاوایی رەسم کرابێت، بە تایبەتیش لەبەرئەوەی زۆربەی ئەو رەسمانەی کچی کافرۆش لە ئەڵمانیاو بەریتانیا چاپ و بڵاو کراونەتەوە.

### یەک چیرۆک و سەدان تابلۆ:

حەکایەتی کچی کافرۆش، بێگومان تابلۆکە- خۆیشی، لای گەلانی تورک و فارس و عەرەبیش هەیە، تورک و تورکمان پێی دەڵێن (سامانچی قزی- Samanci gizi، عەرەبیش وا بزانم پێی دەڵێن (بنت الحدباء) یان (فاتیمە)ی پێ دەڵێن.

دیارە تورک و گەلانی دیکەی رۆژهەڵات، هەریەکەی، ئەم کچی کافرۆشە بە کەلەپووری نەتەوەیی خۆی لەقەڵەم دەدات، تەنانەت عەرەبەکانی عێراق دەڵێن گوایە ئەم کچی کافرۆشە خەڵکی شاری (عیمارە) بووە. هەندێ لە هونەرمەندە کوردەکانیش، لەوانە هونەرمەندی شارەزاو خاوەن ئەزموون (ئازاد شەوقی) رای وایە کە (سەبارەت بە نەخش و نیگارەکانی جلوبەرگی کچی کافرۆش، واپێدەچێ کە ئەم کچە خەڵکی گورجستان بێت).

بەم شێوەیە، لەئەنجامی ئەوەی کە چیرۆکە ئەفسووناوییەکە، وەک کارەساتێکی دڵتەزێنی مێژوویی، بە هەموو

مەڵبەندەکانی رۆژهەڵاتدا بڵاوبۆتەوەو هەر نەتەوەیەک بە کەلەپووری نەتەوەیی خۆی دەزانێ و تەنانەت (سەدای) کارەساتەکە گەیشتۆتە ئەوروپاش، بۆیە دەبینین دەیان نیگارکێشی کوردو عەرەب و فارس و گورجی و تورک و ئەوروپییش، بەدەیان شێوەو شێواز، بەدرێژایی ساڵانی ١٩٢٠-١٩٥٠ ئەم تابلۆ ئەفسووناوییەیان دووبارەو سێ بارە رەسم کردۆتەوە، بەشێوەیەک کە ئەمڕۆ زۆر ئەستەمە بزانین یەکەم نیگارکێشی ئەو تابلۆیە کێ بووەو سەر بە چ نەتەوەیەک بووە!

هەموومان دەزانین کە گەلێک لە جامچی و دارتاشەکانیش وێنەی ئەو کچە کافرۆشەیان، لەپاڵ ئەسپی بوراقەکان، لەسەر ئاوێنەو سەندوق و کەنتۆری ماڵە کوردەکاندا رەسم کردووە.

بەم شێوەیە، ئەم چیرۆکە، لە دەیان تابلۆو لای دەیان نیگارکێش، دەیان شێوەو شێوازی جۆراوجۆری هونەریی خولقاندووە لە هەمووشیاندا یەک ئادگارو یەک روخساری هاوشێوە دووپات دەبێتەوە.

### گوندی کافرۆش و عەشیرەتی کافرۆش

لەئاکامی چەند سۆراخێکدا، بۆمان دەرکەوتووە کە گوندێک لە نزیک شارۆچکەی کۆیە هەیە، کە ئەمڕۆ تەختکراوەو ژیانی لێ نەماوە - پێی دەڵێن (گوندی کافرۆش)، هەروەها عەشیرەتێکی کوردیش هەن لە نێوان کۆیەو بیتوێندا دەژین، پێیان دەڵێن، (عەشیرەتی کافرۆش).

لەسەر بنچینەی ئەم دوو تێبینییەوە، ئێمە گریمانەی ئەوە دادەنێین کە لەوانەیە ئەم کچی کافرۆشە خەڵکی ئەو گوندەی نزیک شاری کۆیە بێت (ئەوەش دەزانین کە کچی کۆیی بە جوانی و نازداری بەناوبانگن!) یانیش لەوانەیە ئەم کچە کافرۆشە سەربەعەشیرەتی کافرۆش بن. بەو شێوەیە، ئەگەر (کچی کافرۆش) کورد بێت گریمانەی ئەوەش لە راستی نزیک دەبێتەوە کە یەکەم نیگارکێشێک کە رەسمی ئەو کچەی کردووە، دەبێ نیگارکێشێکی کورد بووبێت!

### مێژوویەکی نادیار

وەک چۆن مێژووی گەلێ لایەنی نەتەوەییمان تا ئێستا نەنووسراوەتەوە، بەهەمان شێوەش، تاکو ئێستا هیچ دێڕێک لەبارەی مێژووی هونەری رەسم لە کوردستاندا نەنووسراوەتەوە، بەم شێوەیە، ئێمە هیچ سەرچاوەیەکمان لەبەردەستدا نییە کە پشتی پێ ببەستین بۆ ساخکردنەوەی ناوی نیگارکێشەکەو ساڵی دروست کردنی ئەم تابلۆ دانسقەیە، بەڵام بەپێی ناوەڕۆکی چیرۆکەکە، دەبێ ساڵی دروستکردنی تابلۆکە هاوکات بێت لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان بۆ دەشتی کۆیەو داگیرکردنی کوردستان لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لە سەرەتای ساڵانی بیستدا، واتە گریمانەی ئەوە دادەنێین کە تابلۆکە لەلایەن نیگارکێشێکی نەناسراوی کورد لە ساڵانی بیست یان سییەکاندا دروست کرابێت!.

### مۆنالیزای کورد

قەڵەوی، تێروپڕیەتی، مەمک قووتی، چاوگەشی، قژ درێژی، رەنگینی جلوبەرگ، ... هەموو ئەم دیاردە فیزیک و هونەرییانە لەگەڵ پێوەرە کلاسیکەکانی چێژی کۆنی کوردەواریدا یەک دەگرنەوەو لە تابلۆ جۆراوجۆرەکانی (کچی کافرۆش)دا لە لایەن هونەرمەندە کوردەکانەوە دووپات دەبنەوە.

تابلۆی کچی کافرۆش چێژی کلاسیکی ئەو سەردەمە کۆنەی هونەرمەندانی کورد روون دەکاتەوە.

تابلۆی کچی کافرۆش چێژی هونەری و جوانیناسیی نەتەوەییانەی ساڵانی بیست و سی و چل و پەنجاکانی کورد

نیشان دەدات. تابلۆی کچی کافرۆش نیشانەی جوانی و هونەرێکی بەرزی کوردەوارییە، هونەری ڕەسم.

ئومێدەوارین لە داهاتوودا نیشانە تەشکیلی و ئێستاتیکییەکانی ئەم تابلۆ دانسقەیە بخەینە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەییبیانەوە.

# سەرهەڵدانی بیری کوردناسی
# لە فەرەنسا

ئەم توێژینەوەیە هەوڵدانێکە بۆ پێشکەشکردنی مێژوویەکی بیبلیۆگرافی لەبارەی سەرهەڵدانی کوردۆلۆژی Kur-dologie (زانستی کوردناسی) لە فەرەنسا، لە سەدەی دووازدەهەمەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم.

هۆی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە ئەوەیە کە تاکو ئێستا هیچ توێژەرێکی کورد بە زمانی کوردی خۆی لە قەرەی نەداوە و باسی نەکردووە. هەر ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئاستەنگێک بوو لە بەردەم لێکۆڵینەوەکەمان. بۆیە، لێرەدا جارێ تەنیا ئەوەمان پێ کراوە چەند هێڵێکی گشتی لەبارەی باسەکە دابڕێژین.



نووسەر لەگەڵ مامۆستا (د. جەمال نەبەز)

### دێڕێکی مێژوویی

### لەبارەی بایەخدانی وڵاتی فەرەنسا بە ڕۆژهەڵات

لە سەدەی ١٢مدا، جەنگی خاچپەرستەکان و هێرشهێنانیان بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ داگیرکردنی قودس، لەلایەکی دیکەشەوە بووژانەوەی لێکۆڵینەوە جوگرافی و زانستییەکان لە چارەگی یەکەمی سەدەی ١٣مدا لە ئەورووپا، پاشانیش شەپۆلی موژدەگارەکان بەرەو ڕۆژهەڵات لەپێناو بڵاوکردنەوەی دینی مەسیحی لە ڕۆژهەڵاتدا و بە مەسیحی کردنی جیهان Evangilisation لەنێوان سەدەی ١٢ و ١٣مدا بوونە هۆی ئەوەی کە پەیوەندیی سیاسی و بازرگانی و هاتوچۆکردن لەنێوان فەرەنسا و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا چەکەرە بکات[١].

جەنگی خاچپەرستەکان لە سەدەی دووازدەهەمدا، لەنێوان ڕۆژهەڵاتی موسڵمان و ڕۆژئاوای مەسیحیدا، لەپێناو

دەستداگرتن بەسەر " خاکی پیرۆز" لە فەلەستین، بە سەرۆکایەتیی سەرکردەیەکی کورد دژ بە سەرکردەیەکی فەرەنسی بوو: سەلاحەدینی ئەییوبیی کورد دژ بە فیلیپ ئۆگەست Philippe Auguste (١١٦٥– ١٢٢٢). شایانی باسە، سەرکردەیەکی ئینگلیزی ناوداریش، ریچارد شێردڵ (١١٩٩ – ١١٥٧) Richard Coeur de lion لەو شەڕەدا لایەنگیری فەرەنسا بوو.

کەواتە پەیوەندیی نێوان فەرەنسا و کورد لەم جەنگە دینییە دێرینەی سەدەی دووازدەهەمەوە دەست پێدەکات، کە چەندین چیرۆکی ئەفسانەییشی لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی و فەرەنسیدا دروست کردووە. چیرۆکی ئەفسانەیی فەقێ ئەحمەدی دارەشمارە و کیگانی "فەرەنگ" لە فۆلکلۆری کوردیدا بەرهەمی ئەم پەیوەندییە دێرینەی نێوان کورد و فەرەنسایە. کوردناسی ئینگلیز، مستەر ریچ C. J. RICH، لە گەشتنامە ناودارەکەی خۆیدا لەبارەی کوردستان Narrative of a Residence in Koordistan چاپی لەندەن: ١٨٣٦، ئەم چیرۆکە ئەفسانەییەی بۆمان گێڕاوەتەوە و مێژوونووسی ناسراوی کورد، محەمەد ئەمین زەکی بەگ، لە لاپەڕە ٥٤ – ٥٩ ی کتێبی (تاريخ السليمانية و انحائها) (تەرجەمەی محەمەد جەمیل رۆژبەیانی، چاپی بەغدا: ١٩٥١)؛ ناوەرۆکی ئەم پەیوەندییەی نێوان کورد و " فەرەنگستانی" شێ کردۆتەوە و دەڵێ: دیار نییە ئاخۆ کیگان Kigan، ئەو کچە ئازایەی لەگەڵ فەقێ ئەحمەدی دارەشمارە دەکەوێتە شەڕ و پاشان عەشقەوە؛ ئینگلیزە یان فەرەنسییە؟ هەروەها چیرۆکنووسێکی کوردیش، کامەران بەدرخان، ئەم جەنگەی نێوان سەلاحەدینی ئەییوبی و ریچارد شێردڵی سەرکردەی ئینگلیزی لایەنگیری فەرەنسای، تێکەڵ بە چیرۆکی عەشقی نێوان فەقێ ئەحمەد و کیگانی "فەرەنگ" کردووە و کردوویەتیە کەرەستەی یەکێک لە رۆمانەکانی خۆی، کە بە ناونیشانی (پاشای کوردستان) بە زمانی کوردی نووسیویەتی، پاشان لە ناوەڕاستی سالآنی ١٩٣٠دا تەرجەمەی زمانی فەرەنسی کراوە و لە پاریس چاپ کراوە[٢].

موژدەگارە مەسیحییەکانی ئەورووپا لەنێوان سەدەی ١٢ و ١٣مدا، کە دەیانویست دینی مەسیحی بەناو خەڵکی رۆژهەلآتدا بلاوبکەنەوە، رۆڵێکی گەورەیان لە دروستکردنی ئەو پەیوەندییەی نێوان ولآتانی رۆژئاوا و رۆژهەلآتدا بینی[٣]. یەکەمین گرووپی ئەو موژدەگارە مەسیحییانە، بە سەرۆکایەتیی Aorentin RICOLDO، لە ساڵی ١٢٨٨دا بوو گەیشتنە شاری تەورێز، پاشان بە ناوجەرگەی کوردستاندا چوونە شاری مووسڵ[٤].

لەوانەیە، سەبارەت بە هەمان هۆی دینی و هەمان ستراتیژیەت بووبێ، کە فەرەنسا هەر لە سەدەی سێزدەهەمەوە بایەخی داوەتە دەرس گوتنەوەی زمانە رۆژهەلآتییەکان.

لەبارەی زانستی رۆژهەلآتناسیشەوە Orientalisme، لە فەرەنسا، بەشێوەیەکی رەسمی، لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمەوە شێوەی خۆی وەرگرت و رسکا. ئەوە بوو لە ساڵی ١٥٣٠دا لە پاریس کۆلێژی شاهانە College Royal لە سەردەمی فرانسوای یەکەمدا کرایەوە و لەو کۆلێژەدا دەرسی زمانی یۆنانی و عیبری دەگوترایەوە.

هەر لە هەمان سەردەمدا، لە ئەنجامی پێشکەوتنی بازرگانیی نێوان رۆژهەلآت و رۆژئاوا، پەیوەندیی دیپلۆماسی و سیاسیی نێوان فەرەنسا و ولآتانی رۆژهەلآت پەرەی سەند. لە سەدەی ١٦م بەملاوە، فەرەنسا باڵوێزخانەی خۆی لە پایتەختەکانی دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویی ئێراندا کردەوە[٥]. ئەمە کارێکی باشی کردە سەر پێشکەوتن و زیاتر بوونی بایەخدانی فەرەنسا بە نەتەوە و ولآتانی رۆژهەلآت.

ئەگەر دەوڵەتی عوسمانیی سالآنی سەدەی چواردەهەم تا شازدەهەم تەماشا بکەین، دەبینین: ٤٤٩ گەڕیدە لە هەموو دنیاوە لە ماوەی سەدەکانی ١٤م تاکو سەدەی ١٦م چوونەتە دەوڵەتی عوسمانی، ژمارەی زۆرترین ئەو گەڕیدانەش کە لەو سەردەمانەدا چوونەتە شوێنی ناوبراو، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

ئیتاڵییەکان: ١٣٦ کەس.
ئەڵمانییەکان: ٨٠ کەس.
فەرەنسییەکان: ٤٣ کەس.

بەپێی ئەم لیستەیەی سەرەوە، واتە بە بۆچوونی ستێفان ییراسیمۆس Stephan YERASIMOS کە تێزێکی دکتۆرای ٥٦٠ لاپەڕەیی لەسەر ئەم بابەتە لە زانکۆی سۆربۆن پێشکەش کردووە: فەرەنسییەکان سێیەم نەتەوەن لە دنیادا لەرووی بایەخدانیان بە رۆژهەلات[٦]. بازرگان و گەڕاڵە فەرەنساییەکان لە ساڵی ١٥١٠ بەملاوە پەیتا پەیتا سەفەر دەکەن بەرەو رۆژهەلات، بە تایبەتیش بەرەو ئەسفەهان و ئەستەمبۆڵ و تەوریز و تەرابزۆن. لە هەمان ئەو ماوەیەدا، لەسەر داوای ئەو فەرەنسییانەی دەچوونە ولاتانی رۆژهەلات، دەوڵەتی فەرەنسا قوتابخانەیەکی لە ئەستەمبۆڵ دامەزراند بۆ پێگەیاندنی قوتابیان لە بەشی تەرجەمەدا. ئنجا لە سەدەی ١٧مدا لێکۆڵینەوەی رۆژهەلاتناسی لە پاریسدا فراوانتر بوو، ژمارەی مامۆستا رۆژهەلاتناسەکان و زمانزانەکان زیاتری کرد. لە ساڵی ١٧٧٤یشدا، کۆلێژی شاهانە College Royal بەشێکی تایبەتی بۆ فێربوونی زمانی تورکی و فارسی کردەوە. پاشان لە ساڵی ١٧٩٥دا قوتابخانەیەکی تایبەت بە زمانە رۆژهەلاتییەکان بە ناوی قوتابخانەی زمانە رۆژهەلاتییەکان Ecole des Langues Orientales لە پاریس دامەزرا؛ فارسی و تورکی و عەرەبیی تێدا دەخوێنرا[٧].

کرانەوەی ئەم قوتابخانەیە لە پاریس لە ساڵی ١٧٩٥دا یەکەم هەنگاوی گرنگ بوو بەرەو رێگای بیرکردنەوە لە دامەزراندنی بەشێک بۆ ناساندنی زمان و ئەدەبیات و مێژووی کورد لەناو ئەو قوتابخانەیەدا لە داهاتوودا، واتە لە سەدەی نۆزدەهەمدا. پییێر - ئامێدی ژووبێرت Pierre-Amedee JAUBERT ١٧٧٩- ١٨٤٧، کە دیپلۆماتێکی ناوداری فەرەنسییە و کتێبێکی بایەخداری لەبارەی کوردستانەوە بە ناونیشانیVoyage en Armenie et en Perse لە ساڵی ١٨٢١ لە پاریس بڵاوکردۆتەوە، دەرچووی ئەم قوتابخانە ناوبراوەیە.



**ئەو سەرچاوە فەرەنسییانەی تا سەدەی حەڤدەهەم لەبارەی کوردەوە نووسراون**

سەرچاوەکانی کوردناسی لە فەرەنسای سەدەکانی پێش سەدەی حەڤدەهەمدا، تەنیا چەند لاپەڕە یان نیوە فەسڵێکی سەفەرنامەی گەڕاڵەکان بوونە. لاپەڕە دەگمەنەکانی ئەم سەفەرنامانە، سەرەڕای هەموو شتێک، دەکرێ ببنە سەرچاوەیەکی سەرەتایی بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد و وڵاتی کورد[٨].

ئەو سەفەرنامانەی لەلایەن فەرەنسییەکانەوە بڵاودەکرانەوە، تا ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەم هیچ یەکێکیان تایبەت نەبوون بە کورد؛ بەڵکو باسی وڵات و نەتەوەکانی عەرەب و تورک و فارسیان دەکرد: تەنیا چەند لاپەڕەیەک یان ئەوپەڕی فەسڵێکیان تەرخان کردبوو بە کورد. لە زۆربەی ئەم سەرچاوانەدا، ناوی کورد وەک رەوەند و هۆز و کۆمەڵە خەڵکێکی ئێتنی هاتووە، نەک وەک نەتەوەیەک یان میللەتێکی خاوەن دەوڵەت. لە هەموو ئەو نووسراوانەشدا، ناوی کورد و کوردستان بە شێوەی Courde و Courdistan نووسراوە؛ واتە: بە C نەک K.

لەو سەردەمانەدا بابەتی کورد و کوردناسی لە ئێرانناسی Etudes Iraniennes جودا نەبۆوە چونکە لە لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ئەم بوارەدا " زاراوەی ئێران واتای سیاسی و قەوارەی دەوڵەتی نەدەگەیاند". گرووپی ئێرانی وەک گرووپی سلاڤی یا لاتینی یا جەرمەنی بەکاردەهێنرا، هیچ پەیوەندییەکی بە سیاسەت و دەوڵەت و چارەنووسی نەتەوەییەوە نەبوو.

لەو رۆژهەڵاتناسانەی کە تاکو سەدەی حەڤدەهەم روویان کردۆتە وڵاتانی رۆژهەڵات و چەند دێڕێک یان چەند لاپەڕەیەکیان بە زمانی فەرەنسی لەسەر کوردستان نووسیوە، ئەمانەن:

١- گریگۆری پالاماس، Gregoire PALAMAS، فەرەنسی بووە، لە ١٢٦٩ لە ئەستەمبوڵ لەدایک بووە. لە ١٣٣٥ لەلایەن تورکەکانەوە لە ئەنادۆڵ دەستبەسەر دەکرێ و لە ١٣٥٩ دەمرێ. ناونیشانی کتێبەکەی ئەمە بووە: (دەسبەسەریی پالاماس لای تورکان) بڕوانە: Anna Philippidisi - Braet: La captivite de Palamas chez les Turcs, in ,, Travaux et Memoire << CRHC de Bywance<< VII, 1979, P. 109-222.

٢- کلۆد بیلیڤر: ١٥٢١.

Claude BELLIEVRE: Souvenire de voyage en Italy et en Orient 1521, Publie par Charles PERRAT, Geneve: 1956.

سەری لە کوردستانی تورکیای ئەمڕۆ داوە و باسی شاری بەتلیسی کردووە. ناونیشانی سەفەرنامەکەی (بیرەوەرییەکانی سەفەری ئیتاڵیا و رۆژهەڵات)، لە ١٥٢١دا چاپکراوە.

٣- ژاک گاسووت: ١٥٥٠.

Jaques GASSOT 1547-49: Le discours du voyage de Venise a Constantinople, Paris: 1550. 2me ed. Bourges: 1684.

باسی وان و مووش و بەتلیس و دیاربەکر و مەلاتیە و ئورفەی کردووە. ناونیشانی کتێبەکەی (گێڕانەوەی سەفەرنامەیەک لە ڤینیزەوە بۆ ئەستەمبوڵ). لە ١٥٥٠دا چاپ کراوە.

٤- پی-یر بیلون: ١٥٥٣.

Pierre BELON 1547- 1549: Les observations de plusieurs singlaritez et cheses memorables trouvees en Grec, Asie, Paris: 1553, 5e ed. Paris: 1588.

سەری لە کوردستانی تورکیا و سووریای ئەمڕۆ داوە. ناونیشانی سەفەرنامەکەی (تێبینییەکانی کۆمەڵێک شتی بێرهێنەرەوەی یۆنان و ئاسیا). لە **١٥٥٣** چاپ کراوە.

**٥- ژان شیسنۆ: ١٥٥٥. لە ١٧٥٩ چاپ کراوە.**

Jean CHESNEAU 1547-1555: Le voyage de Mr d Araman in, “Leon Menard” , Paris: 1759. Vol. 1er.

باسی دیاربەکر و مووش و خەرپووت و بەتلیس دەکا. لە **١٧٥٩** چاپ کراوە. هەروەها بڕوانە:

Jean CHESNEAU: Le Voyage de Me d Araman in ,,Leon Menard,, 1547-1552, Pieces fugitives pour servir a l Histoire de France, Paris: 1759, Vol. 1er, in Revue Retrospective, T. XIX, 1838, P. 341-71' et 2me livre: Le Voyage de Mr d Araman1553-1555, Publie par M. Ch. SACHERER, Paris: 1887, LXI 295 pages.

باسی کوردستانی تورکیا و سووریای ئەمڕۆ دەکات. ناونیشانی سەفەرنامەکەی (سەفەری مسیۆ ئارامان لە ساڵانی **١٥٤٧-١٥٥٢**).

**٦- فیلیپ دو فرینس کانای: ١٥٧٣.**

Philippe du Frense-Canaye: Le Voyage du levant1573, publie par M.H. HAUSER, Paris: 1897, 332 p.

ئەمباسادۆری فەرەنسی بووە لە ڤینیز، سەری لە ئەنادۆڵ داوە. ناونیشانی سەفەرنامەکەی (سەفەری ڕۆژهەڵات). لە **١٥٧٣** چاپ کراوە.

**٧- ژاک گاسووت . سەفەری دووەم و بەرگی دووەم.**

Jaques GASSOT 1547-1549: Les discours du voyage de Venise a Constantinople, Paris: 1580. 2me livre: Lettre ecrite d Alep, Bourges: 1671.

باسی دیاربەکر و بەتلیس و ئەدەنە و مەڵاتیەی کردووە. لە **١٥٤٧/٢/١٧** ڤینیزی جێهێشتووە بەرەو کوردستانی تورکیا.

**٨- ئابیل پینسان: ١٦٥١.**

Abel PINCIN: Relation d un voyage de Perse 1598 in ,, Claude Barthelemy Morisot: Relations Veritables,, Paris: 1651, T. II, P. 103-58.

چۆتە کوردستانی سووریا و عیراق و ئێرانی ئەمڕۆ: کرماشان، کنگاوەر، جەزیرە، بێستوون. تەرجەمەی ئینگلیزیش کراوە. لە **١٦٥١** چاپ کراوە.

جگە لەمانەش، کتێبە ناودارەکەی گەڕاڵی ئیتاڵی، پیەترۆ دێللا ڤاللا Pietro DELLA VALLA کە لە پاریس لە ساڵی **١٦٦٢**دا بە زمانی فەرەنسی بە ناونیشانی سەفەرە ناودارەکانی پیەترۆ دیللا ڤاللا Les fameux voyages de Pietro DELLA VALLA بڵاوکرایەوە کارێکی زۆر گەورەی کردە سەر بیری ڕۆژهەڵاتناسی و سەرهەڵدانی کوردناسی لە فەرەنسا. کتێبی ناوبراو، لە بەرگی دووەمدا لە بەشی چوارەم باسی گەلی کورد و زمانی کوردی دەکات، دەڵێ:

" کوردەکان زمانی تایبەتی خۆیان هەیە و زمانەکەیان لە زمانی دراوسێ عەرەب و عەجەمەکانیان ناچی ". ئەم کتێبە تەرجەمەی فارسیش کراوە، بڕوانە: پیترو دلاواله: سفرهای مشهور، ترجمه: شجاع الدین شفا، بنگاه ترجمه و نشر کتاب، طهران: **١٣٤٨**.

## کوردناسی لە فەرەنسا لە سەدەی حەڤدەهەم بەملاوە

فەرەنسییەکان – خۆیان دووپاتی دەکەنەوە کە گەڕاڵە فەرەنسییەکان تەنیا لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمەوە بووە کە روویان کردۆتە رۆژهەلات[٩].

موژدەگارەکان Missionnaires لە فەرەنسا یەکەمین ئەو فەرەنسییانەن کە راستەوخۆ کتێب و بەرهەمیان، بەشێوەیەکی تەرخانکراو، لەبارەی کورد و ولاتی کورد نووسیبێت.

موژدەگارەکان ئەو قەشە و ژن و پیاوە دیندارە مەسیحییانەن کە دەناردرانە هەندەران بۆ بە مەسیحی کردنی خەلکی غەیرە مەسیحی. وشەی مسیۆنێر لە مسیۆنەوە Mission هاتووە واتە وەفدێکی نێردراو بۆ جێبەجێکردنی ئەرکێک[١٠].

لە سەدەی حەڤدەهەم بەملاوە، لە فەرەنسا، موژدەگارە مەسیحییەکان، واتە راهیبە دۆمی–نیکی Dominiquins و کاپووسانەکان Les Capussins، پەیتا پەیتا روودەکەنە کوردستان و کتێب لەبارەی زمان و ئەدەبیات و دین و مێژووی کورد بە زمانی فەرەنسی بلاودەکەنەوە[١١].

ئەو پیاوە مەسیحییە فەرەنسییانەی پێیان دەلێن کاپووسان Les Capussins بە یەکەمین ئەو فەرەنسییانە دەژمێردرێن کە لە کاتی رووکردنە رۆژهەلات راستەوخۆ لە کوردان نزیک بووبێتنەوە و هەولیان دابێ زمانی کوردیش فێر بووبن. ئەمەش لە سالی ١٦٣٢ بەملاوە بوو کە یەکەمین کەپووسانە فەرەنسییەکان بۆ بلاوکردنەوەی دینی مەسیحی هاتنە مووسل. لە سالی ١٧٢٤دا یەکێک لە ئەندامەکانیان، لە ئەنجامی سیاسەتی دینپەرستانەی دەسەلاتدارانی ناوچەی مووسل، دەکوژرێت و ئیتر ئەوانیش لە ترسان بۆ ماوەیەک مووسل جێ دەهێلن[١٢].

پوولێ Poullet یەکێکە لەو موژدەگارانە، سەفەرنامەکەی خۆی بە ناونیشانی Nouvelle Relation du Levant لە سالی ١٦٦٨ لە شاری پاریس چاپ کردووە. ئەم سەفەرنامەیە ٤ نەخشەی لەبارەی مەلبەندەکانی کوردستان تێدایە. لە لاپەڕە ٣٤٠ تا ٣٧٦ تەرخان کراوە بۆ کورد.

یەکێک لە رۆژهەلاتناسە ئیتالییەکان کە لە ١٦٨٢دا ماوەیەک لە دەوروبەری مووسل لەگەل ئەو کاپووسانە پیاوە مەسیحییانەدا ژیاوە، دەلێ: " ئێمە لە کاتی پێویستدا دەمانتوانی بەئاسانی خۆمان فێری زمانی کوردی بکەین، ئەمەش لەرێگای بەکارهێنانی قامووس و کتێبی رێزمانی کوردییەوە کە لای ئەو ئابێ پیرە مەسیحییانەدا دەست دەکەوتن. دەمانبینین، پیشانیان دەداین. چونکە ئەوان لە رێگای چوونە ناو خەلکەوە باش فێری زمانەکە ببوون"[١٣].

بە رای ئێمە، ئەم قامووس و کتێبە رێزمانییانەی لە سالی ١٦٨٢دا کە بە زمانی کوردی نووسراون، نابێ بە ئەلفابێی عەرەبیی ئەمڕۆ نووسرابن؛ پێویستە لەو ئارشیفخانەو دۆکیوومەنت خانە کۆنانەدا بۆیان بگەڕێین کە بە ئەلفابێی سریانی و ئەرمەنی نووسراون. ئەمەش لەبەرئەوەی کە لەو سەردەمەدا و لەو ناوچەیەدا زیاتر ئەلفابێی سریانی و ئەرمەنی بەکاردەهات، بەتایبەتیش لەلایەن پیاوە دینییە مەسیحییەکانەوە. کوردناسی فەرەنسی، تۆما بوا T. BOIS، لەم بارەیەوە دەلێ:

" ئەم کتێبانە تاکو ئێستا بلاونەکراونەتەوە، لەوانەشە فەوتابن" [١٤].

یەکێک لەو پیاوە مەسیحییانەی Capussin کە سەفەرنامەکەی خۆی لە سالی ١٦٧١دا لە شاری لیۆن، بە ناونیشانی (پەیوەندییە تازەکانی رۆژهەلات Relations Nouvelles du Levant) بۆمان جێ هێشتووە ناوی Piere Ga-

briel DE CHINON بووە. ناوبراو لەو سەفەرنامە ١٥٠ لاپەڕەییەدا باسی Curdistan و داب و نەریت و دین و ژیانی سیاسیی گەلانی فارس و ئەرمەن و گورجی و لەوانە کوردیش Curde دەکا. هەروەها باسی زەردەشتییەت و شیعەگەری و ئیسلام لە سەردەمی شاعەبباسی سەفەویدا.

جگە لە ئەوان، بە ڕای تۆما بوا Th. BOIS، راهیبە دۆمینیکییەکان دەوریان زۆر بووە لە دامەزراندنی کوردۆلۆژی لە فەرەنسا. وەفدی راهیبە دۆمینیکییەکان و وەفدی مارکیز دوو نوانتێل DE Nointel لە ساڵانی ١٦٧١ و ١٦٧٣دا کۆمەڵێک دەسنووسی رۆژهەڵاتییان هێنایە وڵاتانی ئەورووپا و بەتایبەتیش فەرەنسا؛ ئنجا پاشان زاناکان کەوتنە لێکۆڵینەوە و چاپکردنیان، پاشان وردە وردە کەوتنە سەر فێربوونی ئەو زمانە رۆژهەڵاتییانە لەوانە کوردییش(١٥).

ژان دی ئێڤێنۆت Jean DE THEVENOTTE (١٦٣٣– ١٦٦٧)، لە ١٦٥٥ گەشتێکی رۆژهەڵاتی کردووە. دووەم جار لە ١٦٦٣ هاتۆتەوە رۆژهەڵات. سەفەرنامەکەی، بە ناونیشانی (سەفەر بەرەو رۆژهەڵات Voyage en Ori-ent) لە ١٦٧٤دا لە پاریس چاپ کراوە. نووسەر لە بەشی دووەمی سەفەرنامەکەیدا، لە لاپەڕە ١٠٦ تا ١٣٧ باسی کوردی کردووە(١٦).

گەڕیدەیەکی دیکە بە ناوی Chevalier CHARDIN چەندین سەفەرنامەی لەبارەی وڵاتی فارس بۆ جێ هێشتووین کە باسی وڵاتی کوردیشی تێدا دەکات. یەکێک لە کتێبەکانی، بە ناونیشانی سەفەرنامەی وڵاتی فارس Journal du voyage en Perse، بە فەرەنسی، لە ١٦٨٦ لە لەندەن چاپ کراوە؛ چاپی دووەمیشی لە ئەمستردام لە ١٧٣٥ چاپکراوە. سەفەرنامەکەی، چوار بەرگە. لە بەرگی سێیەمدا لاپەڕە ٤–٩ باسی Kourdistan دەکا، هەروەها لە بەرگی یەکەم و چوارەمیشدا ڕێبوارانە باسی کورد دەکات.

سەفەرنامەکەی شاردان، نەخشەیەکی تێدایە کە ناوی کوردستانیشی تێدا هاتووە، هەروەها چەندین وێنەی جوانی لەبارەی کوردستان تێدایە.

بەڵام گرنگترین سەفەرنامەی سەدەی ١٧م بریتییە لە سەفەرنامەکەی Jean-Baptist TAVERNIER بە ناونیشانی



پۆستکارتێکی فەرەنسی سەدەی نۆزدەم

Les six voyages en Perse، له ساڵی ١٦٧٦ له سویسرا چاپ کراوه. ئەم کتێبه له کاتی بڵاوبوونەوەیدا، دەنگی دایەوە و شۆرەتی وەرگرت.

ژان باپتیست تاڤێرنییێ (١٦٠٥– ١٦٨٩) که له ١٦٣٢دا هاتۆته کوردستان، له کتێبەکەیدا بایەخی ستراتیژیەتی بازرگانی و ئابووریی مەڵبەندی کوردستانمان بۆ روون دەکاتەوە و زۆر بەوردی و فراوانی وەسفی هەموو ئەو رێگا بازرگانییه گرنگانەمان بۆ دەکات که به ناوەڕاستی کوردستاندا تێپەڕدەبن و جیهانی رۆژئاوا به رۆژهەڵات دەبەستنەوە. هەروەها باسی میرنشینی بەتلیسیمان بۆ دەکات و ئەو مێوانداریيەی که لەلایەن میری بەتلیسەوە کراوە. ناوبراو زیاتر له هەشتا لاپەڕەی کتێبەکەی تەرخان کردووە بۆ قسەکردن لەبارەی کوردستانی ساڵانی ١٦٣٠، که ئەو ساڵانەش بۆ مێژوونووسانی کورد چەند لاپەڕەیەکی تاریکن و هیچیان لەبارەوە نازانین.

ژان – پاپتسیت تاڤێرنی Jean- Baptiste TAVERNIER بازرگانێکی فەرەنسی بووە. له ساڵی ١٦٠٥ له پاریس له دایک بووە، واته هاوسەردەمی لویسی چوارەم بووە. ناوبراو، کوڕی بازرگانێکی فرۆشیاری نەخشەی جوگرافی بووە، له ماوەی ساڵانی ١٦٣٢ تا ٦٦٣ دا شەش جاران هاتۆته وڵاتی ئێران و تورکیا، له دووەمین و پێنجەمین سەفەریدا به ناوجەرگەی کوردستاندا تێپەڕیوە و باسی ژیان و شێوەی ژیانی کوردەکانی کردووە. تەنانەت– وەک دەگێڕێتەوە– چووە سەری له شەرەفخانی پاشای بەتلیسیش داوە و له دیوەخانی شەرەفخانی بەتلیسدا میوانداری کراوە. شایەنی باسه، سەردەمی ئەم سەفەرەی TAVERNIER بەرەو کوردستان، هاوکاتە له گەڵ سەردەمی شاعیری گەورەمان ئەحمەدی خانی (١٦٥٠– ١٧٠٦) و مێژوونووس شەرەفخانی بەتلیسی (١٥٩٦) و هەروەها گەشتنامەکەی ئەولیا چەلەبی (١٦٥٥) به کوردستاندا. گەشتنامەی ئەم نووسەره فەرەنسییه، لەپاڵ سەفەرنامەکەی ئەولیا چەلەبی، به یەکێک له گرنگترین و دانسقەترین کتێب له قەڵەم دەدرێن بۆ ساغکردنەوە و لێکۆڵینەوەی مێژووی ژیانی نەتەوەی کورد له سەدەی حەڤدەیەمدا. له سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، ئەم کتێبەی تاڤێرنی گۆشه نیگای بابایەکی روناکبیری فەرەنسایی دەردەخات بەرامبەر کۆمەڵی کوردەواری و مرۆڤی کورد. ئەم کتێبەی تاڤێرنی بابەتێکی تابلێیی گرنگه له بواری لێکۆڵینەوەی کوردناسیی فەرەنسیدا.

نووسەر کاتێ له مووسڵەوە بەرەو هەولێر بەرێ دەکەوێ، دەڵێ «رۆیشتین، گەیشتینه رووبارێکی دیکه بەناوی زابی گەورە، بەسەر پردی رووبارەکەدا پەڕینەوە، ئەو پردەی که به بیست و نۆ قەنتەرەی بەردین Arcade دروست کرابوو. دەیانگوت که ئەسکەندەری گەورە ئەم پردەی دروست کردووە. بۆ ئەوەی خۆی و لەشکرەکەی بتوانن بەسەریدا بپەڕنەوە و هێرش ببەنه سەر داریووش. چارەگه فرسەخێک دوور لەو پردە، بەرەو رۆژ ئاوا دوو زێبار هەبوون که یەکتریان دەگرتەوە و دەڕژانه رووباری دیجلەوە، پردەکەمان بەجێ هێشت. رۆیشتین بەرەو شارۆچکەیەک به ناوی Chirdzoul که کەتبووە سەر گردۆڵکەیەک و له سێ لاوە قوت ببۆوە. پاشایەک لەو شارۆچکەیه هەبوو که ناچاربووین بچین خۆمانی پێ پیشان بدەین بۆ ئەوەی رێگامان بدا که کاروانەکەمان تێپەڕ بێ، ئیتر بنەو بارگەمان لەوێ، لەکەنار زێیەک خست و دوو رۆژان ماینەوە، ل ٢٦٠–٢٦١». «که لەوێوە بەرێ کەوتین، رۆژێکی تەواو به ناو شاخ و داخێکی وشک و برنگدا بەرێوە بووین، بێ ئەوەی هیچ پرووشکه ئاوێک ببینین، بۆ سبەینێ گەیشتینه دەشتێکی خۆش و هەراو، پڕ له دارو درەختی میوه بوو. ئەو دەشته دەشتی ئاربێل Arbeles بوو. ئەو شوێنەی که ئەسکەندەری گەورە داریووشی تێدا شکاند». «ئەو دەشته، پاناییيەکەی نزیکەی پانزده فرسەخ بوو، چەندین جۆگەله و زێباری دەچووە سەر. له ناوەڕاستی ئەو دەشتەدا چیایەکی بچکۆلانه، که نیوه تیرەکەی Circuit نزیکەی نیو فرسەخ بوو، قوت ببۆوە، سەر ئەو شاخه سەرتاپا به داربەڕووی یەکجار قەشەنگ داپۆشرابوو، که من پێشتر هەرگیز

داربەڕووی هێندە قەشەنگم نەدیبوو، لەژێر کەلاوەکانیشەوە قەلایەکی بەرز قوت بیۆوە ئەم قەلایە « خەسلەت و نیشانەکانی، ئەوەیان پیشان دەدا کە وەختی خۆی عیمارەتێکی Editice گەلێک قەشەنگ بووە– ل ٢٦١».

«خەلکی ئەم ولاتە دەلێن کە ئێرە ئەو شوێنەیە کە وەختی خۆی داریووشی لێژیاوە، ئەو کاتەی کە لە شەڕەکەی خۆیدا دژی ئەسکەندەری گەورە شکا» « سی فرسەخێک لەولاتر، لە نزیک چیایەکی گەورەدا، بەلای باکوورەوە پاشماوەی کەلاوەی قەلایەکی دیکە دەبینرا، هەروەها چەند خانوویەک خەلک دەلێن کە داریووش، وەختێ لە شەڕەکەی خۆیدا بەزی، هەندێ لە ژنەکانی خۆی لەوێ دانابوو، ئەو قەلایە دیمەنێکی بەڕاستی قەشەنگ و سەرنجڕاکێشی هەبوو– ل ٢٦١». «سەرچاوە ئاوێک لە دامێنی ئەم شاخەدا هەبوو، دەڕۆیشت فرسەخێک دوورتر دەبوو زێبارێکی ئەوتۆ کە دەیتوانی چەندین بەلەمی قورس لەسەر پشتی خۆی رابگرێت، ئەو زێبارە بەرەو باشوور، بەناو ئەو شاخانەی کە لە باشووردا بوون پێچاو پێچ شۆڕ دەبۆوە، پاشان دوای رۆژە رێیەک بەناو شارێکدا تێدەپەڕی کە ناوی شارەزوور Cherezoul بوو. ئەو شارە پردێکی لە بەرد دروستکراوی لێ بوو کە نۆزدە قەنتەرە Ar-cade ی هەبوو شا عەبباس دوای ئەوەی هاتبوو بەغدای گرتبوو، سێ لەو قەنتەرانەی شکاندبوو ل ٢٦١».

هەم عارەبەکان وهەم کوردەکانیش، هەر دوو لا جار بە جار سێ چوار سوارچاکیان دەنارده سەر دوندی تەپۆلکە بەرزەکان بۆ ئەوەی هەوالی تازە بێننەوە، چونکە هەر وەختێکی بواری هێرش بردنە سەر یەکتریان بۆ برەخسایە، بە پەلە بە خۆیان و ولاغەکانیانەوە رووبارەکەیان بە مەلە دەبڕی، ئەمە شتێک بوو کە من هەر لە سەرەتاوە پێشبینیم کردبوو، ئێمە کە نەماندەویست خۆمان تێکەلّ بەو جۆرە خەلکە بکەین، نۆزدە سەعات رێگەمان بڕی بۆ ئەوەی بتوانین خۆمان لێیان بە دوور رابگرین، ل ٢٩٢»[١٧].

تاڤێرن ی، بە بلاوکردنەوەی سەفەرنامەکەی خۆی، ئاسۆیەکی رووناک و دەرگایەکی گەورەتری لە فەرەنساوە بەرەو کوردستان، بۆ فەرەنسییەکان خستە سەر گازارەی پشت. شایانی باسە، نووسەرێکی وەک مۆنتسکیۆ Montesquieu بەهرەی کتێبە ناودارەکەی خۆی (چەند نامەیەکی فارسی Lettres Persannes)، کە لە سالی ١٧٢١دا بلاوکرایەوە، لەم سەفەرنامەیەوە وەرگرتبوو[١٨].



لە کتێبەکەی (جێمس مۆرییێ)

یەکێک لە گەڕاڵە جەربەزەکانی دیکەی فەرەنسا کە هاتۆتە ڕۆژهەڵات، دو فریزنی Du Fresny، کە لە ساڵی ١٧٠٧دا ماوەیەک لە وڵاتی ئێران Perse و دەوڵەتی عوسمانیدا ماوەتەوە؛ لە سەفەرنامەکەی خۆیدا بە چەند لاپەڕەیەک باسێکی کوردانیشی کردووە.

لە ڕیزی گەڕاڵە فەرەنسییەکانی دیکەی دوای ئەمانە، لە ماوەی سەدەی هەژدەهەمدا، بەرهەمی ئەمانەی خوارەوە لە هەموویان گرنگترن:

Jeseph P. de TOURNEFORT: Relation d un voyage du Levant, Imp. Royale, Paris: 1717, T2, P. 266.

لە بەرگی دووەمی سەفەرنامەکەیدا، کە لە ١٧١٧دا لە پاریس چاپکراوە، بەدرێژی باسی کورد و کوردستان دەکات و بنەچەی کوردان دەباتەوە سەر خالدییەکان. کتێبەکەی، پڕە لە وێنە و نیگاری جوان لەبارەی هەندێ لە شارەکانی کوردستان.

J. OTTER: Voyage en Turquie et en Perse, Paris: 1748. 2 T.

" گەشتێک بەرەو تورکیا و وڵاتی فارس". لە ١٧٤٨ لە پاریس چاپ کراوە. لە بەرگی دووەمدا باسی کوردستان دەکات.

C. F. VOLNEY: Voyage en Syrie et en Egypte 1738-85, Paris: 1787. 2 Vol.

" گەشت بەرەو سووریا و میسر"، لە ١٧٨٧ لە پاریس چاپ کراوە. لە بەرگی یەکەم: ل ٣٤٠ - ٣٤٤، ٣٨٣؛ لە بەرگی دووەم: ل ١٣، ٢٤، ١٢٨-١٣٠، ١٤١، ٣٨٣ - ٣٨٥ باسی کورد دەکات.

OLEARIVS Adam 1600 -1671: Voyagee tres curieux et tres renommez faits en Moscovie, Tartarie et Pers , Leide; 1719.

" سەفەرێکی زۆر سەیر و ناودار بەرەو مۆسکۆ و تاتار و و پێرس "، باسی دیاربەکر و لوڕستان و دەربەند دەکات. تەرجەمەی فەرەنسی کراوە.

سەفەرنامە و کتێبە ڕۆژهەڵاتناسییەکان لە فەرەنسا، بەشێوەیەکی گشتی تا سەدەی نۆزدەهەم، بەشێکی کەمیان تەرخان کراون بە کورد. هۆی ئەمەش، دیارە ئەوەیە کە کورد، بەپێچەوانەی نەتەوە دراوسێکانی خۆی، هەرگیز دەوڵەتێک یان قەوارەیەکی سەربەخۆی بە ناوی خۆیەوە نەبووە: هەمیشە لە چوارچێوەی چەند ویلایەتێکی جۆراوجۆری سەر بە دەوڵەت یان ئیمپراتۆریەتی فارس و عەرەب و تورکدا ژێردەستە ژیاوە، یانیش بەسەر چەند میرنشینێکی سەر بەو هێزە غەیرە کوردانەدا دابەش کراوە: لەژێر ناوی هۆز و عەشیرەت و گرووپێکی ئەتنیکی ناوی هاتووە، نەک وەک نەتەوەیەکی خاوەن دەوڵەت.

بۆیە، ئەگەر بمانەوێ بەدوای ساغکردنەوەی وێنەی ژیانی کورد و نیشتیمانەکەیدا بگەڕێین، پێویستە بچین ئەو لاپەڕە پرژوبڵاوانە هەڵبدەینەوە کە لەبارەی بۆ نموونە " عیراقی عەجەم" یان " جەزیرە" نووسراون، یان لەبارەی " ئازەربایجانی ڕۆژئاوا" و " جیبال" و " ویلایەتی مووسڵ " کە سەر بە ئیمپراتۆریەت و دەوڵەتە غەیرە کوردییەکانی ڕۆژهەڵات بوونە و کوردیان تێدا ژیاوە. بەکورتی: تا سەدەی نۆزدەهەم بەدەگمەن کتێبێکی سەربەخۆ یان تەنانەت فەسڵێکی تەرخانکراو لەبارەی وڵاتی کورد Courdistan و نەتەوەی کورد Courde، وەک نەتەوەیەکی ئەتنیکی سەربەخۆ، لە بەرهەمی ڕۆژهەڵاتناسە فەرەنسییەکاندا دەکەوێتە بەر چاو(١٩).

**سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم**

ئەگەر سەفەرنامە و کتێبی ئەو گەڕالە فەرەنسییانە نەبوونایە، بەشێک لە مێژووی نەتەوەییمان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بەتەواوەتی نادیار و تاریک دەمایەوە(٢٠).

لە سەدەی نۆزدەهەم بەملاوە لێکۆڵینەوە لەبارەی کورد و وڵاتی کورد لە فەرەنسا، واتە لێکۆڵینەوە کوردناسییەکان، بایەخێکی گرنگ و رەواجێکی دیار پەیدا دەکەن. بەڕای میشێل شوڤالیێ Chevalier، کە تۆژەرێکی ئەم بوارەیە، هۆیەکانی ئەم پێشکەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ: " پەرەسەندنی شەپۆڵی گەشت و گەڕانی رۆژهەڵاتناسەکان، هەروەها بۆ پتەوبوون و چاکتربوونی رێگا و بان و تەنانەت رێگا دەریاییەکانیش. جگە لەمانەش دامەزراندنی چەند بونیادێکی ئیداریی تازە لە کاتی راگەیاندنی مەشرووتەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ساڵی ١٨٣٩دا دەوری هەبووە"(٢١).

زیاتربوونی ئەم بایەخدانەی فەرەنسا بە رۆژهەڵات و بە کوردستان لە سەدەی نۆزدەهەم بەولاوە، گەلێک هۆی دیکەی هەیە، لەوانە:

١- داگیرکردنی میسر لەلایەن ناپلیۆن پۆناپارت (١٧٩٨ - ١٨٠١)، پاشان داگیرکردنی جەزائیر لە سەردەمی لویس فیلیپ دا (١٨٣٠ - ١٨٤٨).

ئەم دوو رووداوە، پێویستیی دەوڵەتی فەرەنسای بە وەرگێڕ و زمانزانان و رۆژهەڵاتناسان زیاتر کرد. هەروەها هانی دەوڵەتی فەرەنسای دا کە بیر لە داگیرکردنی وڵاتانی وەک دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانیش بکاتەوە.

٢- پەرەسەندنی پەیوەندییە رۆشنبیری و سیاسیەکانیان، هەروەها پتەوتربوونی بەرژەوەندییە ئابووری و بازرگانییەکانی فەرەنسا لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێران. هەر لەم کاتەشدایە کە چەندین نووسەری گەورەی وەکو



کوردی ئێران

فلۆبێــرت و لامــارتین و پیــێــر لۆتی (١٨٥٠ – ١٩٢٣) و ژیرار دو نێــرڤــال (١٨٠٨ – ١٨٥٥)، لەژێر کاریگەرێتی تەرجەمە فەرەنسییەکەی ئەنتوان گالاند A. GALLAND بۆ کتێبی "الف ليلة و ليلة"دا، دێنە رۆژهەڵات و لە سەفەرنامەکانیاندا واقیعییانە باسی رۆژهەڵات دەکەن.

٣- پەرەسەندنی شەپۆلی بڵاوکردنەوەی دینی مەسیح لە رۆژهەڵاتدا و زۆرتربوونی ژمارەی وەفدی موژدەگارەکان لە کوردستاندا و زیاتر بایەخدانیان بە وڵاتی کورد.

٤- گەشەسەندنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، کە ئەمە سەرنجی دەوڵەتە زلهێزەکانی ناوچەکە و وڵاتانی رۆژئاوای، لەوانە فەرەنساشی، راکێشا بۆ لێکۆڵینەوە لە کوردستان و کۆنترۆڵکردنی.

بەم شــێــوەیە، لە ســەدەی نۆزدەهەم بەمــلاوە، وردە وردە چەندین گــەڕاڵ و بازرگــان و رۆژهەڵاتناس، چەندین سەفەرنامە و کتێبی خۆیان تەرخان دەکەن بە کوردستان و بەشێوەیەکی سەربەخۆ قسە لەبارەی نەژاد و جوگرافیا و زمان و کولتوورر و مێژووی کورد دەکەن.

لە ساڵی ١٨٢٨دا پاشای فەرەنسا، شارڵی دەیەم، ئارشیفخانەیەکی تایبەتی لە کتێبخانەی نیشتیمانیی فەرەنسا دامەزراند و ناوی لێ نا بەشی نەخشە جوگرافییەکان. لەو رۆژە بەملاوە ئەم ئارشیفخانەیە دەستی کردە کۆکردنەوە و دروستکردنی سەدان نەخشەی جوگرافیی جۆراوجۆر کە یارمەتیی گەڕاڵ و جوگرافیاناس و مێژوونووس و رۆژهەڵاتناسەکان بدات بۆ باشتر پەی بردن بە دنیای رۆژهەڵات و ناسینی[٢٢]. لەو رۆژەوە تاکو ئێستا سەدان نەخشەی جوگرافی لەبارەی کوردستان لەو کتێبخانەیەدا پارێزراون.

یەکەم کتێب لە سەدەی نۆزدەهەمدا بڵاوبووبێتەوە بریتییە لە کتێبەکەی ئۆلیڤیێ G. A. OLIVIER، کە باسی کــوردســتــانی تورکیــا و ئێــرانی کــۆتایی ســەدەی ١٨م دەکــات و لە ســاڵی ١٨٠١دا لە پاریس لە چواربەرگدا بە ناونیشانی سەفەرێک بۆ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی Voyage dans l Empire Ottoman بڵاوکراوەتەوە؛ ٥٢٢ لاپەڕەیە و چەندین نەخشەی لەبارەی مەڵبەندەکانی کوردستان تێدایە.

دوای ئەویش، گــەڕاڵێکی فــەرەنســیی دیکە بە ناوی A. De GARDANE لە ســاڵی ١٨٠٧دا لە پاریس سەفەرنامەیەکی بە ناونیشــانی Journal d un voyage dans la Turquie d Asie et la Perse بڵاوکردۆتەوە و باس لە ژیانی کورد لە هەر دوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسی دەکات لە کۆتایی سەدەی ١٨مدا.

پییێر – ئامێدی ژووبێرت Pierre-Amedee JAUBERT (١٧٧٩- ١٨٤٧)، دیپلۆماتێکی ناوداری فەرەنسییە. کوڕە پارێزەرێکی ناودار، قوتابییەکی زرنگی قوتابخانەی زمانە رۆژهەڵاتییەکان لە پاریس Ecole des Langues Orientales، موتەرجیمی ناپلیۆن بوو لە کاتی داگیرکردنی میسر. لە ساڵی ١٨٠٤دا، ناپلیۆن بە وەفدێک دەینێرێت بۆ لای شای ئێران. لە رێگا میری مەڵبەندی بایەزید لە کوردستان – کە ناوی میر محەمەد بوو و ئەو کاتە میرنشینێکی سەربەخۆی کوردیی هەبوو – رێگای لێ دەگری، خۆی و هاورێکانی دەخاتە بەندیخانەی قەڵایەکی مەحکەمی خۆیەوە. هاورێییەتییەکی زۆر بتەو لەنێوان میر محەمەد و ژووبێرت دروست دەبی لەناو بەندیخانەی ئەو قەڵایەدا. پاشان ژووبێرت دەگەڕێتەوە پاریس و لەوێ لەلایەن حکوومەتی فەرەنسییەوە هەموو ساڵێک بەخشیشێکی ساڵانەی بۆ رەوانە دەکات تا ئەو کاتەی دەمرێ. ئەم چیرۆکی هاورێییەتییەی نێوان میر محەمەد و ژووبێرت لەو مەڵبەندەدا دەبێتە ئەفسانەیەک و بەناو خەڵکدا بڵاودەبێتەوە. مەلا مەحموودی بایەزیدی، ئەم '' ئەفسانەیەی'' کردۆتە چیرۆکێک لە کتێبی چل چیرۆکەکەی خۆیدا بۆ ئەلکزەندەر ژابای نووسیوەتەوە[٢٣].

پییێر ژووبێرت، لە سەفەرنامەکەی خۆیدا، بە فراوانی باسی پەیوەندیی نێوان کورد و ئەرمەن، هەروەها لەگەڵ

ئیمپراتۆریەتی فارس و عوسمانی دەکا، هەروەها ژیانی کورد و ئەو ئەزموونە زەحمەتەی کە لای کوردەکان چەشتی[٢٤].

ئنجا لە ماوەی سالآنی ١٨٠٧ تا ١٨٠٩، دوپری A. DUPRE سەفەرێکی بەرەو کوردستان کردووە، یاداشتنامەکانی ئەم سەفەرەی خۆی لە کتێبێکدا بە ناونیشانی Voyage en Perse لە پاریس لە ساڵی ١٨١٩ بڵاوکردۆتەوە. لە بەرگی یەکەمدا لە لاپەڕە ٨٩ – ٩٨ باسی تۆپۆگرافیا و مێژووی کوردستان Curdistanدەکات، لە لاپەڕە ١٠٣ – ١٠٩ باسی یەزیدییەکان دەکات، لە بەرگی دووەمدا لە لاپەڕە ٢٧٥– ٢٧٦، ٤٦٤ – ٤٦٥ باسی کورد Curde دەکات. دوو نەخشەیشی لەبارەی کوردستان تێدایە.

ژ. ڕۆسۆ J. ROUSSEAU کە دیپلۆماسییەکی فەرەنسی بووە و لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا نوێنەری فەرەنسا بووە لە شاری بەغدا، لە ساڵی ١٨٠٩دا لە پاریس کتێبێکی بە ناونیشانی وەسفێکی پاشالیکی بەغدای De-scription du Pachalik de Baghdad بڵاوکردۆتەوە. ناوبراو لەم کتێبەدا باسی شاری هەولێر و هەندێ لە ڕووداوەکانی کوردستانی ئەو کاتە دەکات.

گاسپارد درووڤیل G. Drouville لە ساڵی ١٨١٢ – ١٨١٣دا گەشتێک بە کوردستانی ئێراندا دەکات و گەشتنامەکەی خۆی لە ساڵی ١٨١٥دا بە ناونیشانی سەفەرێک بەرەو ئێران Voyage en Perse لە پاریس بڵاودەکاتەوە. چاپی دووەمی لە ١٨٢٥ بڵاودەکاتەوە و لە بەرگی دووەم، لە بەشی ٣٨، لە لاپەڕە ١٧١ تا ١٩١ باسی کورد دەکات.

لە ساڵی ١٨٥٣شدا، ئەحمەد خانی چوارەمین پاشای میرنشینی بابان سەرێک لە پاریس دەدات و دەبێتە میوانی کوردناسی ناودار، خۆدزکۆ Chodzko. ماوەیەکی زۆر لەوێ دەمێنێتەوە و بەشدارییەکی بچووک دەکا لە گەشەپێسەندنی کوردناسی لە فەرەنسای ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا. ئەحمەدخان و خۆدزکۆ کتێبێک پێکەوە دەنووسن لەبارەی ئەدەبیات و زمانی کوردی کە دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی.

خۆدزکۆ لە پێشەکییەکەدا نووسیویەتی:

" ئەگەر رێککەوت ئەحمەد خانی بۆم نەهێنایەتە پاریس، لێکۆڵینەوەکەم ئەم بەرهەمەی ئێستای لی نەدەهاتە کایەوە"، هەروەها دەڵێ:" دووای ئەوەی لە مانگەکانی ١٨٥٤دا کارەکانمان تەواوکرد، ئەحمەدخان لە ئەستەمبۆڵەوە نامەی بۆ هات و بانگهێشت کرا کە پاریس جێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ ئەستەمبۆڵ"[٢٥].

کتێبی ناوبراو سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ رێنووس و زمانی کوردی و دیالێکتەکانی، سەرچاوەیەکی گرنگی زانیارییە لەبارەی مێژووی نەژاد و زمان و ئەدەبیاتی کوردی.

لەریزی نیگارکێشەکانیش، ژێرۆم و ژێریکۆڵت، دوو نیگارکێشی هەرە دیاری فەرەنسین کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا روویان کردۆتە روژهەڵات و وێنەی کوردانیان کێشاوە. هەروەها ژوول لۆرەنس لە ساڵی ١٨٥٤دا هاتۆتە کوردستان و هەندێ وێنەی دیاردەکانی کوردستانی کێشاوە، وەک بەتلیس و هەندێ گوندی کوردستان و جلوبەرگی کوردی و ئاوی فورات[٢٦].

لە شاعیرەکانیش، لامارتین LAMARTINE شاعیری گەورەی سەدەی نۆزدەهەمی فەرەنسا، یەکەم شاعیری فەرەنسییە کە ناوی کورد لە کتێبەکەی خۆیدا دەهێنێ[٢٧]. دوای ئەو، شارل بۆدلێر، لە کۆتایی هەمان سەدەدا، باسی پەیوەندیی نێوان کورد و حەشیشە دەکات[٢٨].

گرنگترین کەرەستە و ماتێریاڵەکانی لێکۆڵینەوەی کوردناسی، کە کوردناس و گەڕاڵە فەرەنسییەکان لێی دەکۆڵنەوە و دەیکەنە بابەتی تۆژینەوە و شیکردنەوە، ئەمانەن: مێژووی کۆنی کورد، زمانی کوردی و دیالێکتەکانی، کەرەستەی ئەتنۆگرافی، ئارشیتێکتووری کوردستان، نەخشەی جوگرافی، کەرەستەی ئاسەوار و ئارکیۆلۆژی، وێنە و نیگار و گراڤوور، مۆسیقا و فۆلکلۆر و ئەدەبیات، دین و مەزهەبەکانی، دەسنووس، کتێب و بڵاوکراوە و بیبلیۆگرافیا.

بابەتی کوردناسی لە فەرەنسا، لە سەدەی نۆزدەهەم بەملاوە، پەلوپۆ داوێت و بە تەواوەتی گەشە دەسێنی(٢٩).

## سەرچاوەکان:


1- Jean - Paul ROUX: Les explorateurs au Moyan age, ed. Fayard, Paris: 1985, P. 54.

Kamuran BEDIRXAN: Le Roi du Kurdistan, Roman épique Kurde, traduit:2 du Kurde par l' auteur et Adolphe DE FALGAIROLLE, Aux éditions de Trésor du siècle, Paris: 1938?. 84 pages.

٣: لەبارەی مێژووی موژدەگارەکان لە کوردستاندا، بڕوانە ئەم دوو سەرچاوە فەرەنسییە.

–T. BOIS: Cheikh Mansour, Un Dominicain aventurier au Kurdistan vers 1785, Mission Dominicaine en Mesopotamie et au Kurdistan, MS, Paris: 1951. pp. 35-37.

-P. LESOURD: Histoire des missions catholiques, Paris: Lib. de l arc, Paris: 1037. 487 pages.

4 :J. M. MERIGOUX: Un precurseur de dialogue islam-chretian: Frere Ricoldo, R. Th., 4, Paris: 1974.

٥: فؤاد افرام البستاني: دائرة المعارف الاسلامية، مجلد ١٢، بيروت: ١٩٧٧.ل ١٩.

6: Stephan YERASIMOS: Les voyages dans l Impire Ottoman XIVe - XVIe Siecle ), Ankara 1991, 565 P., P. 9 -10.

٧: فؤاد افرام البستاني: هـ. س. ل ٢٠.

8: I. S. VANLY: Les Kurdes et le Kurdistan dans les relations d anciens voyageurs occidentaux XVIe-XVIIIe siecle, KSSE, 1973.

9 :Alain VEQUAUD: Lettres Persans de Montesquieu, ed. Hatier, N. 83, Paris: 1980, P. 13.

10:Dictionnaire Encyclopedique Larousse, Libr. Larousse, Paris: 1979, P. 924.

11 :T. BOIS: L apostolat dominicain aupres des Nestoriens du Kurdistan: Annee Dominicaine, 1953, pp. 160-163.

12 :Michel FABVRE: Theatre de la Turquie, tr. de l Italien par l auteur, Paris, MDCLXXXII, P. 362.

١٣: هەمان سەرچاوە.

14: Thomas BOIS: Les Dominicains a l avant-garde de la Kurdologie au XVIIIe Siecle, Hivum fartrum pracdicaticarum, XXXV, Paris: 1965, P. 267-275.

15 :Thomas BOIS: Les Dominicains a l avant-garde de la Kurdologie au XVIIIe Siecle, Hivum fartrum pracdicaticarum, XXXV, Paris: 1965, P. 267-275.

١٦: شوکور مستەفا: کورد و کوردستان لە نیگای چەند گەڕیدەیەکی رۆژئاواییەوە، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق – دەستەی کورد، بەغدا: ١٩٨١، ل ١٢١ – ١٥٨.

١٧: ئەو بەشەی پەیوەندیی بە کوردستانەوە هەیە لەم کتێبەدا، نووسەری ئەم وتارە تەرجەمەی کوردیی کردووە و لە ژمارە (١٥)ی گۆڤاری مامۆستای کورددا لە ستۆکهۆڵم لە ساڵی ١٩٩٢دا بڵاوکراوەتەوە، لە لاپەڕە ٢٧ تا ٣٦.

18: Alain VEQUAUD: Lettres Persans de Montesquieu, ed. Hatier, N. 83, Paris: 1980, P. 13.

19: T. BOIS: Les Kurdes et leur pays, in Roja Nu, No 56, Sept. 1949.

20: I. S. VANLY: Les Kurdes et le Kurdistan dans les relations d anciens voyageurs occidentaux XVIe-XVIIIe siecle, KSSE, 1973.

21 :Michel CHEVALIER: Les montagnes chretiannes du Hakkari et du Kurdistan septentrional, Publication du Departement de Geographie de l Universite de Paris- Sorbonne, Paris: 1985, P. 300.

22 :La decouvert dec la terre, Biblioptheque Nationale, Paris: Mai 1979, P. V-1.

23 :Alexandre JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860. P. 98-102. .

24: Pierre-Amedee JAUBERT: Voyage en Armenie et em Perse fait dans les annees 1805 et 1806, Paris: 1821. Ed. 1860.

25: CHODZKO: Etudes philologiques sur la langue Kurde - Dialecte de Suolemanie, in Journal Asiatique, No 4, Paris; 1857. 60 pages.

26: Jules LAURENS: Illustration, No 574, Paris: 1854

27 : Alphonse DE LAMARTINE: Voyage en Orient, Hachette, Paris: 1869, Vol. 1, P. 441-446.

28: Baudelaire: Oeuvres complaetes, 2me volume, Gallimard, PariS: 1975

٢٩: نادر کریمیان: منابع کردشناسی در سفرنامەهای فرانسوی، گۆڤاری ئاوێنە، ژمارە ٢٤ - ٢٥، تاران: ١٣٧٥، ل ١٢٠ - ١٢٤.

- جگە لەو سەرچاوانەی کە لە وتارەکەدا ناومان بردوون.

# نامەیەکی کراوە بۆ
# ئەنجوومەنی نیشتیمانیی کوردستان

دوای ڕێز و سڵاو،

لە سەرەتادا، پێزانینی خۆم بەرامبەر بەو هەموو دەسکەوت و کارە خزمەتگوزارییانە دەردەبڕم کە کابینەی نوێی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، بە ڕێبەرایەتیی سەرۆکی حکوومەت، پایەدار کاک نێچیرڤان بارزانی، بۆ گەلی کورد لە کوردستانی عێراقدا، ئەنجامی داوە. هەر لەسەر بنچینەی ئەم باوەڕە پتەوەم کە کابینەی نوێی حکوومەتەکەمان بەتەنگ داخوازییە کولتوورییەکانی نەتەوەکەمانەوە دێت، ئەم پێشنیارە گرنگ و مێژووییییە دەخەمە بەردەم بەڕێزتان، کە هیوادارم لێی بکۆڵدرێتەوە و لە ئاکامدا جێبەجێ بکرێت:

پێشەکی، ئیزنتان لێ وەردەگرم بۆ ئەوەی ئاگاداری جەنابی پایەدارتان بکەمەوە، کە من، ئەم زانیاری و نهێنییانەی لێرەدا پێشکەشتانی دەکەم، لە باخەڵی خۆم دەرم نەهێناون، بەڵکو پشتم بە چەندین سەرچاوەی باوەڕپێکراوی فەرەنسی بەستووە؛ هەرچی دەینووسم، ڕاستە و سەلماوە.

لە کتێبخانەی ئەکادیمیای باڵای زانستیی شاری سانت پێترسبۆرگ (لینینگرادی جاران) لە رووسیا، زیاتر لە بیست و پێنج دەسنووسی کۆنی بایەخداری جۆراوجۆر، لەبارەی زمان و ئەدەبیات و مێژووی کورد، بە زمانەکانی کوردی و فارسی و تورکی، بێ ناز و بێ کەسوکار، کەوتوون. بەپێی ئاگاداریی ئێمە، ئێستا، ئەم دەسنووسانە، ڕۆژ بەڕۆژ کۆنتر دەبن و زیاتر پەرپووت دەبن، تەنانەت بەپێی هەواڵەکانی تەلەڤزیۆنی کەناڵی (الجزیرة)، بەشێک لەم دەسنووسانە خەریکە وردە وردە دەدزرێن و دەفرۆشرێن و بازرگانییان پێوە دەکرێت.

بەڕێزان،

ئەگەر ئەم دەسنووسانە، دەسنووسی ئاسایی بوونایە، لەوانە بوو پێویستییان بەمە نەبووایە کە غەمیان لێ بخۆین؛ بەڵام هەموو توێژەر و مێژوونووس و ئەتنۆگراف و جوگرافیاناس و سۆسیۆلۆگ و نووسەرانی کورد، تەنانەت هەموو کوردناسە ئەوروپاییییەکانیش، لەسەر ئەوە ڕێکن کە پەیداکردنی ئەم دەسنووسانە و لەچاپدانیان، دەبنە هۆی ئەوەی چەند زنجیرەیەکی زۆر گرنگ لە قۆناغەکانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی کوردستان و مێژووی زمان و ئەدەبیاتی کوردی بدۆزرێنەوە؛ تەنانەت وامان لێ دەکەن بەشێوەیەکی جیاواز و تازە مێژووی نەتەوەییمان بنووسینەوە.

لەبەر بایەخ و گرنگیی ئەم دەسنووسانە، هەروەها لەبەرئەوەی - وەک ئاماژەم بۆ کرد - کە ئەم دەسنووسانە خەریکن ڕۆژ بەڕۆژ پەرپووتتر دەبن و لەناو دەچن، لە جەنابی پایەدارتان دەپاڕێمەوە، کە بەزووترین کات، حکوومەتی هەرێمی کوردستان هەوڵێک بدات ئەم دەسنووسانە ڕزگار بکات و وەدەستیان بخاتەوە، لە ئەنجامدا ساغ بکرێنەوە و لەچاپ بدرێن. بۆ ئێوەی پایەدار و دڵسۆزی گەل پێشنیار دەکەم، کە بەزووترین کات، داوا لە ئەرشیفخانەی شاری پیترسبۆرگ لە رووسیا بکرێت کە ئەم دەسنووسانەمان بۆ بنێرن؛ هەڵبەتا ڕاستتر و باشتر و واقیعیانەتریش وایە کە بەزووترین کات لیژنەیەکی پسپۆڕ پێک بهێنرێت و بنێردرێتە شاری پیترسبۆرگ بۆ پەیداکردنەوەی ئەم دەسنووسانە. سەرۆکایەتیی زانکۆکانی کوردستان و کۆڕی زانیاریی کوردستان و کتێبخانەی نیشتیمانیی کوردستان، هەروەها ئەنستیتووی کوردی پاریس و هەندێ لە رووسی زان و فەرەنسی زانەکانی کورد، لەم بوارەدا، بێگومان، دەتوانن، بەشێوەیەکی پسپۆڕانە، هاوکاریتان بکەن.

بەشی هەرە زۆری ئەم دەسنووسانە بە پێنووسی مەلا مەحمـوودی بایەزیدی (١٧٩٩ - ١٨٦٧) نووسراون. زۆربەشیان لەسەر داخوازیی یان بە هاوکاریی کوردناسی رووس، ئەلکساندەر ژابا Alexandre JABA (١٨٠٣-١٨٩٤) ئەنجام دراون، کە قونسولی رووسی بووە لە ولاتی عوسمانیدا (لە شاری ئەرزەرۆم). کوردناسی ناودار م. ب. رۆدنکۆ، لە پێشەکیی عادات و رسوومـاتنامەی ئەکرادیەدا، لە لاپەرە ٤٤دا، دەلێ:" دەتوانم بەوپەڕی دلنیاییەوە بلێم: گەلی کورد لە پاراستنی گەلێک لایەنی بەنرخی سامانی رووناکبیریدا تا رادەیەکی زۆر قەرزاری مەلا مەحموودی بایەزیدییە. گەر هاریکاریی بایەزیدی و ژابا نەبوایە، تا ئێستاش بەشێکی بەنرخ لە گەنجینەی ئەدەبی کوردیی سەدە ناوەنجییەکان نەدەزانرا".[1] ئەلکساندەر ژابا (١٨٠٣ - ١٨٩٤)، کە پۆلۆنی و رووسی و تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسی و کەمێک عەرەبی و کوردی و فارسیشی زانیوە، لەلایەن ئەکادیمیای بالای زانستیی سانت پێترسبۆرگەوە لە رووسیا داخوازیی لێ دەکرێ کە کۆمەلێک دەسنووسی کوردی کۆبکاتەوە و چەند لێکۆلینەوەیەک لەسەر کولتوور و زمان و ئەدەبیاتی کوردی بنووسێ. بۆ ئەم مەبەستە، لە سەرەتای سالی ١٨٥٦ بەملاوە کۆمەلێک مەلا و فەقێ و میرزا لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە. مەلا مەحموودی بایەزیدی یەکێک بووە لەو مەلایانەی کە بوونەتە هاوڕێی هەرە نزیکی ئەو. لەو ماوەیەدا مەلا مەحموودی بایەزیدی نیشتەجێی شاری ئەرزەڕۆم بووە. ئیتر بایەزیدی، لە ١٨٥٦ بەملاوە، بۆتە سکرتێر و هاوکار و راوێژکاریکی تایبەتیی ژابا بۆ کاروباری نووسین و ئەدەبیات و رۆشنبیریی کوردی[2]. م.م. بایەزیدی زۆربەی جاران ناوی خۆی لەسەر ئەو دەسنووس و کتێبانە تۆمار نەدەکرد کە بە هاوکاری لەگەل ئەلکساندەر ژابا بلاوی دەکردنەوە، تەنانەت ناوی خۆی لەسەر بەرهەمەکانی خۆیشی تۆمار نەدەکرد: بەرهەمەکان تەنیا بە ناوی ئەلکساندەر ژاباوە تۆماردەکران. ئەمەش لە ترسی ئەوە بووە کە بۆ مەلایەکی وەکو ئەو " کاریکی بەجێ " نەبووە لە یەکێکی وەکو ژابای ناموسلمان نزیک ببێتەوە و هەرەوەزیی لەگەلدا بکا. مووسایلیان لەم بارەیەوە دەلێ: " بایەزیدی بە ناوی حاجی مەحموود ئەفەندییەوە کاری دەکرد بۆئەوەی پیاوە ئایینییە ئیسلامییەکان لە خۆی نەوروژێنێ و زویریان نەکات، کە بێگومان دەبوو بە چاوی تانووت و نارەزاییەوە سەیری موسلمانێک بکەن کە سەرباری هەموو شتێکیش مەلایە و کەچی خەریکی شت نووسین و وەرگێڕانە لەسەر داخوازیی کابرایەکی غەیرە موسلمان "[3]. ژابا - خۆیشی لە پێشەکییە فەرەنسییەکەی عادات و رسووماتنامەکەیدا هۆی ئەم دیاردەیەی بە هەمان شێوە روون کردۆتەوە و دەلێ کە بایەزیدی نەیویستووە ناوی خۆی بەسەر نووسین و هاوکارییەکانیەوە بێت.[4] دەسنووس و کتێبەکانی مەلا مەحموودی بایەزیدی، هەمیشە، بە دوو زمان (کوردی و فەرەنسی) بوونە. بەشە کوردییەکان بە پێنووسی بایەزیدی نووسراون. بەشە فەرەنسییەکانیش، ئاشکرایە، دەبێ کە ژابا بە هاوکاریی بایەزیدی تەرجەمەی سەر زمانی فەرەنسیی کردبن.

بەڕێزان؛

لە کۆتاییدا، بۆ ئەوەی ئێوەش، باشتر لە بایەخی ئەم گەنجینە - دەسنووسە مێژووییانە تێ بگەن، ناچارم لیستێک بۆ هەندێ لەو دەسنووسانەی کە تاکو ئێستا لەوێ کەوتوون و کاریان لەسەر نەکراوە، بخەمە بەر چاوی جەنابتان:

١- دەسنووسی (تەواریخی جدیدی کوردستان،) یان (کیتابی تاریخی جدیدی کوردستان). مەلا مەحموودی بایەزیدی لە سالی ١٨٥٧ بەملاوە دەستی بە نووسینی کردووە. ویستوویەتی لاسایی شەرەفخانی بەتلیسی بکاتەوە: مێژووی کورد و کوردستان لەو شوێنەوە بنووسێتەوە کە شەرەفخان تێیدا براوەتەوە. ئەم کتێبەی بایەزیدی نزیکەی هەزار لاپەرەیە، لە پێشەکییەک و ١١ بەش پێکهاتووە. سالی ١٨٦٥، ژابا ئەم بەرهەمەی

کردبووه فەرەنسی، پێشەکیی دەسنووسەکەیشی لە ئەرزەڕۆمەوە بە فەرەنسی ناردبووە کۆڕی زانیاریی رووسی بۆ نرخاندنی[5]. د. کەمال مەزهەر ئەم هەوڵدانەی بایەزیدیی بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد هەڵسەنگاندووە و رۆڵی مێژوونووسینی مەلا مەحموودی بایەزیدیی دەسنیشان کردووە. بە ڕای د. کەمال مەزهەر، هەستی مێژوونووسیی مەلا مەحموود گەلێک قووڵ بووە[7].

٢- دەسنووسی ژمارە (کورد ٦) بە ناونیشانی (صفحه صبیان) کە ناوی دانەری بە سەرەوە نییە، بریتییە لە کتێبی ئەلف و بێی زمانی کوردی بۆ منداڵان، م.م. بایەزیدی لە سەدەی نۆزدەمدا بە خەتی خۆی نووسیویەتی. ئەم دەسنووسە دەبێتە یەکەمین کتێبی ئەلف و بێی کوردی و یەکێک لە یەکەمین کتێبە پەروەردەییەکان بە زمانی شیرینی کوردی.

٣- دەسنووسی ژمارە (کورد ٧) بە ناونیشانی (رسالة تحفة النحلان في الزمان كردان) نووسینی م.م. بایەزیدی، لە ١٨٦٦ لە ئەرزەڕۆم نووسیویەتی لەبارەی ڕێزمانی کوردی. ئاخاوتنی دابەش کردۆتە سەر: پیت، ناو، فرمان. بەکۆمەڵێک نموونەی پراکتیکییەوە باسی زمانی کوردی دەکا. ئەم دەسنووسە، کە دەبێتە یەکەم نووسین لەبارەی ڕێزمانی کوردی لە مێژوودا، پێشەکییەکیشی لەگەڵدایە بە خەتی م.م. بایەزیدی. د. ئەوڕەحمانی حاجی مارفیش ناوی ئەم کتێبەی لە ڕیزی دەسنووسەکانی ژابادا هێناوە[8].

٤- دەسنووسی ژمارە (کورد ٤٦) کە باسی هەندێ لایەنی زمانەوانیی کوردی دەکا بە قەڵەمی بایەزیدی، لە ١٨٦٧ لە ئەرزەڕۆم نووسراوە. ژابا دەقە کوردییەکەی لە پیتی عەرەبییەوە کردووە بە پیتی لاتینی و پاشان بۆ فەرەنسی تەرجەمەی کردووە.

٥- دەسنووسی ژمارە (کورد ٤٨) کە باسی فرمانەکانی زمانی کوردی دەکا (نزیکەی ٨٠٠ فرمان لە خۆ دەگرێ) بە قەڵەمی مەلا مستەفا لە ١٨٦٠ لە ئەرزەڕۆم نووسراوە. ژابا دەقە کوردییەکەی لە پیتی عەرەبییەوە کردووە بە پیتی لاتینی و پاشان بۆ فەرەنسی تەرجەمەی کردووە.

٦- دەسنووسی ژمارە (کورد ٤٩) بە ناونیشانی (در المجالس)، حەکایەتی میللییە، مەلا مووسای هەکاری لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩مدا لە فارسییەوە وەری گێڕاوە: شیرین و فەرهاد، یووسف و زلێخا، زوحاکی پاشا، رۆستەم، نەوشێروان و دارەوان، بووکگواستنەوەی جەنگیزخان.. کە بە خەتی مەلا مەحموودی بایەزیدی نووسراونەتەوە. نوسخەیەکی تر لەم دەسنووسە هەیە بە ناونیشانی Kurd A41 کە بیست و یەک حەکایەتی یەکەمی تێدایە، شێخ نزار نووسیویەتییەوە و ئەلکزاندەر ژابا تەرجەمەی فەرەنسیی کردوون.

٧- دەسنووسی ژمارە (کورد ٤٣) کە٨٤ حەکایەتی میللی و فۆلکلۆریی تێدایە، مەلا مەحموود لە فارسییەوە کردوونی بە کوردی، ژابا تەرجەمەی فەرەنسیی کردوون و بە کوردیی لاتینی نووسیونیەتەوە، لەگەڵ تێبینییەکانی ژابا بە فەرەنسی، بەم شێوەیە: فارسیەکە - کوردی بە پیتی عەرەبی- کوردی بە پیتی لاتینی- فەرەنسی.

٨- چیرۆکی لەیلا و مەجنوون دەسنووسی ژمارە (کورد ٣١) م. م. بایەزیدی لە ٥٧-١٨٥٨ نووسیویەتی. ئاماژەیەکیش هەیە کە لە تورکییەوە تەرجەمەی کردووە. ژابا دەڵێ کە ئەم چیرۆکە پەخشانییەی بایەزیدی تەرجەمەی چیرۆکێکی شیعریی فزوولیی شاعیری تورکە کە لە ١٥٦٠ کۆچی کردووە. بەڵام رۆدینکۆ وای بۆ دەچێ کە ئەوەی بایەزیدی گێڕانەوەیەکی پەخشانئامێزی چیرۆکە شیعرییەکەی حارسی بەدلیسییە، ژمارە (کورد ٣٠).

٩- چیــرۆكی مــەم و زین Legende Kurde (هاوینی ١٨٥٦)، بەرهەمی خــۆیەتی، بە دیالێكتی كــرمــانجی، بە دەسخـەتی خـۆی، پاشان لە لایەن ژاباوە خراوەتە سەر ئەلفابێی لاتینی و تەرجەمەی فەرەنسی كراوە، لەگەڵ پێشەكییەک بە زمانی فەرەنسی بە پێنووسی ژابا.

١٠- چیــرۆكی لەیلا و مــەجنوون Legende Kurde (لە ١٨٥٩دا نووســراوە)، بەرهەمی خــۆیەتی، بە دیالێكتی كرمانجی، بە دەسنووسی خـۆی. پاشـان لەلایەن ژاباوە خراوەتە سـەر ئەلفابێی لاتینی و تەرجـەمـەی فـەرەنسی كراوە، لەگەڵ پێشەكییەک بە زمانی فەرەنسی بە پێنووسی ژابا.

١١- جـامع یی رسـالیـان و حكایتـان Recueil de Notices et Recits Kourdes ، چل چیـرۆكی كـوردییە، بەرهەمی خۆیەتی. ئەم بەرهەمە، كە دەبێتە یەكەم كـۆمەڵە چیرۆكی بە كـتـێب چاپكراو لە مێژووی ئەدەبیـاتی كوردیدا؛ لەلایەن ژاباوە تەرجەمەی فەرەنسی كراوە ، لە سالّی ١٨٦٠ لە سانت پیترسبۆرگ بە زمانی كوردی و فەرەنسی لەگەڵ پێشەكییەک بە پێنووسی پیتەر لێرخ P. LERCH بڵاوكراوەتەوە.

١٢- دەسنووسی چیرۆكی سیامەند و شەمسێ، بە پەخشان. نووسراوی بایەزیدییە و ژابا كردوویەتییە فەرەنسی.

لەبارەی ئەم دەسنووسەوە، ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس، چیخاچییێف، دەڵێ:" لەنێو ئەو بەڵگەنامانەدا كە چەندین ڕەفەی كـتـێبخـانەكەی ئەلكسـاندەر ژابا (ئەو كـونسوڵە زانایەیان) پڕكردبۆوە، داسـتـانی خۆشەویستیی سیـامـەند و شـەمسی مـان بەرچاو دەكەوێت. بەڕێز ژابا نەک تەنیا وەرگێڕدراوی كوردی و تا ڕادەیەک بە شێـوازێكی ئەدەبیی داڕێژراوی ئەو داسـتـانەی دامێ، بەڵكو كۆپییـەكی جوانی دەقـەكەیشی پێ بەخـشـیم و ڕێگای ئەوەی دامێ كە بیدەم بە (كۆمەڵەی ئاسیـاویی فـەرەنسـا) كە بێگومـان دڵشـاد دەبێت ئەگەر خۆی بە ئاسەوارێكی وا دانسقەی ئەدەبی ڕۆژهەڵات دەوڵەمەند بكات "[٩].

چیخاچییێف ئەم دەسنووسە كوردییەی لەگەڵ وەرگێڕدراوە فەرەنسییەكە و نووسینەوەی بە پیتی لاتینی، لەگەڵ پێشەكییەک بە زمانی فەرەنسی لە سالّی ١٨٥٩دا بڵاوكردۆتەوە.[١٠].

١٣- تەرجـەمـەی كورتەی شـەرەفنـامـەی شـەرەفـخـانی بەتلیـسـیی بۆ كـرمـانجی، بـە نـاونیـشـانـی تەواریخی قـەدیمی كـــوردســـتـــان، كـــە لـە ١٨٥٨- ١٨٥٩دا كـــردوویەتی. لە ســـالّی ١٩٨٦دا لەلایەن م. ب. ڕۆدنكۆ، وێڕای پێشـەكییەک، لە مۆسكۆ چاپ كراوە. ژمارەی دەسنووسەكە لە نامەخانەی سالتیكۆف شدرین، لە لینینگراد: Kurd 37 د. كەمال مەزهەر ڕێزێكی زۆری لەم تەرجەمەیەی بایەزیدی ناوە و بە فراوانی باسی ڕۆڵ و توانای مێژوونووسینی مەلا مەحموودی بایەزیدی دەكات[١١].

١٤- دەسنووسی ژمـارە (كـورد ١٨) بـە زمـانی كـوردی باسی ڕێزمـانی عـەرەبی دەكـا، مـەلا یوونسی خلقـتـینی نووسیویەتی كە لە دوای تەرەماخی لەدایک بووە.

١٥- دەسنووسی ژمارە (كورد ١٧) بە زمانی كوردی باسی ڕێزمانی عەرەبی دەكا.

١٦- تەرجـەمـا ضـەرب مــەثەلانە بزمـانی كـورمـانجی كـە پەندی كـوردین و بایەزیدی لە ٢٣ی ١٢ی ١٨٥٦دا تەرجـەمــەی توركـیی كـردوون. ڕۆدنكۆ، لە سـالّی ١٩٦١دا، بە زمـانی ڕووسی، لە كـتـێـبی (ئەو دەسنووسـە كوردییانەی لە لینینگراد پارێزراون)، لە لاپەڕە ٤٤دا ئاماژەی بۆ كردووە[١٢].

١٧- سێ دەسنووسی مەولوودنامەكانی مەلای باتەیی (١٤١٨- ١٤٩١) كە چیرۆكن بە شـیـعر؛ یەكـێكیـان لە میسر لە ١٩٠٥داچاپ كراوە.

١٨- دەسنووسی ژمارە (کورد ١٩) بە ناوی کیتابی مەولوودی شەریف، بایەزیدی لە ١٨٥٨دا لە ئەرزەڕۆم نووسیویەتیەوە.

١٩- دەسنووسی ژمارە (کورد ٢٦ و کورد ٣٦ )، بریتین لە داستانی شیعریی ئەسپی رەش، کە دەدرێنە پاڵ عەلی حەریری. هەندێکیش دەیدەنە پاڵ فەقێی تەیران.

٢٠- دەسنووسی ژمارە (دی ٤٤٧ ) کە وەرگێڕانێکی پەخشانیی ئەسکەندەرنامەی نیزامی گەنجەوییە کە لە ١١٩١دا نووسراوە. رۆدینکۆ وای بۆ دەچێ کە (شەهنەزەر) ناوێک لە ١٨٥٦ لە ئەرزەڕۆم کردوویەتییە کرمانجیی ژووروو.

٢١- دەسنووسی ژمارە (بی ٣٩٧١)، بریتییە لە وەرگێڕانی گوڵستانی سەعدی شیرازی ١١٨٤- ١٢٩٢ کە لە ١٢٥٧ نووسراوە. وەرگێڕانە کوردییەکە بە پەخشانە، لە ١٨٥٧ کراوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک لە سیاقی دەقەکە لای نەداوە.

٢٢- دەسنووسی ژمارە (کورد ٢٦ ) بریتە لە پەخشانێکی کوردیی شاعیرێکی نەزانراو کە باسی جوانیی ئافرەت دەکا، بە شێوەی شیعریی پەخشانی هۆنراوەتەوە.

٢٣- دەسنووسی داستانی یووسف و زلێخا، نووسراوی سەلیمی سلێمان. ساڵی ١٩٧٣ کوردناسی رووس، رۆدنکۆ نامەی دکتۆراکەی لەسەر یووسف و زلێخای سەلیمی سلێمان بووە (کۆتایی سەدەی ١٦م – سەرەتای سەدەی ١٧م) و لە ١٩٨٥ بڵاوی کردۆتەوە. ئەم دەسنووسە لە ڕیزی دەسنووسەکانی بایەزیدی و ژابا بووە. داستانێکی شیعریی مەسنەوییە، بەرهەمی سەلیمی سلێمانە؛ بایەزیدی نووسیویەتیەوە. لە کۆتایی دەسنووسەکەدا نووسراوە کە سەلیمی سلێمان شاعیری دەرباری میرنشینی کوردستانی تورکیا بووە؛ لە ساڵانی ١٥٨٦ -ـ ١٥٨٧دا نووسیویەتی و ١٧١١ بەیتە(١٣).

٢٤- داستانی قەڵای دمدم

لە کۆمەڵە دەسنووسەکەی ژابادا پۆیەمای قەڵای دمدم هەیە، بەڵام نووسەرەکەی نەناسراوە و نازانین کەی نووسراوە، بەڵام هی سەدەی حەڤدەهەم یا سەرەتای ١٨مە.(١٤)

٢٥ – لاوێژک.

کۆمەڵێک گۆرانییە کە پیاوان دەیڵێن و زۆربەی بەیتەکانی بە لۆلۆ دەلۆ دەست پێدەکات. بایەزیدی نووسیونی. سەرەتای ئەم دەسنووسە: "لۆلۆ دەلۆ برحی ئەستەنبۆلێ..."؛ کۆتاییەکەی: "من نزانیا شەیتان لەعنەتی لەو بمین کنیایە...".

٢٦- بریتە

کۆمەڵێک گۆرانیی هەمە چەشنەیە کە لە شایی و هەڵپەرکێدا دەگوترێ. بایەزیدی نووسیونی. سەرەتای ئەم دەسنووسە: "عەیشۆ من دی بو لبەر"؛ کۆتاییەکەی: "وەرە بگەڤە ناڤ سینگ و بەری عرض دزێ..

٢٧ – حکایات شیخ صنعانیان

چیرۆکە شیعرێکە، نووسراوی فەقێی تەیرانە. سەرەتاکەی: " گوهـ بدێرن نوتقی عاشقانە "؛ " کۆتاییەکەی: دین و سوننەتێ..". " کتاب قصە شیخ صنعانیان" لە ٢٩ی تەمموزی ١٨٦٥ لەلایەن مەلا مەحموودی بایەزیدییەوە روونووس کراوە.

٢٨- دەسنووسی فەرهەنگێکی رووسی - فەرەنسی - کوردی و کوردی - رووسی - فەرەنسی. ژابا، لە ١٨٦٥دا یەکەمین بەشی فەرهەنگە رووسی - فەرەنسی - کوردییەکەی دەنێرێ بۆ ئەکادیمیای ئیمپراتۆری کە بریتی بوو لە ١٥٠٠٠ وشە لە ٧٢١ لاپەڕەدا. بەشی دووەمیشی کوردی - رووسی - فەرەنسییە. ٦٠٠ لاپەڕەیە، لە ١٨٦٩ - ١٨٧٢دا نووسراوە. تا ئێستا چاپ نەکراوە و لە ئەکادیمیای زانستەکانی سۆڤیەت لە لینینگراد پارێزراوە(١٥).

جگە لەمانە، گەلێک بەرهەمی شاعیرانی تورک و عەجەمی تەرجەمەی سەر زمانی کوردی کردووە و بە دەسنووس ماونەتەوە(١٦). هەروەها د. ئەڕەحمانی حاجی مارف باس لەم بەرهەمانەش دەکا کە بایەزیدی نووسیونەتییەوە: کەلامی کچان، گوری و خلیل بەگ، سترانێد کرمانجی، زەنبیل فرۆش، قەولی هەسپی رەش... هتد. جگە لەم بەرهەمانە، لەوانەیە بەرهەمی دیکەشی هەبێت و ئێمە تا ئێستا پێمان نەزانیبێ.(١٧)

**پەراوێزەکان:**

١: د. کەمال مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، ل ١٢٨.

٢- Courier de Smyrna ژمارەی رۆژی ١٨٩٤/١/١٠، لاپەڕە ١.

٣: ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، وەرگێڕانی لە رووسییەوە: شێروان مەحموود محەمەد، رووناکبیری، ژ ٣ - ٤، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٣، ل ٤١.

٤: مەلا مەحموودی بایەزیدی: عادات و رسووماتنامەی ئەکرادیە، تێکستەکە خۆی بە کوردییە، بە دیالێکتی کرمانجی، لە مۆسکۆ لەلایەن رۆدنکۆوە تەرجەمەی رووسی کراوە و چاپ کراوەتەوە.

٥: د. کەمال مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، ل١٢٩

٦: د. کەمال مەزهەر: مێژوو،. بەغدا: ١٩٨٣، ل ١٢٥ - ١٢٩؛ هەروەها بڕوانە "چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد"، بەشی یەکەم، د. ر. ب. ک.، بەغدا: ١٩٨٥، ل ٣٠ - ٣١.

٧: د. کەمال مەزهەر: مێژوو، ل ١٢٥ - ١٢٩

٨: د. ئەورەحمانی حاجی مارف: چەند وشەیەک دەربارەی کۆمەڵە دەستنووسە کوردییەکانی ئەلێکساندەر ژابا، بەیان، ژ ، ١٠بەغدا: ١٩٧٣، ل ٨- ١٠.

٩: ب. ئا. چیخاچێیف: ئەو نامانەی سەبارەت تورکیان، بە رووسی، مۆسکۆ: ١٩٦٠، ل ٣٧؛ بڕوانە: ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، رووناکبیری، ژ ٣ - ٤، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٣، ل ٢٩ - ٤٥.

10- A. JABA: Ballade Kurde recueillie et traduite par A. JABA et communiquee par DE TCHITIATCHEFF in Journal Asiatique, Paris: 1859, 5e Ser., T. XIV, P. 153-166.

١١: د. کەمال مەزهەر: مێژوو، بەغدا: ١٩٨٣، ل ١٢٥ - ١٢٩؛ هەروەها بڕوانە "چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد"، بەشی یەکەم، د. ر. ب. ک.، بەغدا: ١٩٨٥، ل ٣٠ - ٣١.

10: Mohammad MOKRI: Kurdologie et enseignement de la langue Kurde en URSS, in >> Recherche de Kurdologie, Contribution aux etudes iraniennes 1956-1964<<, Paris: 1970. P. 65-95.

١٣: مارگرێت رۆدنکۆ: ئەدەبیی کوردیی سەدەی حەڤدەهەم، رووناکبیری، ژ ١، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٢، ل ٧٥.

١٤: مارگرێت رۆدنکۆ: ئەدەبیی کوردیی سەدەی حەڤدەهەم، ل ٧٨.

١٥: ژ. س. مووسایلیان: ئا. ژابا و کوردناسی، رووناکبیری، ژ ٣ - ٤، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٣، ل ٣٨.

١٦: د. کەمال مەزهەر: مێژوو، ل١٢٦.

١٧: قەناتی کوردۆ: ژابا و رۆڵا وی د پێشڤەچوونا کوردناسییێدا، رۆژنامەی رێیا تازە، ژمارەی رۆژی ١٩٧٣/٢/١٠.

## سەرچاوەکان:


Mohammad MOKRI: Kurdologie et enseignement de la langue Kurde en URSS, in >> Recherche de Kurdologie, Contribution aux etudes iraniennes 1956-1964<<, Paris: 1970. P. 65-95.

A. JABA: Ballade Kurde recueillie et traduite par A. JABA et communiquee par DE TCHITIATCHEFF in Journal Asiatique, Paris: 1859, 5e Ser., T. XIV, P. 153-166.

Alexandre JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860.

Alexandre JABA: Dictionnaire kurde- Francais, St Petersbourg: 1879.

A. JABA: Resume de l ouvrage d Ahmed Effendi Khani, Tr. par A. JABA, in Bulletin Hist. Philologique, LXV, 1858, No 11, P. 161-171.

: Xebat u jiyana Melle Mehmude BEYAZIDI, Rojname y Kurdistan Press, Hej 58, Stockholm: 1989.

م.ب. رۆدنکۆ : کتێبی (مەجموعەی ئەلکساندەر ژابا - دەسنووسە کوردییەکان - ، "کارە گشتییەکانی سەلتیکۆف شێدرین"، لینینگراد: ١٩٥٧ ، بەرگی دووەم، ل ١٦٤- ١٨٤دا) بە زمانی رووسی؛ هەروەها بڕوانە: رۆدنکۆ: کتێبی (ئەو دەسنووسە کوردییانەی لە لینینگراد پارێزراون)، مۆسکۆ: ساڵی ١٩٦١دا، بە زمانی رووسی. لەم سەرچاوەیەدا باسیان کراوە: جەودەت هوشیار:کەلەپووری کوردی، گ. رامان، ژمارە(٤٣) و (٤٤)، هەولێر: ک٢، ٢٠٠٠، ل ١٤-١٧ و ٥٠ - ٥٤.

# پێڕست

**بەشی دووەم**

**بەشی سێیەم**